له بڵاو کراوەکانی ماڵپەڕی بەهەشت

# وەڵامی پرسیارەکان

ـ وەڵامی زیاتر لە (٢٢٥) پرسیاری شەرعی گرنگ ـ

کە لە لایەن

بەڕێز :مامۆستا ( **خليل أحمد** )ـەوە

وەڵامدراوەتەوە

لەگەڵ سەرجەم دیدار و چاوپێکەتنەکانی لەگەڵ گۆڤار و

ڕۆژنامەکاندا

کۆکردنەوە و ڕێکخستنی

جليل إبراهيم على

---

**ماڵپەری بەهەشت**

**ba8.org**

**ماڵپەڕێکی ئیسلامی زانستی پەروەردەیی یە و لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئەو ئیسلامەیە کە سەلەفی صاڵح - پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) لەسەری بوون - وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێکی حیزبی نیە.**

## ماڵپەری بەهەشت

**ئەو کتێب و بابەت و لێکۆڵینەوە شەرعیانە بڵاو دەکاتەوە کە دەبنە هۆی:**

١. شارەزاکردنی موسوڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر رێگا ڕاستەکەی ئیسلام، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە رەسەنەکەی ئیسلام،کە بریتی یە لە قورئان و سوننەت،بە تێگەشتنی پێشین وپێشەوایانی ئوممەت.

٢. پاک کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسوڵمانان، لە دیاردەکانی شیرک و کوفر و تاوان.

٣. پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان.

٤. وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان.

٥. پتەو کردنی برایەتی یەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی.

**ئامانجمان:**

ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراوی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەڵایەتی.

**خودایە داوات لێ دەکەین دامەزراومان بکەیت ، وتەوفیقمان بدەیت بۆ هەر کار وگوفتارێکی جوان وچاك بەو شێوەیەیی کەخۆت لێی ڕازیت.**

**ستافی ماڵپەڕی بەهەشت**

بسم الله الرحمن الرحيم

## * پێشەکی :

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عمران].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النساء] .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الأحزاب] .

أَمَّا بَعْدُ :

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

## خوێنەری بەڕێز :

ـ ئەم کتێبەی بەردەستت بریتییە لە وەڵامی (٢٢٥) لەو پرسیارە شەرعییانەی کە لە ڕێگای (**سایتی بەهەشت**)ـەوە ئاڕاستەی مامۆستای بەڕێز و خۆشەویستم (مامۆستا خلیل أحمد) کراوە ، لەگەڵ سەرجەم دیدار و چاوپێکەوتنەکانی بەڕێزیان لەگەڵ گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا کە بە بەڵگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتڕاستکراونەتەوە .

جا بۆ سوودی زیاتر (دوای پرس و ڕاوێژ بە مامۆستای بەڕێزم ) بە باشم زانی هەموو پرسیار و وەڵامەکان و دیدار و چاوپێکەوتنەکان کۆبکەمەوە و جارێکی تر بەڕێزیان پێداچوونەوەی بۆ بکەنەوە و لە دوو توێی کتێبێکدا بخرێتە بەردەم موسڵمانانی بەڕێز ، لە کۆتایدا داواکارم لە خوای گەورە

ئیخلاص بخاتە نێو کار و گوفتارمانەوە و ئەم کتێبەیە بکاتە مایەی سوود بۆ هەموو موسڵمانان .

(رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ..وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ )

**جليل إبراهيم**

**بەڕێوبەری ماڵپەڕی بەهەشت**

www.ba8.org

**(١٥ / رمضان / ١٤٣٥ کۆچی ـ ١٣/ ٧ / ٢٠١٤ لەدایك بوون)**

**کوردستان / کەلار**

**پ١/ سلاو بەڕێز......پرسیارێکم هەیە ئایا ئینسان ئەگەر بێزار بێت ئەتوانیٚ دوعای مردن لە خۆی بکات گوناهبار نابێت لەو کاتەدا؟ پرسیارێکی تر ئەویش ئەوەیە : من لەوەتەی تەوبەم کردووە بیرکردنەوە زور زور بێزاری کردووم چ دوعایەك باشە بیکەم بۆ ئەوەی لەو بیرکردنەوەیە نەجاتم بێت...لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیم بۆ ئێوەی بەڕێز خوای گەورە ئاگای لێتان بێت.تکایە زوو وەڵام بدەنەوە.**

**وەڵام :**

بسم الله الرحمن الرحيم سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە وە درودو سڵاو لە سەر گیانی پێغەمبەری خوا وە لەسەر خێزان و کەس وکاری ئیمانداروو هاوەڵان و شوێن کەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

مرۆڤی موسڵمان دەبیٚ لە ژیان بێزار نەبێت و ئارامی هەبێت لەسەر تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانی دونیا بۆ ئەم مەسەلەیەش دەبیٚ یەکەم مەفهومی ژیانی دونیا تێبگات کە بریتی یە لە تاقیکردنەوە بە خۆشی و ناخۆشی جا دوای ئەم تێگەشتنە پێویستە مرۆڤی موسڵمان هەڵوێستی ئیجابی هەبێت و بەچەواشە لە دونیا نەگات ، و وابزانێت ئەم ژیانەی دونیا هەتا هەتاییە و خۆی بۆ بکوژێت نا ، بەڵکو ڕێگەیەکە بۆ ژیانی ڕاستەقینە لە قیامەت بە

کــورتی هــەموو ئــەو پێداویســتیانە و کەرەســتانەی کــە لــە دونیــادا لەبەردەســتماندان هــەموو بــۆ ئەوەیــە ژیانمــان بــەڕێوە بچــێت تــا بتــوانین بەندایەتی بۆ خوای گەورە ئەنجام بــدەین جــا بــەو هەڵوێســتە ئیجابیــە و خــۆ پشت قایم کردن بە یادی خوای گەورە ئەوانە دەرەوێتەوە ، ئەگەر مرۆڤ بێزار بوو وا چاکترە پەنا بباتە بەر نوێژ کردن و دوعا کــردن ، بــەڵام دوعــای مــردن دروست نیە ، ئەگەر هەر دوعای کرد وا چاکترە بڵێت ئەگەر مــردن باشــە بــۆم لە ژیان ئەوا بممرێنە .

بەشی دووەمی پرسیارەکە کە باس لە بیرکردنەوە دەکات بەڵێ ڕاستە ئەگــەر مرۆڤ کەسێکی ناموسڵمان یــان کەســێك بــوو پابەنــد نــەبوو بــە ڕێنماییــەکانی ئیســلامەوە پاشــان تەوبــەی کــرد ئــەوە تاماوەیــەك نــەفس و شــەیتان کــاتی ڕابردووی وەبیر دەهێننەوە یان ختورەی خراپی پێ دەڵێن ، جا پێوستە لەم کاتە موسڵمان ئــارامی هــەبێت ، و ئــەوەش بزانێــت ئەمــە شــتێکی کاتیــەو بــا بەردەوام ئــەم دوعایــە بخوێنێــت : (اللهم ثَبت قَلبي على طاعتك) یــان بڵێــت : (اللَّهُمَّ اهْدِنِي لأَحْسَنِ الأَعْمَالِ والأَخْلاَقِ ؛ لاَ يَهْدِي لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ ، وَقِنِي سَيِّئَ الأَعْمَالِ وَسَيِّئَ الأَخْلاَقِ ؛ لاَ يَقِي سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْت)

وە زۆر داوا لە خوای گەورە بکە إن شاء الله دوای ماوەیەك ئەو شتانە هـەموو باردەکەن و شتی چاك جێگەیان دەگرێتەوە .

**پ٢/ ئایا دەلیل چیە کە بە کارهێنانی القاب جگە لە مسلم کە رب العـالمین نـاوی نـاوین بدعـە نیـە؟؟( مـن ئـەڵێم وەك ئامـانج سـەلەفیت ئەصـلی مەتلەبـە و و پارێزگاریـە و گەرانەوەیـە بـۆ فـەهمی کـامڵی ئیسلامی حەنیف دوور لە شرك و بدعـە) بـەڵام بە ناوهێنـان بدعەیـە و خەتەرە.چونکە ناولێنان بەشێکە لە ئاین. نابێت بـە تـاك بـە کۆمـەڵ بـە خۆت یـان بـە خوشـکێك یـان بـە برایـەکی تـر بڵێـی سـەلەفی, تکایـە بـە قورئان و سوننە ئەگەرهەڵەم ڕاستم کەنەوە .**

**وەڵام :**

**بەکارهێنانی ناو و ئەلقاب کە بۆ پێویستی ببێ و هیچ مانایـەکی خراپـی تێـدا نەبێ و هۆکـار نـەبێت بـۆ پـەرتـەوازەکردنی موسـڵمانان و هانـدەر نـەبێت بـۆ هەڵگرتنی بیروباوەڕی خراپ بە ناوی ئیسلامەوە ئەوە دروستە ، لەوانەش کە خــراپن** (أهـل الكـلام ، الفلاسـفة ، الجهميـة ، الخـوارج ، المعتزلـة ، الـروافض ....) **بەڵام ناونان بە** (أهل الحديث ، أهل التقوى ، أهل القرآن ، أهل السنة والجماعة ، أهل الأثر ، السلفية ، الطائفة المنصورة ، الفرقة الناجية ، الجماعة .......) **ئەمانـە**

**دروستن چونکە مانا و دەلالەتی خراپیان تێدا نیە و دەلالەتی باشیش دەگەیەنن بۆ نموونە وشەی (السلف) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای پێشینی خۆت دێت لە زانست و ئیمان و چاکە و خێردا .**

**ابن منظور لە (لسان العرب) دا (١٥٩/٩) ئەڵێ :** (والسّلف أيضا من تقدّمك من آبائك و ذوي قرابتك الذين هم فوقهم في السِّنِّ والفضل ولهذا سُمي الصدر الأول من الصحابة السلف الصالح)

**هەروەها وەکو فەرموودەش پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەکاری هێناوە کە بە** (فاطمة)**ی کچی ئەڵێت :** (فانّه نعم السلفُ أنا لك) رواه مسلم (٢٤٥٠)

**لەزاراوەی زانایاندا (سلف) بەمانای (صحابە)دێت ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی دەکات کە (ڕاشد)ی کوڕی (سعد) کە تابعی یە ئەڵێ :** (كان السلف يستحبّون الفُحولة لانها أجرى وأجسر) فتح الباري ج٦/٨٢ ضاتی (دار الكتب العلمية) .

**واتە : (صحابە) هاوەڵان لە بۆ غەزا ئەسپی (نێر)یان بە باشتر دەزانی لە ماین چونکە ئازا و خێرا ترە . مەبەست لەم** (أثر)**ە وشەی (السلف) کە لەسەردەمی (تابعین) دا بەکارهاتووە و بۆ صحابەش بەکارهاتووە واتا بۆ مانایەکەی .**

ئیمامی موسلیم لـە پێشـەکی صـەحیحەکەیدا لاپـەڕە ١٦ ڕیوایـەت دەکـات لەڕێگەی (محمد)ی کوڕی (عبـدالله) ئـەڵێ گـوێم لـێ بـوو علـی کـوڕی شـەقیق دەیگوت لە عبدالله ی کوڕی (مبـارك)م بیسـت لـەناو خەڵکیـدا دەیگـوت (دعوا حديث عمرو بن ثابت فانه كان يسبُّ السلف) .

کەوا بـوو سـەلەفیەت نیسـبەتە بـۆ (السـلف) ئەمـەش نیسـبەتێکی چـاکە بـۆ مەنهەجێکی حەق و بیدعە و مەزهەبێکی تازە نیە .

شێخ ابن تیمه ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە مجموع الفتاوی ١٤٩/٤ ) ئەڵێ : [ لا عيب على من أظهر مذهب السّلف وانتسب اليه واعتزى اليه،بل يجب قبول ذلك منه بالاتفاق ، فان مذهب السلف لايكون الا حقاً](مجموع الفتاوى(: (١٤٩/٤).

واتە : عەیب نی یە لەسەر کەسێك کە مەزهـەب و بەرنامـەی سـەلەف ئاشـکرا بکات و خۆی بداتە پاڵی (بڵێت من سەلەفیم) ، بەڵکو پێویستە ئەم شتەی لێ وەربگیرێت بەیـەك دەنگـی زانایـان ، چـونکە مەزهـەبی سـەلەف تـەنها حـەق دەبێت .

بڕوانە مێژوو نووسی ئیسلام پێشـەوا (الذهبي) ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ لـە کتێبـی (سير أعلام النبلاء) دا (١٦-٤٥٧) لـە ژیاننامـەی حافظ الدارقطني دا

ئـەڵێ : (لم يدخل الرَّجلُ أبداً في علم الكلام ولا الجدال ولا فاضَ في ذلك بل كان سلفياً) .

ئەگەر کەسێك بڵێت باشە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت : { هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمينَ مِن قَبْلُ } (٧٨) سورة الحج

واتە : ناوی لێ ناوین بە (مسلم) موسڵمان ئیتر بۆچی ناوی تـر بـەکاربهێنین؟ ئێمە دەڵێین ڕاسـتە زۆر شیاویشـە ئەگـەر تاقمـە گومڕاکـان نـاو و مەزهـەب و ڕێچـکەی خراپیـان بـەناوی ئیسـلام و موسـڵمانانەوە دروسـت نەکردایـە هەمووشمان دەزانین هەرچی مەزهەب وحیزب و تاقمی گومڕا هەیە لە عالەمی ئیسلامیدا خۆی بە موسڵمان دەزانێت ، ئەی ئەبێ ئەوە کێ بێت نوێنەرایەتی ئیسلامی ڕاستەقینە بکات ئەگەر هەموومان تەنها ناومان موسڵمان بێـت ، بـۆ نموونە ئەگەر کەسێك پێت بڵێ مەزهەبت چیە ئەگەر تۆ بڵێیت موسڵمانم پێت دەڵێت باشە خەڵکی هەموو خۆی بە موسوڵمان دەزانێـت (شـیعە ، خـوارج ، جهمیە ، معتزلە) چۆن خۆت لەوانە جیا دەکەیتەوە و ئیسلامی ڕاسـتەقینەش دەپارێزیت؟ ئەگەر بڵێیت موسوڵمانێکم لەسەر قورئان و سـوننەت هـەموویان ئەوە دەڵێن کەوابوو ئەبێ بڵێیت موسڵمانێکم لەسەر مەنهـەجی سـەلەف واتـا قورئان و سوننەت بە تێگەشـتنی سـەلەف (صـحابە) ئـەو کاتـە هـیچ تاقمێـك

ناتوانێت بـەردەوام بێـت . ئـەنجا نـاوی سـەلەفی دژی نـاوی مسـلم نیـە وەك موشریك یان كافر كە بەرامبەر بەناوی (مسلم)ە لەدژایەتی كردندا وە ئیسـلام خۆی ئەوە دەخوازێت كە سلف لەسەری بوون وەك بە ئایـەت ڕونكرایـەوە وە چەندین حەدیسمان لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە هەیـە وە لـە حەدیسـی افـتراق دا **هاتووە** (فقيل من هي الناجية؟ قال ما أنا عليه اليوم وأصحابي) .

**پ٣/ السلام عليكم ورحمة الله وبركاتـه : من پرسـیارەكەم ئەوەیـە كـە ئایـا چـۆنە داوای دوعـا لـە موسـڵمانان بكـەیت لـە كاتێكـدا لـە فەرموودەی پێغەمبەر دا صلى الله عليه وسلم دا هاتووە كە ئەو حەفتا هــەزار كەســەی بــە بــێ لێپرسـینەوە دەچـنە بەهەشـتەوە یـەكێك لـە مەرجەكانیان ئەوەیە كە داوای دوعا لە خەڵكی ناكەن .**

**وەڵام :**

وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته

داوای دوعاكردن لە موسڵمانان دروستە و چەندین بەڵگـەمان هەیـە بەبەڵگـەی ئـەوەی چـەندەها كـەس لـە چـەندەها كـات و شـوێنی جیـاوازدا داوایـان لـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كردووە بۆ نموونە ئەو كەسەی لـە ڕۆژی

**جمعه دا هاتە مزگەوتەوە لەبەر بێ بارانی داوای لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد داوای باران بارین بکات ئەویش خوتبەی دەخوێند وتی :** (يارسول الله هلكت الأموال وانقطعت السبل فادع الله إلينا يغثنا فرفع رسول الله صلى الله عليه وسلم يديهثم قال : (اللهم أغثنا) ثلاثاً....) رواه البخاري ومسلم .

**واتە : وتی ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماڵ و سامانەکانمان نەمان و تیاچوون چارەسەرمان نەما داوا لە خوای گەورە بکە بارانمان بۆ ببارێنێت ئەویش دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی : خوایە بارانمان بۆ ببارێنە و تێرئاومان بکە سێ جار ئەمەی فەرموو.**

**یان حەدیسی ئەو ئافرەتەی کە ئەهلی بەهەشتە** (عطاء)**ی کوڕی (رباح) ئەڵێ (ابن عباس) پێی وتم ئایا ئافرەتێکت پیشان نەدەم لەئەهلی بەهەشتە منیش وتم : بەڵێ ، وتی ئەم ئافرەتە ڕەشە هاتووە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی وتووە :** (إني أصرع واني اتكشّف فادع الله لي قال إن شئتِ صبرت ولك الجنة وإن شئت دعوت الله أن يعافيك فقالت أصبر فقالت إني أتكشّف فادع الله لي أن لا أتكشف فدعا لها) رواه البخاري برقم ٥٦٥٢ .

**واتە : من نەخۆشی پەرکەمم هەیە لەو کاتەی بەسەرم دێت لەشم دەردەکەوێت بۆیە داوام لە خوا بۆ بکە چاك ببمەوە پێغەمبەری خوا صلی الله**

عليه وسلم پێی فەرموو ئەگەر دەتەوێ بچیتە بەهەشتەوە دەبێت ئارام بگریت ، و ئەگەر دەتەوێ چاك ببیتەوە داوات بۆ دەکەم لە خوا وتی : ئارام دەگرم ئەنجا وتی من لەشم بەدەردەکەوێت دوعام بۆ بکە دەرنەکەوێت لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوعای بۆ کرد .

جا ئەمانە و چەندین بەڵگەی تریش هەن لەسەر دروستێتی داوای دوعای خێرکردن لە موسڵمانان بەڵام حەدیسی ئەوانەی کە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێ پرسینەوە و سزا ئەو باسی لە سیفەتێکی تر دەکات دەقی حەدیسەکەش ئەوەیە ابن عباس ئەڵێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : (...فقيل لي هذه أمتك ومعهم سبعون الفاً يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب.... فقال هم الذين لا يسترقون ولا يكتوون ولا يتطيرون وعلى ربهم يتوكلون فقام عكاشة بن محصن فقال ادع الله أن يجعلني منهم قال أنت منهم...)الحديث . رواه البخاري ومسلم .

واتە : پێیان وتم ئەمە ئومەتەکەی تۆیە حەفتا هەزاریان لەگەڵە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپرسینەوە و سزا ئەوانیش بریتین لەو موسڵمانانەی کە داوای دوعا بەسەردا خوێندن لەکەس ناکەن و داخ کردن (کەوی کردن) بەکار ناهێنن و باوەڕیان بە شوم و نەگبەتی نییە و پشت لەو شتانە بە خوا

دەبەستن . لەم کاتەدا عوکاشە هەستا و وتی ئەی پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیه وسلم داوام بۆ بکە لە خوا لەوانەم حیساب بکـات ئـەویش فـەرمووی تـۆ لەوانەیت .

جا دوعا بەسەردا خوێندنیش دروستە عائشە بەسەر پێغەمبەری خـوادا صـلی الله علیه وسلم خوێندویەتی و پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم بەسەر کەسی تـردا خوێندویـەتی ، بـەڵام مەبەسـت ئەوەیـە ئینسـان خـۆی داوای نـەکات و ئـارامی هـەبێت لەسـەر نەخۆشـیەکان داخ کـردنیش دروسـتە بـەڵام نـەکردنی باشترە کەوابوو نـەکردنی ئـەو دوو سـیفەتە باشـترە ، بـەڵام سـیفەتی (طيرة) باوەڕبوون بە نەگبەتی و شومی مانگی سەفەر یان پژمین یان کەروێشـك یـان ... یان...ئەمانـە دروسـت نیـە هەنـدێکیان شـیرکن ئـەوەش بزانـە هـەر لـەم فەرموودەیەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە داوای دوعای خێرکـردن لەگـەڵ دوعـا بەسەردا خوێندن دووشتی جیاوازە دەبینی ئەم حەدیسە ئەم سیفەتانە بـاس دەکات عوکاشە داوای ئەوە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم دەکـات دوعای بۆ بکات ئەویش بۆی دەکات کەوابوو زۆر ڕوون و ئاشکرایە .

**پ٤/ مامۆسـتا گیـان مـن ماوەیەکـە زۆر بـیر لـە پـەروەردگار دەکەمەوە بەتایبەتی لەم ڕەمەزانەدا ، ئایا من چیبکەم تـا ئـەم خەیاڵـە**

**ناخۆشانە لە مێشکم لابەم ، بەڵام شەیتانیش لە ڕەمەزاندا بەستراوەتەوە ئەگەر بڵێم ئەوە شەیتانە. خوای گەورە پاداشتان بداتەوە.**

**وەڵام :**

**بیرکردنەوەی خراپ لە خودی خوای گەورە وەسوەسەو فێڵی شەیتانەکانە لە جنۆکە و ئادەمیزاد بۆ ئەو مەسەلەیەش شارەزابوون و پەناگرتن بە خوای گەورە چارەسەرە ، هەرکات ئەو خەتورانە بە دڵدا هاتن بڵێ :** أعوذ بالله من الشيطان الرجيم . **ئەنجا بەستنەوەی شەیتانەکان لە ڕەمەزاندا ڕاستە و فەرموودەی صەحیحی لەسەرە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه سلم دەفەرموێ :** (تغلق أبواب النار وتفتح أبواب الجنة وتصفد فيه الشياطين) رواه أحمد والنسائي .

**واتە : دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن وە دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە وە شەیتانەکان دەبەسترێنەوە .**

**بەڵام هەموو جنۆکەکان نابەسرێنەوە کەوابوو شەیتانەکان جنۆکەن بەڵام هەموو جنۆکەیەك شەیتان نیە ، کەوابوو جنۆکەی خراپ کە شەیتانیش نین دەتوانن وەسوەسەی خراپ دروست بکەن بەڵام لەڕەمەزاندا کەمتر .**

**پ ٥ / خوای پەروەردگار چۆن لێپرسینەوەی منداڵی ئەو هۆز و تیرانە دەکات کە پێش هاتنی پێغەمبەران ژیاون؟**

**وەڵام :**

منـدالآنی کـافر لـە ڕۆژی قیامەتـدا خـوای گـەورە زینـدویان دەکاتـەوە وە پرسـیاریان لـێ دەکـات هـەرکام وەلآمـی دروسـتیان دایـەوە دەیانخاتـە بەهەشتەوە ئەگەر نا ئـەوە بـۆ دۆزەخـە . لـە گۆڤـاری ڕێگـای ڕاسـت پێشـتر وەلآمی ئەم پرسیارەمان داوەتەوە .[**بڕوانە پرسیاری** (٢٣) **لە لاپەڕە** (٣٥)]

**پ ٦ / بێ گومـانم لـەوەی کـە ئیسـلام جـوانترین بەرنامـەی ژیانـە ، بەلآم ئایا بوونی کەنیزەك زوڵم نی یە لە ئافرەت؟**

**وەڵام :**

بـەڵێ ئیسـلام جـوانترین و تـەواو تـرین بەرنامەیـە لـە هـەموو خاڵەکانیـدا لـە بیروبـاوەڕ و شـەریعەت و ئاکارەکانـدا هـەروەها لەمەسـەلەی کـەنیزەك دا باشترین چارەسەری داناوە بۆ ئەو ژنانەی کە ئـاینی خوایـان هەڵنـەگرتووە و دژایـەتی بەنـدەکانی خـوایش دەکـەن کـە لـە جەنگـدا دەگیرێـن ، باشـترین چارەسەر ئەوەیە بدرێن بە پیاوانی موسوڵمان لە کوفر و شیرك و کاری خراپ ڕزگار بکـرێن ، ئـەنجا ئێمـە دەبـێ ئـەوەش بـزانین ئـەو ئافرەتانـە جـەنگیان

کـردووه و لـه جه‌نگدا گـیران بـه هـه‌ر پێـوه‌رێکی تـر بێـت جگـه لـه ئیسـلام ده‌کوژرێن ، به‌ڵاّم ئیسلام ده‌یانکـات بـه هاوسـه‌ر له‌گـه‌ڵ موسـوڵمانان وه بـه شێوه‌یه‌کی واقعیش ئیسلام ئه‌م پرۆژه‌یه‌ی جـیٚ بـه جـیٚ کـردووه ، و دایکـی زۆرێك له زانایانی ئیسلام که‌نیزه‌ك بوون و پاشان موسڵمانیش بوون جـا نـه‌ك ئه‌مه زوڵم بێت به‌ڵکو ڕه‌حمه‌تێکی زۆر گه‌وره‌یـه و جیاوازییـه‌کی زۆرباشـه لـه نێوان پیاوان و ژناندا که له جه‌نگدا ده‌گیرێن .

**پ٧/ برایانی به‌ڕێزم پرسیارێکم هه‌یه سه‌باره‌ت به گوناهکردن : ئایا ئه‌گه‌ر که‌سێك گوناهێك بکات به نهێنـی و له‌بـه‌ر چاوی خـه‌ڵك دا نه‌یکات ئایه ئه‌م گوناهه ناچێته بابی شیرکه‌وه؟**

**وه‌ڵام :**

گوناه کردن به په‌نهان بێت یان به ئاشکرا شتێکی خراپه و سه‌رپێچـی خـوای گه‌وره‌یه وه پێویسته موسڵمانی کاملٚ و به ته‌قوا خۆی له هه‌ردووك بپارێزێت ، چونکه خوای گه‌وره لـه باسـی مونافیقه‌کانـدا ده‌فـه‌رمویٚ : {يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللهِ } (١٠٨) سورة النساء

واتە : لە کاتی گوناهکردندا خۆیان لە خەڵکی دەشارنەوە بەڵام خۆیان لەخوا ناشارنەوە واتە شەرم لە خودا ناکەن ، بەڵام ئەم سیفەتە هەرچەند خراپە و گوناهە بەڵام بە شیرك دانانرێت مەگەر بیروباوەڕی لەگەڵ بێت .

**پ ٨/ سرودی نیشتیمانی کورد کە دەڵێ دینمانە.... ئایا وتنی گوناهە یان نا؟**

**وەڵام :**

بۆ سرودی نیشتیمانی کورد بەڵێ ئەم سرودە چەندین کوفرو گوناهی تیادایە پێویستە بگۆڕدرێت بۆ شتێکی باشتر ، و کاتێك ئێمە ئەم قسەیە دەکەین هەر خۆمان بە کورد دەزانین شانازی دەکەین بە خاك و گەل و ئایینی میللەتەکەمانەوە ، بەڵام ئەمە پیلانێکە بۆ لەناوبردنی ئایینی ئیسلام لە دڵی تاك و کۆمەڵی کورددا .

**پ٩/ ئایا سزای قەبر هەیە؟**

**وەڵام :**

**بەڵێ لە گۆڕدا سزا هەیە بۆ بێ باوەڕان و تاوانبارانی موسوڵمانیش ئەوەی خوا ویستی هەبێت سزای دەدات وە سزاکەش دەکەوێتە سەرجەستەو ڕوح**

**نەك تەنها ڕوح یان تەنها جەستە وەك هەندێ لە مەزهەبەكانی دژ بە ئـەهلی سوننەت ئەڵێن ، كەسێك كە زوو مردبێت سزا ئـەدرێت تـا ڕۆژی قیامـەت وە كەسێك كە ئێستا دەمرێت سزا ئەدرێت تا ڕۆژی قیامەت ئەگەر شایستەی سزا بوون جا كەم یان زۆر بەراورد ناكرێن ، چونكە جۆری سزاكان زۆر و جیاوازن وە جیهـانی (بـەرزەخ) چەشـنی ئـەم دونیایـە نییـە و ژیـانێكی تایبەتـە و ئەحكامەكانیشی تایبەتن .**

**پ١٠/ دەربارەی هێنـانی كچێكی ٩ سـاڵ لەلایـەن پێغەمبـەرەوە صلى الله عليه وسلم تاچەند ڕاستە؟**

**وەڵام :**

ئەو كچەی كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لـە تەمـەنی نـۆ سـاڵی دا هێنای (عائیشە)یە دایكی ئیمانداران ئەمەش ڕاستە و زۆر شتێكی ئاسایی یـە بۆ دیراسەكردنی ئەم مەسەلەیەش پێویستە ئەم شتانەمان لا ڕوون بێت :

یەكەم : مارەكردنی كچی تەمەن منداڵ دروستە پێش بالغ بـوونی واتـە تـەنها مارە بڕین نەك گواستنەوەی ، ئەم مارەبڕینەی عائشە كە لە بوخاریدا بەناوی (زواج الابكار)ەوە حەدیسی لەسەر هاتووە بەڵگەیە لەسەر ئەم مەسەلەیە .

دووەم : هاندان بۆ مارە کردنی عائشە لەلایەن پێغەمبەرەوە صلى الله عليە وسلم وەحی بووە ویستی خوا بووە و هەواو ئارەزوو نەبووە .

سێ یەم : عائشە هەرچەندە تەمەنی نۆ ساڵ بووە پێگەشتوو و باڵغ بووە .

ئەوەش بزانە زۆرکەسی دڵ نەخۆش ئەم مەسەلەیە دەوروژێنن بەمەبەستی تانەدان و ڕەخنەگرتن لە ئیسلام و پێغەمبەران و پێغەمبەر صلى الله عليە وسلم کە ئەڵێن (محمد) کچێکی تەمەن نۆ ساڵی مارە کردووە ، بەلأم نازانن ژنی یەکەمی (خدیجە) بێوەژن بووە و پێش ئەم دوو شوی تری کردووە و تەمەنیشی لە پێغەمبەر صلى الله عليە وسلم گەورەتربووە .

ئەوەش بزانە پێگەشتن و باڵغ بوون بەتەمەن نییە و لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت ، بەتایبەت شوێنی گەرمەسێر و کەش و هەوای لادێ و دووربوون لە ژینگەی ئاڵۆز و تەنانەت جۆری خۆراك و پەروەردە کاریگەریان هەیە لەسەر گەیشتن و گەورەبوون با تەمەنیش کەم بێت .

**پ١١/ خێزانەکەم بەرنامە و مەنهەجی (سەلەف) ی پێ قەبوڵ نیە چی لەگەڵدا بکەم؟**

**وەڵام :**

پێشەکی داواکارم لە خوای گەورە ڕێبازی سەلەف بە هەموومان ببەخشێ و لەسەری بمانهێڵێتەوە تاوەکو مردنمان وە بەتایبەت خێزانی بەڕێزتان ، بۆ وەڵامی پرسیارەکەی بەڕێزت ئەڵێم ئەگەر خێزانت موسوڵمان بێت واتە بیروباوەڕی و کردەوەی دژ بە ئیسلامی نەبێت کە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بچێتە دەرەوە ، ئەبێت ئارام بگریت و بەردەوام ئامۆژگاری چاکەی بکەیت وە پێویستە لەسەر بەڕێزت هەموو مەرجەکانی ئامۆژگاری کردن بگریتە بەر بەتایبەت لایەنی زانستی و نەرم و نیانی و ئارامگرتن لەوانەیە ئەمڕۆ نەیەتە باری قەناعەت سبەینێ یان ماوەیەکی تر خۆی ئاشنا بێت و زانست پەیدا بکات ، بەهەر حاڵ (لەبەر ئەوەی) بێ دین نەبێت و لە ئیسلام دەرنەچێ پێویستە بەئارام بیت بەلاَم خۆت و منداڵەکانت بە ژیرییەوە لە بیرو بۆچونەکانی خێزانت کە دژ بەمەنهەجی دروستی سەلەفین بپارێزە بەڵگە لەسەر ئەمانەی وتمان ئەمانەیە :

**خوای گەورە دەفەرموێ :** {... وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ} العصر(٣)

**پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وسلم : (الدين النصيحة قلنا لمن قال لله ولكتابه و لرسوله ولائمة المسلمين وعامتهم) رواه مسلم

**وە خـوای گـەورە دەفـەرموێ :** {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا} (٦) سورة التحريم

**وە دەفەرموێ :** {ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ} (١٢٥) سورة النحل

**وەزانايان كۆڕان لەسەر ئەوەی دروست نيە پياو ئافرەتی بتپەرست و بێ دين و لەدين دەرچوو و گاپەرست و خاوەن بـيرو بـاوەڕی كۆمۆنيسـتی مـارە بكات بەبەڵگەی ئەم ئايەتە :**

{وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُوْلَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللّهُ يَدْعُوَ إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ} (٢٢١) سورة البقرة

**پ١٢/ کەسێك خۆی دەسوتێنێت بۆچی گوناهی دەگاتێ لەکاتێکدا سەرئەنجامی هەر مردنە؟ وە ئایا سزای کەسێك کە خۆی دەکوژێت چیە؟**

**وەڵام :**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**خۆسوتاندن یان خۆکوشتن بەئەنقەست گوناهێکی گەورەیە نابێ موسوڵمان پەنای بۆ ببات ، وە پێویستە موسوڵمان بەئارام بێت بەرامبەر کۆسپەکانی ژیانی دونیا و ترسی خوای هەبێت و ئەو باوەڕەی بەخوا و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر ئەبێت کارێکی وا بکەن کەسی موسوڵمان هەرگیز لە دونیادا دەست بۆ خۆکوشتن و نائومێدی نەبەن ، و دەبێ موسوڵمان هەمیشە چاوی لە پاداشتی ڕۆژی دوایی یەوە ببێت ڕاستە دوا ئەنجامی هەموو کەسێك هەر مردنە ، بەڵام ئێمە کەسمان نازانین کەی و بەچی و لەکوێ دەمرین وە قەدەغەمان لەسەر کراوە خۆمان بکوژین ، کەوا بوو مرۆڤ کاتێك تاوانبار دەبێت کە خۆی بکوژێت ئەگینا مردن هەر یەکجارە و هەر ئەوەشە کە بۆی نوسراوە ، بەڵام ئەو تاوانباربوونە لەبەر ئەوەیە فەرمانی خوای شکاندووە سزای کەسێك کە خۆی بسوتێنێ یان بکوژێت بەئەنقەست ئەوەیە کە ئەبو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێ ئەڵێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)**

**فەرموویـەتی :** (من تردّى من جبل فقتل نفسه فهو في نار جهنم يتردى فيها خالداً مخلداً فيها أبداً ، ومن تحسى سُمّاً فقتل نفسه سُمُّه في يده يتحساه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً ومن قتل نفسه بحديدة مخديدته في يده يتوجأ بها في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً)رواه البخاري ومسلم .

**واتە : هەر کەسێ بەئەنقەست خـۆی لـە شـاخێك فـڕێ بداتـە خـوارێ خـۆی بکوژێت ئەوە سزای لە ڕۆژی دوایی دا لە ئاگری دۆزەخ ئەوەیە بەبەردەوامی لە ئـاگردا خـۆی فـڕێ دەداتـە خـوارێ ، و هەرکـەس ژەهـر بخـوات و خـۆی بکوژێـت ئـەوە لـە دۆزەخـدا ژەهرەکـە بەدەسـتییەوەیەتی و دەیخـوات و دەیکوژێتەوە بەبەردەوامی ، و هەرکەس خۆی بکوژێت بە پارچە ئاسنێك لە دۆزەخـدا ئـەو ئاسـنەیە بـە دەسـتییەوەیەتی بـەوە لـە خـۆی دەدات بەبەردەوامی.**

**کەوا بوو موسوڵمانی بەڕێز خۆکوشتن یەکێکە لە تاوانـە گـەورەکان وە ئـەو کەسەی لە دونیادا خۆی دەکوژێت ئەوە کەسێکی نا ئومێد و ڕەشبینە و لـە دوا ڕۆژیشدا سزاکەی زۆر سەختە خوا پەنامان بدات .**

**پ١٣/ من ماوەیەك پێش ئێستا دوكانێكم بڕا (دزرا) وە تا ئێستا كابرای دز نەدۆزراوەتەوە جا بۆ دۆزینەوەی ئەو كەسانە خەڵكی هەندێ كەسیان بۆ دەستنیشان كردووم كە لەڕێگەی ئەوانەوە بتوانم بیاندۆزمەوە ئەم جۆرە كەسانەش بە عیلمی پاراسایكۆلۆژیا یان بە تەنوینی موگناتیسی ئەم كارە دەكەن ، بەلاَم من بڕوام پێیان نیە وەپێشم وایە ئەم جۆرە كارانە گوناحە جا نازانم ئێوەی بەڕێز لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

هەر كەس شتێكی دزرا دەتوانێت هۆكارەكان بگرێتە بەر بۆ دۆزینەوەی دزراوەكەی بەلاَم بە هۆكاری واقعی كە لە مەحكەمەی موسڵمانان‌دا كاری پێ دەكرێت لە درێژایی مێژووی حوكمڕانی موسڵمانان‌دا ، لەوانە دۆزینەوەی شتەكەی بە دەستی دزەكەوە یان دان پیانانی دزەكە بەوەی كە ئەو دزیویەتی یان بوونی شایەت لەسەری بەم شێوەیە تۆمەت جێگیر دەكرێت چونكە قاعیدەی شەرعی وایە دەڵێ : (المتهم بري حتى يثبت عليه الدليل) یان (الأصل براءة الذمة) بەلاَم بە پاراسایكولوژیا یان (تنويم المغناطيس) یان بە

جادووگـەر و سـاحیر یـان بەهــەر شـتێکی نـاواقعی تاوانبـاری ئـەو کەسـە ناسەلمێنێت و جێگیر ناکرێت ، ئەوەش بزانـە لـە زۆربـەی ئەمانـەی باسـکران جنۆکە و شەیتانەکان ڕۆڵی خراپ دەبینن بۆ دروست کردنی ئاشـوب و فیتنـە لە نێوان موسڵمانان و ئادەمیزاد بە گشتی .

## پ١٤/ ناوی دەرگاکانی بەهەشت و ماناکەی بەکوردی چیە؟

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**پێشەکی باوەڕمان بەوە هەیە کـە بەهەشـت چـەند دەرگایـەکی هەیـە ، و لـە چەندین فەرموودەی (صحیح) دا ئەوەهاتووە** ، (عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال إذا جاء رمضان فتحت أبواب الجنة)رواه البخاري برقم (١٨٩٨) .

**وە لە حەدیسی ئیمامی موسلیمدا ئەوە هاتووە کەبەهەشـت هەشـت دەرگـای هەیە لە باسی ئەوەی هەرکەس دوای دەست نوێژگرتن بڵـێ** : (أشهد أن لا إله

إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله) **ئەفەرموێ** (إلا فتحت له أبواب الجنة الثمانية يدخل من أيّها شاء) رواه مسلم (١/٢٠٩/٢٣٤) .

**بۆ ناوی دەرگاكانیش ئەم ناوانە هاتوون :**

١- (...فمن كان من أهل الصلاة دُعي من باب الصلاة ومن كان من أهل الجهاد دُعي من باب الجهاد ومن كان من أهل الصدقة دُعي من باب الصدقة ومن كان من أهل الصيام دُعي من باب الصيام و باب الرّيان...)رواه البخاري برقم (٣٦٦٦) .

**لەم فەرموودەیە ناوی چوار دەرگایان هـاتووە إبـن حجـر ئـەڵێ : پێنجـەمیان دەرگای** (حەج)**ە چونكە حەجیش پایەیەكی گەورەیە لـە پایـەكانی ئیسـلام ، وە دەرگا بۆ ئەوانی تر هەبێت بێ گومان بۆ ئەمیش دەرگایەك هەیە. شەشەم دەرگای** (الكاظمين الغيظ والعافين عن الناس) **حەوتـەم : دەرگـای** (الأيمن) باب المتوكلين – **دەرگای ئەوانەی لێیەوە بەبێ لێپرسینەوە و سزا دەچـنە ژوورەوە ، هەشتەم دەرگای** (ذكر) **لەوانەیە هەشـتەم دەرگـای زانسـتیش بێـت زانایـان هەموویان ئەمەیان باسكردووە. بڕوانە** فتح الباري **بەگی ٧ لاپەڕە ٣٤.**

**ناوی دەرگاكان بە كوردی**

**١- دەرگای نوێژ**

٢- دەرگای زەکات

٣- دەرگای ڕۆژوو

٤- دەرگای جیهاد

٥- دەرگای حەج

٦- دەرگای لێبوردن لەخەڵك

٧- دەرگای پشت بەستن بەخوا

٨- دەرگای یادکردنی خوا یان دەرگای زانست .

سەبارەت بەوەی ئایا موسوڵمانان بۆیان هەیە لە هەموو دەرگاکانی بەهەشتەوە بچنە ژوورەوە؟ ئیمامی ئەبو بەکر (خوای لێ ڕازی بێ ) ئەم پرسیارەی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردووە (فهل يدعى أحد من تلك الأبواب كلها) واتە : ئایا کەس لە موسڵمانان لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێت و لەهەموویانەوە بچێتە ژوورەوە؟ فەرمووی : بەڵێ بۆ کەسێ ئەو سیفاتانەی تیادا کۆبێتەوە.

ئـەو بـانگ لێکردنـەش بـۆ ڕێزلێنانـە ئـەگینا هـەر لەیـەك دەرگـاوە ئەچـێتە ژوورەوە بـەلاّم ئـەوەی هـەڵگری هـەموو سـیفەتەكان بێـت دەتوانێـت لــە هەركامیانە خۆی بیەوێت بچێتە ژوورەوە.

بڕوانە فتح الباري شرح صحيح البخاري بەرگی ٧ لاپەڕە ٣٤ .

**پ١٥/ من حاڵەتێكی ناخۆشم بەسـەردا هاتووە ئـەویش توشـی وەسوەسە هاتووم لـە ڕاسـتی دا ئـەو وەسوەسـەی مـن توشـی بومـە لـە كوفرەوە نزیكە ئایا چی بكەم تاكو لەم حاڵەتە خۆم بپارێزم؟**

**وەڵام :**

یـەكێك لـە سـیلاحەكانی شـەیتان بـۆ دژایـەتی كردنـی ئـادەمیزاد بریتیـە لـە دروست كردنی (وەسوەسە) لە دڵی ئادەمیزاد دا ، ئەمەش جەنگێكی كـۆن و بەردەوامی شەیتانە لەو كاتەوەی خوای گەورە ئـادەمی دروسـتكردووە دوای ئەوەی خوای گەورە بە ئادەمی فەرموو لەبەهەشـتدا بـن خـۆت و خێزانـت وە لەبەروبوومی بەهەشت بخۆن تەنها ئەو دارە نەبێت ، بەلاّم شـەیتان ختـورەی بۆ ئادەم كرد وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

{فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لاَ يَبْلَى}
(١٢٠) سورة طه

**تا ئادەم لە دارەکەی خوارد و ئەو کارەش بووەهۆی دەرکردنی لەبەهەشت و لەدەستدانی ئەو بەخششەی خوا و ناردنی بۆ سەر زەوی جا خاوی گەورە دەفەرمویٚ :** { وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ }سورة البقرة (١٦٨)

**واتە : شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون ، لێرەوە ئەوەمان دەست دەکەوێت شەیتان بۆ لەخشتە بردنی ئادەمیزاد بەیەکجار داوای شت ناکات ، بەڵکو هەنگاو و قۆناغ بە قۆناغ تاوەکو ئامانجەکانی بەدی دەهێنیٚ ، (وەسوەسە)ی شەیتان بوارەکانی زۆرن : یەکێك لە بوارەکانی ئەوەیە کە خاوەنی ئەم پرسیارە ئاماژەی بۆ دەکات کە بریتی یە لە وەسوەسە بۆ کردن لە بابەتی بیروباوەڕ و کوفر پیٚ کردن لێرەدا ئەمەوێت ئەوە بەخاوەنی پرسیارو ئەوانەی ئەم جۆرەیان هەیە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێوە ئیمانتان لە دڵدا هەیە و لەگەڵ کوفرو بیٚ باوەڕی دا دژایەتی دەکات وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ :** (ذلك صريح الإيمان) **بۆ چارەسەرکردنی (وەسوەسە)زانایان دوو شتیان داناوە :**

یەکـەم : بەدەسـتهێنانی زانسـتی شـەرعی بەتایبـەت لـەوەی کـە شـەیتان وەسوەسەی تیادا دەکات .

دووەم : وازهێنان و بەقسەنەکردن و بەدوادا نەچوونی ئەو ختورانەی شەیتان دەیانکات .

لـەدوای ئەوانـەش پـەناگرتن بـەخوای گـەورە ونیـاز پـاکی بـۆ خـوا ، چـونکە هەبوونی نیاز پاکی پاراستن و سەرکەوتنی خوا مسۆگەر دەکات.

**پ١٦/ من هەندێ جار خەریکە بێ باوەڕ ئەبم ، ئەمجا داواتان لێ ئەکەم ڕێگە چارەیەکم بۆ بدۆزنەوە هەر چەند بڕوایەکی تەواوم بە ئاینی ئیسلام هەیە بەس هەست بە شتێك ئەکەم لە ناو دڵم .**

**وەڵام :**

بەردەوام شەیتان لە هەوڵدایە بۆ ئەوەی موسوڵمانان لە خشتە ببات هەریەکێ بە شێوەیەك ، یەکێك لەو شێوازانە دروست کردنی وەسوەسە و شك و گومانە ، بەڵام دڵی موسڵمانیش بە هۆی ئەم ئیمان و ژیرییەی تیایدا دەکەوێتە شـەڕ لەگەڵی ، جا ئەوەی تـۆ باسـی دەکـەی شـەڕی نێـوان ئیمـان و وەسوەسـەی شەیتانە و هەمان پرسیار لـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم کـرا وە ئەویش فەرمووی : (ذلك صريح الايمان) مـن مـوژدەت پـێ ئـەدەم تـۆ ئەگـەر

کەسێکی بێ باوەڕ بویتایە شەیتان وازی لێت دەهێنا ، بەڵام دەزانێ ئیمانداری بۆ ئەوە وەسوەسە دروست دەکات وە تۆش دژی بوەستەوە پشتیش بە خوای گەورە ببەستە إن شاء الله سەرکەوتوو دەبیت .

**پ١٧/ من زۆر ڕەش بینم هەرچەندە لە دین نزیك ئە بمەوە هەرماوەیەکی کەم باش ئەبم دوایی زۆر بێ تاقەت و ڕەش بین ئەبمەوە و بیر لە مردن ئەکەمەوە ، هەست ئەکەم مردن خۆشترە دوعاش زۆر زۆر ئەکەم بەتایبەت ئەو کاتانەی کە دوعای تیادا زۆر قەبوڵە بەڵام هەر باش نابم تکایە یارمەتیم بدەن لەبیر کردنەوەی خۆم زۆر ئەترسم .**

**وەڵام :**

ڕەش بینی کارو بۆچونێکی خراپە بەڵکو بە پێچەوانەوە موسوڵمان دەبێ گەشبین بێت وەك وتراوە : (تفاءلوا بالخير تجدوه) گەشبین و دڵخۆش بن بە خێرو خۆشی دەیگەنێ .

جا بۆ چارەسەرکردنی ڕەشبینی پێویستە موسڵمان لە شارەزابوونی ناو وسیفەتەکانی خوای گەورە بچێتە پێش وە بتوانێ سودیان لێ وەربگرێت ،

ئەوەش بزانە پەروەردەی ئیسلامی مرۆڤ پەروەردە دەکات لەسەر ترس و هیوا بە یەکسانی بۆ ئەوەی مرۆڤ نەڕوخێ و زیادە ڕۆیش نەکات لەسەرپێچی دا ، جا بۆ لایەنی هیواو ئومێد بەڕەحم و عەفوی خوای گەورە چەندین ئایەت و فەرموودە هەن پێویستە زۆریان لێ بزانیت بۆ دروستکردنی هیواو ئومێد بەڕەحمی خوا و گەشبین بێت لەوانە خوای گەورە دەفەرموێ : {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ } (٥٣) سورة الزمر

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ : خوای گەورە دەفەرموێ : (يا ابن آدم لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا لأتيتك بقرابها مغفرة) رواه الترمذي وحسنه .

واتە : ئەی ئادەمیزاد ئەگەر پێم بگەیت لە قیامەتدا پڕبەپڕی تاوانت کردبێ بەلاَم شەریکت بۆم بڕیار نەدابێت منیش لە پاداشتدا بەقەد ئەوە لێخۆشبونم بۆت هەیە .

## پ١٨/ مورتەد حوکمی چیە؟

**وەڵام :**

مورتەد بەو کەسە دەگوترێت موسوڵمان بێت و پاشان هەڵگەڕێتەوە لە ئاینەکەی وە حوکمی شەرعی بۆ باس بکرێت کە هەڵگەڕاوەتەوە بەنیسبەت حوکمەکانی مورتەد حوکمەکان زۆرن لەوانە : حەڵاڵبوونی کوشتنی (بەڵام بۆ دەوڵەت نەك بۆ هەموو تاکێك لە موسوڵمانان) جیاکردنەوەی ژنەکەی لێی ، و میرات وەرنەگرتنی لەکەس و کاری ، و جێ بەجێ نەکردنی حوکمەکانی نوێژی جەنازە و شۆردن و لەگۆڕنانی لە گۆڕستانی موسوڵماناندا وە چەندین حوکمی ترسناکی تر کە پێویستە ئاگامان لێیان بێت .

## پ١٩/ تکایە باسی ژیانی جنۆکە بکەن

**وەڵام :**

جیهانی جنۆکە جیهانێکی گەورەیە و لە پێش ئادەمیزادەوە هەن وەك لەبەسەرهاتی (ئادەم)ە وە بۆمان دەردەکەوێت ئەو جۆرە دروست کراوە لە ئاگر دروستکراون وەك چۆن خۆمان لە گڵ دروستکراوین نێرو مێیان هەیە واتە زاوزێ دەکەن و نەوەیان هەیە و ژیان و مردنیان هەیە و خواردن دەخۆن و ژن دەهێنن و ماڵ دروست دەکەن و خزم و کەس و کاریان هەیە لە زۆر شتدا لە ئادەمیزاد دەچن چاك و خراپیان هەیە و موسوڵمان و بێ باوەڕیان هەیە ، لە ئایندا لەگەڵ ئادەمیزاد وەك یەك وان لە داواکاری ئاینی لەسەر یان

وەك خوای گەورە دەفــەرموێ : {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلاَ لِيَعْبُدُونِ} (٥٦) سورة الذاريات

ئەوەندە هەیە ئەوان ئێمە دەبینن ئێمە ئـەوان نـابینین ئەمەشــە بوەتــە هــۆی خراپ تێگەشتنی هەندێ کەس لەم دروستکراوە ، بەڵام خوای گــەورە بــەلاواز نــاوی بــردوون وەك دەفــەرموێ : {إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا} (٧٦) سورة النساء . واتە : فێڵیان لاوازە لەسەر کەسێك ئیماندار بێت جا ئەمــە بــەکورتی لەســەر عالــەمی جنۆکــە ئــەگینا باســەکە زۆر هەڵــدەگرێت ، چــونکە جنۆکــە باڵداریان هەیە چەندین ڕەنگ و شـێوە و شـێوازیان هەیــە کــە نــاتوانرێ لێــرە هەموو باس بکرێت .

**پ٢٠/ ڕایـی جـەنابتان بەرامبـەر ڕێکخـراوی قاعیـدە چـی یـە؟ مەبەسـتم لـە ڕووی کـارە جیهادیـەکان کـە لـە عێـراق دەیکـەن.....زۆر پێویستیم بەوەڵامی ئەم پرسیارەیە........تکایە**

**وەڵام :**

ڕێکخراوی قاعیدە یەکێکە لەو ڕێکخراوانەی زانایانی سەلەفی ڕەتـی دەکەنەوە و بەڕێکخراوێکی دژ بە بەرژەوەندی کۆمەڵگــەی ئیســلامی دەیــزانن ، وە ئــەو کارانەی لە عێراقدا دەیکەن بە ناوی جیهادەوە زانایان نە فتوایان داوە وە نە

قایلن بەو جۆرە ڕەفتارانە کە خەڵکێکی زۆر بە بێ تاوان دەکوژرێ (منداڵ ژن پـیر کەسـی مـەدەنی و بـێ لایـەن) ، وە هەمیشـە زانایـان داوایـان کـردوە موسوڵمانان نزیکی توندڕەوی نەکەونەوە وە هەمیشە ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکەن بە هێمنی و دانایی و ڕەچاو کردنی بەرژەوەنـدی شـەرعی لـە هـەموو مەسەلەکاندا .

بۆ زانیاری زیاتر ئەم دوو کتێب و ڕوونکردنەوەیە بخوێنەوە .

**یەکەم :** هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بەو تەقینەوەو خۆتەقاندنەوانەی کە لە کوردستان و عێراق و جیهاندا دەکرێـت . نووسـینی : مامۆسـتا عـدنان بارام .

**دووەم** : بەرائەتی سەلەفیەت و شوێن کەوتوانی لە تەقینـەوە پشـتیوانانی (فتـــوای پێشـــەوا ســـەلەفی یـــەکان دەربـــارەی حـــوکمی تـــیرۆر کـــردن و تەقینەوەکان لە وڵاتانی ئیسلام و جگە لەوان) نووسـینی: بـاوکی عبـدالحق . وەرگێڕانی: مامۆستا صلاح الدین .

**تێبینی** : دەتوانی لەبەشی کتێبخانەی سایتی بەهەشت ئەم دوو کتێبەیـە بخوێنیتەوە .

**پ ٢١/ ئایا حوکمی ئەو کەسە چیە کە حەڵاڵێك حەرام دەکات و حەرامێك حەڵاڵ دەکات؟**

**وەڵام :**

بێ گومان حەڵاڵ کردنی حەرام یان حەرامکردنی حەڵاڵ شتێکی گەورەیە و مرۆڤ پێی کافر دەبێت ، چونکە دژایەتی کردنی فەرمانی خوای گەورەی تیادایە ، ئەمەش زانایانی ئیسلام کۆڕان لەسەری بەڵام ئەوەندە هەیە ئەوەی حەرام یان حەڵاڵی دەکات بە ئیجتیهاد یان بە نەزانینەوە نەبێ ، چونکە کەسی نەزان لەم حوکمە بەدەرە وە ئەو کەسانەی ئیجتیهاد دەکەن.

**پ٢٢/ خـوا پاداشـتی خێرتـان بداتـەوە مامۆسـتا ئایـەت هەیـە لەسەر ئەوەی پێش دروستبوونی زەوی دیـاری کـراوە کـە چـەند مـرۆڤ دەبێت و چی بەسەر دێت واتە کەسێك کە بۆی دیاری کرابێت لەیەکەم ڕۆژی لەدایك بونیەوە تاڕۆژی کۆتایی چی بەسەر دێت تاوانی چی یە کـە کـافر بێـت خـۆ بەدەسـت خـۆی نییـە ، چـونکە بـۆی دیـاری کـراوە کەوابوو مرۆڤ بەدەست خۆی نییە موسوڵمان بێت یان کافر**

**وەڵام :**

خوای گەروە عیلمی ئەوەی ڕویداوە و ئەوەش ڕووئـەدات زانیویـە و دەیزانـێ باری بەندەکانی و زۆری و ئاکامی کردەوەیان دەزانێ و کاروباریان لـە خـوای گەورە ون نابێ وەك دەفەرموێ : { إِنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ} الأنفال ئایەتی ٧

واتە : بەڕاستی خوای پەروەردگار زانا و بەئاگایە بە هەموو شتێ .

وە دەفــەرموێ : { لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا} سورة الطلاق(١٢) .

واتە : تا بـزانن کـە خـوا بەسـەر هـەموو شـتێکدا بەتوانایـە و بەڕاسـتی خـوا زانستی بە هەموو شتێك هەیە .

جا پێش دروستبوونی دروستکراوەکان و مرۆڤەکان خوای گەورە زانیویەتی و دەزانێ چەند دەبن و چیان بەسەر دێت وە نوسراویشە چی دەکەن و کام ڕێگە هەڵدەبژێرن موسڵمان دەبن یان بێ باوەڕ کردەوە زۆر دەکەن یان کەم ، بۆیە هیچ شتێك بە ڕێکەوت و لە خۆیەوە ڕونادات بەڵکو هەموو شتێك تەقدیر کراوە ، خوای گەورە دەفەرموێ : { وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا } سورة الفرقان(٢) . واتە : هەموو شتێکی دروستکردووە بەئەندازە و قەبارە و شێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازی هەموو جۆر...هتد نەخشەی ڕیك و پێکی بۆ هەموو شتێك داناوە .

بەلاّم ئەم زانین و نوسینی خوای گەورە بۆ کردەوەکانی ئادەمیزاد بە زۆرە ملێ نی یە و خوا فشاری نەخستۆتە سەر هیچ کەسێك بۆ هەنگاو هەڵگرتن و بڕیاردان و کردەوەکردن ، بەڵکو مرۆڤ خۆی سەرپشکە و بەویستی خۆی چارەنوسی خۆی دیاری دەکات وە خوای گەورە ڕێگەی چاك و خراپی داناوە و مرۆڤی ئازاد کردووە لە هەڵبژاردنی یەکێك لەو دوو ڕێگایە ، لەهەمووی سەیر تر ئەوەیە هەندێ کەس ئەڵێن ئەگەر خوا نووسیویەتی خراپبم بۆچی موحاسەبەم دەکات و دەمخاتە ئاگرەوە ، باشە تۆ چۆن دەزانی خوا نوسیویەتی خراپ بیت بە چ ڕێگەیەك دەزانی نوسیویەتی خراپی یان چاکی لەکاتێکدا هیچیان نازانیت ، و هەرکام لەوانەشی نووسیبێ بەزۆر نییە ، بەڵکو

لەبەر ئەوەی خوای گەورە سیفاتی کەمالی هەیە و دەزانێ دوا ئەنجامی بەندەکانی چییە و نووسیویەتی بەبێ زۆر لێکردن ، جا پێویستە مرۆڤی ژێر خۆی هەوڵبدات بۆ بردنەوەی بەهەشت و ڕەزامەندی خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا ، خوای گەورە دەفەرموێ : {فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى * وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى * فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى * وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى * وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى * فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى} سورة الليل(٥-١٠) .

واتە : جا ئەوەی (ماڵ و سامان و زانستی....هتد) دەبەخشێت و پارێزگار و لەخواترسە وە بڕوای پتەوی بە پاداشتی چاك و بەنرخی خوا هەیە ئەوە ڕێگەی چاكە و چاكە كاری بۆ ئاسان دەكەین ، سەرئەنجام دەیخەینە خێرو خۆشی یەوە ، بەڵام ئەوەی دەست نوقاو بێت و خۆی بێ نیاز بزانێت (ڕەزامەندی خوای مەبەست نەبێت) وە بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاكی خوایی و بەدرۆی بزانێت ئەوە ئێمە ڕێبازی تەنگانە و ناخۆشی بۆ ئاسان دەكەین و سەرئەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین .

**پ۲۳/ سلاّوی خوات لیّ بیّت ماموّستایانی بەڕیّز ، تاوانی منداڵ چیە کە لەدایك بیّت لە شویّنیّکی ئەم زەویەدا کە دینی ئیسلامی تیانەبیّت و هەرنەشی بیستبیّت ، ئیّ کە مرد کافرە یان موسوڵمان تکایە بەبەڵگەوە.**

**وەڵام :**

سلاّوی خوای گەورە لە بەڕیّزیشت بیّت منداڵ هیچ تاوانی نییە ئەگەر لە کۆمەڵگایەکی موسوڵمان یان نا موسوڵمان بیّتە دونیاوە ، و ئەگەر مرد بە منداڵی ئیّمە ناتوانین حوکمیان بەسەردا بدەین نە بۆ بەهەشت نە بۆ دۆزەخ ، چونکە خوا دەزانیّ ئەگەر لە دونیادا بونایە چ کاریّکیان دەکرد چاك یان خراپ ، جا باشترین وەلاّم لە مندالآنی موشریکەکاندا وەك ابن تیمیە –رحمە اللە– باسیکردووە ئەوەیە کە پیّغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لە بوخاری و موسلیم دا فەرموویەتی : (ما من مولود الا یولد علی الفطرة ....) الحدیث . قیل یارسول اللە أرأیت من یموت من اطفال المشرکین وهو صغیر قال اللهم أعلم بما کانو عاملین ) .

وە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی :

(انهم يوم القيامة يمتحنون في عرصات القيامة فمن أطاع الله حينئذ دخل الجنة ومن عصى دخل النار)

واتە : منداڵانی موشریکەکان لە قیامەتدا تاقی دەکرێنەوە لە گۆڕەپانی حەشردا لە قیامەت هەرکەسیان گوێڕایەڵی خوا بکەن ئەو کاتە دەچنە بەهەشتەوە ، وە هەرکەسیان سەرپێچی خوا بکەن دەچنە ئاگرەوە ئەم ڕایە ڕای پەسەند کراوە لای ئەهلی سوننەت وە چەندین ڕاو بۆ چوونی تریش هەیە . بڕوانە مجموع الفتاوی شێخی ئیسلام ابن تیمیة ج ٤ ل ٣٠٠–٣٢٢

**پ٢٤/ حوکمی کەسێك چی یە کە جنێو بەڕیش بدات ، من گەنجێکی تەمەن 20 ساڵم لەخوا بەزیاد بێت کەخوا ئەم بەشە گەورەیەی بەمن بەخشیوە من ڕیشم دەهێڵمەوە بەڵام مامێکی بەناو حاجی م هەیە قسەی خراپ بەڕیشم دەڵێ !**

**وەڵام :**

جنێودان تاوانێکی گەورەیە دەبێ موسوڵمان خۆی بپارێزێ لەو جۆرە کارانە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ : (سباب المسلم فسوق وقتاله كفر) رواه مسلم . واتە : جنێودان بە موسوڵمان تاوانێکی گەورەیە و

فاسق بوونە و جەنگان لەگەڵی کوفرە (کوفری بچووك) ئەمە جنێودان بە خودی کەسەکە ، بەلاّم جنێودان بەکارەکەیان بەو سیفەتە کەئیسلام فەرمانی پیّ کردووە ئەمە کوفرەو مرۆڤ بەم کردەوەیە لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە ، جا تۆ دەبیّ بزانی مامت مەبەستی ڕقبوونە لە تۆ یان ڕقبوونە لە ڕیش وەکو کردەوەیەکی شەرعی ئەگەر دووەمیان بوو ئەوە کارێکی مەترسیداری ئەنجام داوە ، بەلاّم تۆش وریابە لە تەکفیر کردنی ، چونکە لەوانەیە ئەو کەسە نەزان بیّ و یان بەهەڵە حوکمی ڕیشیان بۆ باسکردبیّ بەهەر حالّ دەبیّ خۆت دووربگریت وە پێویستە بەدانایی هەڵسوکەوتی لەگەلّ بکەیت .

**پ٢٥/ مامۆستا گیان ئێمە خوای گەورە نیعمەتی ماڵی زۆری پێ بەخشیوین خزمەکان زۆر لەگەڵمان دەڵێن ، وای لێهاتووە زۆر بێزاریان کردوین حەسودیمان پێ دەبەن ، وە ئێستاش خانووی نوێمان کردووە بۆ ئەوەی لەچاو و نەفەس دووربین چ بکەین باشە لە ڕووی شەرعەوە ، مامۆستا تکایە چارەیەك دەترسین پێش ئەوەی بچینە خانووی نوێ بەڵایەکمان بەسەردا بێت زۆر سوپاست دەکەین.**

**وەڵام :**

سوپاسی خوای گەورە بکەن کە سامانی زۆری پێ بەخشیون وە بەشی هەژاران و کەسانی موحتاجی لێ بدەن وە پشت بە خوای گەورە ببەستن سودو زیان لای خوایە کەس ناتوانێ نەسوود وە نەزیانتان پێ بگەیەنێ بەبێ ویستی خوا .

خوای گەورە دەفەرموێ : {قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللّهُ لَنَا } سورة التوبة(٥١)

.واتە : ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بڵێ : هیچ شتێکمان تووش نابێ ئەوە نەبێ کەخوای گەورە بۆی نوسیوین .

دوای ئەم بیروباوەڕە نابێ بترسن وە خوای گەورە خۆی بەندە چاکەکانی خۆی دەپارێزێ حەسوودی بردنیش نەخۆشی یەکی کوشندەیە بۆ

خاوەنەکەی وە جۆرێکە لە دژایەتی کردنی خوای گەورە ، چونکە خوا بە حیکمەتی خۆی سامانی – بۆ نموونە – داوە بەیەکێك لە بەندەکانی ئەم ئاواتە خوازە ئەو سامانەی لەدەست بچێ و هیچی نەمێنێ ، جا بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە نەفسانە لە سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چەندین ڕێگەی بۆ داناوین بیانگرینە بەر وە خۆمان بخەینە پەنای خوا لەشەڕی ئەو جۆرە کەسانە ، لەوانە خوێندنی سورەتی الفلق و سورەتی الناس وە چەندین ویردو زیکری بەیانیان و ئێواران و خەوتن .

## پ٢٦/ سەبارەت بە خوێندنی کەڵەشێر لە ناوەخت دا هیچ ئەصڵێکی هەیە لە دیندا؟

**وەڵام :**

لە کۆی ئەو فەرموودانەی لە باسی کەڵەشێر هاتوون تەنها چەند فەرموودەیەك (صحيح)ن لەوانە : (إذا سمعتم صياح الديكة فاسألوا الله من فضله فانها رأت ملكاً) رواه البخاري ومسلم .

واتە : ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو داوای فەزڵی خوای گەورە بکەن چونکە مەلائیکەی بینیوە .

یان فەرموودەی زەیدی کوڕی خالیدی (الجهني) خوای لێ رازی بێ ئەڵێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : (لاتسبوا الديك فانه يوقظ للصلاة)رواه أبوداود وأحمد وابن حبان .

واتە : جوێن بەکەڵەشێر مەدەن چونکە خەڵك بۆ نوێژ بەخەبەردێنێ .

جگە لەمانە (ابن القيم) ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەڵێ : (هەموو ئەو فەرموودانەی باسی کەڵەشێر دەکەن درۆن.....) بڕوانە کتێبی المنار الحنيف في الصحيح والضعيف لاپەڕە ٥٦ .

### پ٢٧/ بەکێ دەگوترێ کافر؟

**وەڵام :**

بەو کەسە دەگوترێ کافر کە خوا و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم بەکافریان دانابێ واتە دەبێت ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام بزانێت کە مرۆڤ بە چی کافر دەبێت حوکمەکانیش زۆرن بۆ ئەم مەبەستە کتێبی (کێشەی تەکفیر لە نێوان ئەهلی سوننە و تاقمە گومڕاکاندا) بخوێنەوە .

**پ٢٨/ من ئیمانم هەیە بەخوا و دڵم پاکە شتی باش و خێرم حەز لێ یەو مێردەکەمم خۆش دەوێت نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و قورئانیش دەخوێنم بەس لەچکم حەز لێ نی یە جلەکانم ئیسلام حەزی لێ نی یە نازانم چی بکەم حوکمم چیە؟**

**وەڵام :** موسوڵمان بە وتنی شایەتومان موسڵمان دەبێ و دەچێتە ناو بازنەی ئیسلام و ئیمانەوە شایەتومانیش بریتی یە لە شایەتی دان کە هیچ خوایەك شایستەی پەرستن نییە تەنها الله نەبێت وە شایەتی ئەدەیت پێغەمبەری خوا (محمد) صلى الله عليه وسلم بەندەو پێغەمبەری خوایە ، جا ئەم شایەتومانە چەندین مەرجی هەیە یەکێك لەو مەرجانەی شایەتومان بریتی یە لە خۆشەویستی و ئەو وشەیە و ئەوەشی داوای دەکات ، شایەتومان داوای نوێژ و ڕۆژوو و چەندین کاری تر کە لە موسوڵمان داوا دەکرێت ، یەکێك لەو شتانەش لەچکە و جلوبەرگی ئابڕو و پاراستنی تۆیە لە دەستی چەپەڵ و چاوی تاوانبارەکان ئەمەش بە سوود دەگەڕێتەوە بۆ تۆ ، چونکە ئەگەر گوڵێك یان میوەیەك چەند دەستێك ئەم دیو ئەو دیوی بکەن لەناوی دەبەن و بێ کەڵکی دەکەن تۆش وای پێویستە بە پاکی و بەتوندی بمێنیتەوە ئەوەش بزانە کەس قەدرت نازانێت تەنها کات بەسەر بردنە چاوپیسان و دەستدرێژی کاران دەیکەن .

جا شایەتومان و موسوڵمان بوون وا دەخوازێ لەکەسی موسوڵمان کە ئەوەی خـوا و پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێت ئەمیش خۆشی بوێت ، ئەوەش بزانە یـەکێك لەو شتانەی موسوڵمانێتی و شایەتومان هەڵدەوەشێنێتەوە بریتی یـە لـە ڕق بـوون لە شتێك لەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆی هێناوین ، جا پێویسـتـە دەستبەجێ بڵێیت (سمعنـا و اطعنـا) وە لـەچـك بکـەیـت خـوای گـەورە یارمـەتـی هەموو لایەکمان بدات.

**پ٢٩/ ئەگەر لەسەرمان نوسراوە تاوان بکەین ئەی بۆ تاوانبارین ؟ (رفعت الأقلام و جفت الصحف) تکـا دەکـەم زۆر بـە درێـژی و زۆر بـە وردی وەڵامـم بـدەنـەوە زۆر پرسـیـارم کـردووە تـاوەکـو ئێـسـتـا نـەگـەشـتـوومەتـە قەناعەت .**

**وەڵام :** مەسەلەی نوسینی قەدەر لە لایەن خوای گەورەوە باوەڕمان پێیەتـی خوای گەورە زانایە بە هەموو شتێك کەمرۆڤەکـانی دەیکـەن ، وە هـەمووشـی نووسیوە ، بەڵام ئەم نووسینە بۆ ئەوە نییە کـە مرۆڤـەکـان ناچـار بکـات بـۆ کردنی ئەوەی نوسراوە ، دەبینی لە واقیع دا مرۆڤەکان ئازادن لە نێوانیاندا ، هەیە موسوڵمانە و هـەیانـە بـێ بـاوەڕە و هـەشـیانە ئیمـانی لاوازە هـەریـەك لەوانەش بەئازادی خـۆی ئـەوەی هـەڵبـژاردووە ، کـەوابـوو نوسـینی قـەدەر لەلایەن خوای گەورەوە هیچ فشارێکی نەخستۆتە سەر هیچ یەك لە مرۆڤەکان

، ئەوەندە هەیە هەندێك لەمرۆڤەکان ئەم پرسیارە بە هەڵە دووبارە دەکەنەوە ﴿ئەگەر لەسەرمان نووسراوە تاوان بکەین ئەی بۆ تاوانبار بین)،لە وەلآمدا دەڵێین : بەڵکو لەسەرتان نوسراوە تاوان دەکەن ئەمەش زانست و عیلمی ڕەهای خوا دەردەخات کە زانیویەتی تۆ تاوان دەکەیت و نوسیویەتی ، ئەگینا کەس دەتوانێ بزانێت خوا چی لەسەر نووسیوە کە نازانیت چۆن دەڵێی لەسەرمان نووسراوە ئەگەر مەبەست نووسینەوەی قەدەر بێت ئەوە ڕاستە (رفعت الأقلام و جفت الصحف) قەڵەم هەڵگیراوە و لاپەڕەکانیش وشکبونەتەوە بەمانای ئەوەی ئیتر هیچ نانوسرێتەوە لەقەدەر ، ئەمە وەك عیلمی خوا بە بەندەکانی کەچی دەکەن وە هەر ئەوەش دەکەن کە خوا دەیزانێ و نووسیویەتی ، بەلآم ئازادی لە هیچ یەکێکیان زەوت نەکردووە و مرۆڤ دەتوانێ موسوڵمان بێ وە دەتوانێ بێ باوەڕ بێ وە دەتوانێ چاك یان خراپ بێ ، هەر لەبەر ئەمەشە لە ئەنجامدا تاوانبار دەبێ چونکە بە ئازادی خۆی بڕیار دەدات ئەگەر سەرپێچی خوای گەورەی کرد.

**پ٣٠/ هەندێك گەنج لەم سەردەمەدا کەمتەرخەمی و بایەخ و گوێنەدانیان بەفێرنەبوونی بیروباوەڕ لێ دەبینرێت، وەخۆیان بەشتانێکی لاوەکییەوە خەریکردوە، کەوابوو ئامۆژگاری بەڕێزتان چییە بۆ ئەو جۆرە کەسانە ؟**

**وەڵام :**

بسم الله الرحمن الرحيم

ئامۆژگاری گەنجان و جگە ئەوانیش لەموسوڵمانان دەکەم لەپێش هەموو شتێك بایەخ و گرنگی بەبیروباوەڕ بدەن چونکە بیروباوەڕ ئەو بنەمایەیە کە وەرگرتن و ڕەتکردنەوەی هەموو کردەوەکانی لەسەر بنیات دەنرێت گەر هاتوو بیروباوەڕ ڕاستەقینە و دروست بوو، گونجاو بوو بەوەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێت هێناویانە، بەتایبەت کۆتای پێغەمبەران محمد (صلی الله علیه وسلم) هەموو کردەوەکان قەبووڵ دەکرێن گەر هات و تەنها بەدڵسۆزی و بەپێی شەرعی خوابێت، بەڵام گەر هات و بیر باوەڕی مرۆڤی پوچەڵ یان گومڕا کە بنیات نرابێت لەسەر داب و نەریتی باب و باپیران یان شەخس پەرستی، ئەوە قەبولڵ ناکرێت و ڕەتدەکرێتەوە هەرچەندە دڵسۆزیێ ومەبەستی تەنها خوا بێت، چونکە خوای گەورە تەنها کردەوەیەك وەردەگرێت بەدڵسۆزی بۆ خوا کرابێ و پوخت بێت (لەسەر سوننەت بێت)، هەرکەس ئەیەوێت ڕزگار بێ و موسڵمانێکی ڕاستەقینە و کردەوەکانی قەبولڵ بێ، پێویستە بایەخ بە بیرو باوەڕی ڕاستەقینەو دژەکان و نەساز و کەمکەرەوەکانی بدات بۆ ئەوەی کردەوەکانی لەسەر بنیات بنێت ئەمەش تەنها بەفێربونی ئەو بیرو باوەڕە دەبێت لای زانایانی چاوڕۆشن و خاوەن

زانستی کامڵ دەبێت ئەو زانایانەی ئەم بیرو باوەڕەیان لەسەلەفی ئەم ئوممەتەوە وەرگرتوە خوای گەورە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾(محمد:١٩).

ئیمامی بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێ سەرباسێکی داناوە بەناوی (العلم قبل القول والعمل) لێرە ئەم ئایەتە پیرۆزەی هێناوە﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ﴾ (محمد:١٩)

ئەبینیت خوای گەورە یەکەمجار فەرمان بەزانستی شەرعی دەکات پێش وتەو کردەوە، خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الأِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾خوای گەورە سەلامەت بوونی لەو زیانە بەستوەتەوە بەچوار مەسەلەوە:

**یەکەم**: ئیمان، واتە: بیر و باوەڕی ڕاستەقینە.

**دووەم**: کردەوەی چاك و وتەی چاك، کردەوەو وتەی چاکی (عطف) کردووە بەسەر ئیماندا ئەمەش لەجۆری (عطف الخاص علي العام) چونکە کردەوە لەئیمانە کەوابوو) عطف) کردنی بۆ بایەخدانە بەکردەوە.

**سێیەم**: (وتواصوا بالحق) واتە: بانگەواز دەکەن بۆ خوا و فـەرمان بەچـاکە دەکـەن و قەدەغـەی خراپـە دەکـەن دوای ئـەوەی کەبایـەخیان بەخۆیانـدا و ڕێگـای ڕاسـتیان ناسـی، بـانگی خەڵکیشـیان کـرد بـۆ ئـەو مەبەسـتە چـونکو موسڵمان فـەرمانی پێکـراوە بانگـەوازی خـەڵك بکـات بـۆلای خـوای گـەورە و فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بکات.

**چوارەم**: (وتواصـوا بالصـبر)، واتـە: ئـارامگرتن لەسـەر ئەومانـدووبوون و ناڕەحەتییانەی لەوڕێگایەدا توشیان دەبێت، موسڵمان خۆشبەخت و کامەران نابێت تائەو چوار مەسەلەیە لەخۆیدا جێ بەجێ نەکات، بەڵام گرنگـی دان بـە ڕۆشنبیری گشتی و بابەتی ڕۆژنامەگەری و وتـەی خـەڵك و ئـەوەی لەجیهانـدا ڕودەدات ئەمانە دوای جێ بە جێ کردنێ یەکخواپەرستی و جێ بەجێ کردنـی عەقیدە دەیان نۆڕێتێ بەمەبەستی ناسینەوەی خێر لەشەڕ و وریابوون لەوەی ڕوودەدات لەخراپـە وپڕوپاگەنـدە بـەڵام ئەمـە دوای ئـەوە دەبێـت کـە خـۆی بەئیمان بەخوای گەورە و ئیمان بەپێغەمبەری خوا (صـلی الله علیـه وسـلم) و خـۆ ڕازاندنـەوە بەزانسـتی شـەرعی، بـەڵام ئەگـەر بچـێتە نـاو بوارەکـانی ڕۆشنبیری و کاری ڕۆژنامەگەری و سیاسەتەوە بەبێ زانستی شەرعی بە ئایین وعەقیدەکـەی ئـەم جۆرەکەسـانە هـیچ سـودێك نـابینن بـەڵکو خـەریك دەبـن

بەشتێكی بێ كەڵكـەوە و ناتوانێـت ڕاسـتیی و باتـڵ لەیـەك جیابكاتـەوە، زۆر لەوانــەی نــەفامن بــەم عەقیدەیــە و بایــەخیان بــەم شــتە  لاوەكییانــە داوە گومڕابــوون و خەڵكیشــیان گــومڕا و سەرلێشــێواو كــردووە بــەهۆی  ئــەوەی چاوڕۆشنی و زانستی شەرعییان نییەتا بتوانن چاك و خراپ لێك جیابكەنـەوە و چۆن چارەسەری كێشەكان دەكرێت، بۆیە كەلێن و ناتەواوی و نەزانین لای زۆربەی خەڵك دروست دەبێـت چـونكە بـەبێ ئـەوەی شـارەزاییان هـەبێت بـە عەقیدەكەیان و چاوڕۆشن بن دەستییان وەرداوەتـە بوارەكـانی ڕۆشـنبیری و بوارەكـانی سیاسـەت،  بۆیـە دوا ئـەنجام ڕاسـتی بـەباتڵ و نـاڕەوا دەزانـن و باتڵیش بەهەق و ڕاستی.

وەڵامی شێخ (صالح بن فوزان الفوزان) وەرگێڕانی مامۆستا خلیل

**پ ٣١/هەندێك لەجوتیاران دەچنە لای کەسانێك بۆ ئەوەی نوشتەیان بۆ بنوسن لەکاغەزێکدا بۆپاراستنی زەراعەتەکانیان بە ڕاونان و دەرپەڕاندنی ئەو باڵندانەی بەزۆری لەسەر زەراعەتەکانیان دەنیشنەوەو زیانی پێدەگەیەنن، حوکمی ئەم جۆرە کردەوەیە چییە؟**

**وەڵام:**

بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم جۆرە کردەوەو کاغەز نوسینە لەشەرعدا حەڵاڵ نییە، چونکە ئەم کاغەزە ناتوانێت باڵندەو پەلەوەر لە زەراعەتەکان دوربخاتەوە نەلەواقیعدا دەتوانێت شتی وابکات وە نەلەشەرعدا شتی واهەیە، هەر هۆکارێك بەهەستیارەکان یان بەشەرع زانراو نەبوو ئەوا بەکارهێنانی حەرامەو دروست نییە ئەو کردەوەیە ئەنجام بدەن، ئەتوانن بەرەنگاری ئەو جۆرە باڵندەیە بکەن کە زیان بەکشتوکاڵەکەیان دەگەیەنێت بەهۆی چەندین دەستەواژەی زانراو بۆ ئەم مەبەستە کەخەڵکی خۆیان دەیزانن نەك ئەم شتە کە هیچ جۆرە کارتێکردنێکی بەهەست و بەشەرع زانراو نییە.

(وەڵامی شێخ محمد بن صالح العثيمين: (فتاوي العقيدة ٣١٦). وەرگێڕانی مامۆستا خلیل

**پ٣٢/ ئایا دروستە بۆمان لەو گۆشتە سەربڕاوانە بخۆین لەجەژنی موشریکەکاندا سەردەبڕێن وەك جەژنی لەدایك بوونی پێغەمبەر عیسی سەلامی خوای لە سەر بێت(کە لە سەری ساڵی زاینی دەکرێت) وەکو گاور و جولەکە بانگەشەی بۆ دەکەن ئەگەر کەسێ لە مەسیحیان هەستان بەسەربڕینی و لە بازاڕدا فرۆشرا ئایا دروستە لێی بکڕین؟**

**وەڵام/** ئەم سەربڕینانەی کەسەر دەبڕێن لەپێناو جەژنەکانی موشریکەکان یان لەشوێنی سەر بڕینی ئەوان دروست نییە موسڵمان بیان خوات هەروەها بیان کڕێت ، أبوداود لە (ثابت)ی کوڕی (الضحاك)ەوە دەیگێڕێتەوە ئەڵێ: (پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نەزری کرد لە (بوانة) وشترێك سەربېڕێت بەنەزر، جا هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی وت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

(هل كان فيها وثن من أوثان الجاهلية يعبد؟) قالوا: لا، قال: (هل كان فيها عيد من أعيادهم؟ قالوا: لا، قال رسول الله (ﷺ): (أوف بنذرك فإنه لاوفاء في معصية الله ولا فيما لا يملك ابن آدم) وسنده صحيح [1] واتە: ئایە ئەو جێگایە بتێکی تێدا نییە لە بتەکانی سەردەمی نەفامی؟ وتیان: نەخێر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا

[1] بڕوانە کتێبی: (فتاوى اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٤٣٨ ـ ٤٣٩).

ئاهەنگ وکۆبوونەوەکانی تێدا ناکەن؟ وتیان: نەخێر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو نەزرەی کردووتە بە ئەمەك بەو ئەنجامی بدە، بۆیە ئەمەم وت چونکە نابێت نەزرێك بکەیت کە تاوان بێت، یان نەتوانیت ئەنجامی بدەیت.

**پ٣٣/داوا لەبەڕێزتان دەکەین ئامۆژگاری ئاراستەی ئەو کەسانە بکەن کەسەردانی قەبران دەکەن ونەزریان بۆ ئەنجام ئەدەن و داوای کۆمەکی و یارمەتیان لێ دەخوازن ، چونکە بەدۆست و ئەولیبیای خوایان دەزانن؟**

**وەڵام:**

ئامۆژگاری ئێمە بۆ ئەو کەسانەو هاووێنەکانیان ئەوەیە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ هۆش و ژیریی خۆی, ئەم قەبرانەش کەوا دەزانرێت دۆستانی خوای تێدایە پێویستی بەم خاڵانەی لای خوارەوە هەیە :

یەکەم / پێویستی بەوە هەیە بزانین قەبرن یان نا ، چونکە جاری واهەیە شتێك لە شوێنێکدا دەکرێتە قەبرو دەڵێن ئەمە گۆڕی فلاّنە شەخسە وە زۆرجار ڕووی داوە.

لەکاتێکدا قەبریش نییە .

**دووەم** /ئەگـەر سـەلمێنرا بەڕاسـتی گـۆڕن ، ئـەوە پێویسـتە بـزانین ئـەو مردووانە دۆستی خوا بوون یـان نـا ، چـونکە ئێمـە نـازانین ئەوانە ئـەولییای خوان یان ئەولیای شەیتانن .

**سێیەم** / ئەگەر سـەلما ئەوانـە ئـەولییای خـوان ، ئـەنجا ئەوانـە سـەردانی ناکرێن بەمەبەستی تەبەڕوك ، یان بۆئەوەی هاوارو بانگیان لیّ بکرێت و داوای کۆمـەکی و پشـت بەسـتنیان لـیّ بخوازرێـت ، بـەڵکو تـەنها چـۆن سـەردانی هەرکەسـێکی تـر دەکرێـت بەمەبەسـتی پەنـد وەر گـرتن و دوعـا بـۆکردن، لەکاتێکدا ئەگەر سەردانیشیان لە فیتنەیەکی تێداهەبێت یان بترسین فیتنـەی زێدەڕەوی کردن لەئاستیاندا ئەو کاتە دروست نیە سەردانی بکـرێن بۆئـەوەی تووشی حەرام نەبین و ئەو دەرگایـەش نەکرێتـەوە، تـۆش ئـەی مـرۆڤ ژیریـی خۆت بکە بەحەکەم ئەم سیّ خاڵەی باسمان کردن ئەبیّ بێتەجیّ کەبریتین لە :

- ئەبیّ گۆڕ بن .
- سەلماندنی ئەوەی کە ئەو مردووە دۆستی خوایە .

●ســـەردانیی کردنیـــان بۆئـــەوەی دوعایـــان بـــۆ بکرێـــت ، چـــونکە ئەوانە(هەرکەسیٚ بن) زۆر پێویستییان بە دوعا بۆ کردن هەیە ، چونکە هیچ سوود و زیانێکیان بەدەست نییە ، وتمان سەردانیی کردنیان بەمەبەستی پاڕانەوە بۆیان دروستە ، بەمەرجێك ئەو سەردانییە حەرامی تێدا نەکرێت.

بەلاّم ئەو کەسەی سەردانییان بکات و نەزرو سەربڕینیان بۆ بکات یان داوای کۆمەکییان لیٚ بکات ، ئەوە شیرکی گەورەیەو خاوەنەکەی لەئاینی ئیسلام دەباتە دەرەوە و پێی کافر دەبێت و دوائەنجام لەئاگردا بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە .

وەلاّمی شێخ(محمد بن صالح العثیمین) بڕوانە (فتاوی العقیدة ) ل ٣٠.

وەرگێڕانی مامۆستا خلیل أحمد

## پ٣٤/ ئایا دەست نوێژ لە مێرد دەشکێت؟

**وەڵام :**

**دەست نوێژ بەدەست لەیەك كەوتن ناشكێت هەرچەندە مەسەلەیەكی خیلافیە لە نێوان زانایانـدا بـەڵام هـیچ حەدیسـێكمان نیـە كـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەستنوێژی لە خێزانەكانی شكاندبێ ، وەبە پێچەوانەوە فەرموودەمان هەیـە لەسەر ئەوەی كە شەونوێژی كردووە دەستی داوە لە پێی دایكە عائیشـە كـە لە پێشی خەوتبوو هەروەها دایكە عائیشە بۆمان دەگێرێتـەوە و دەفـەرموێ:**
(أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قبّل بعض نسائه ثم ذهب إلى الصلاة ولم يتوضأ)
رواه ابن ماجه وحسنه الشيخ الألباني رحمه الله . **واتـە : پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـە وسـلم ماچـی یـەكێ لـە خێزانـەكانی كـردووە پاشـان ڕۆشـتوە بـۆ نوێـژ و دەستنوێژی نەگرتووەتەوە .**

## پ٣٥/ئایا میز كردن بە پێوە جائیزە؟

**وەڵام :**

**یەكێك لە ئادابەكانی دەست بە ئاو گەیاندن ئەوەیە لە شوێنێكدا ئـەو كارەیـە ئەنجام بدەیت كە جلوبەرگ و گیانت پـیس نـەبێت ، هـەروەها بـە پێـوە میـز كردن ئەگەر ببێتە مایەی پیسبوونی ئەوانە ئەوا دروست نییە ، جـا میزكـردن**

به پێوه جوان نیه و پێچەوانەی ئاكارەكانه ، بەلاَم ئەگەر به پێوه بكرێت و لەش و جل و بەرگ پیس نەكات دروسته .

عائشه خوای لێ ڕازی بێ ئەفەرموێ : (من حدّثكم أن رسول الله صلى الله عليه وسلم بال قائماً فلا تصدَّقوه ما كان يبول إلا جالساً) رواه الخمسة إلا أبو داود

واته : هەر كەس پێی وتن پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم به پێوه میزی كردووه ئەوه باوەڕی پێ مەكەن ، چونكه پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم به دانیشتنەوه هەمیشه میزی دەكرد . ئەمه سوننەتی بەردەوامی پێغەمبەری خوایه صلى الله عليه وسلم بەلاَم دەبینی (حذيفة) خوای لێ ڕازی بێ ئەڵێ : (أن النبيّ صلى الله عليه وسلم انتهى إلى سباطة قومٍ فبال قائماً فتنحيتُ عنه فقال أُدنه فدنوت حتى قمت عند عقبيه فتوضأ ومسح على خفيه) رواه الجماعة .

واته : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕۆشته سەر سەرانگوێلكەیەك به پێوه میزی كرد منیش دوركەوتمەوه لێی فەرمووی نزيك بەرەوه نزيك بومەوه تا له پشتیەوه وەستام جا دەستنوێژی گرت و مەسحی كرد لەسەر خوفەكانی.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە جائیزە بەمەرجێك پارێزراو بێت لە پرش و پیس بوون .

بۆچوونی عائیشە لەسەر ئەوە بنیات نرابوو کە نەیبیستبوو بەلاًم بینیبوی ، لە زانستدا بەوەی (حذيفة) کار دەکرێت کە جائیزە .

**پ٣٦/ ئەگەر مەسح کردن لەسەر گۆرەوی تەنها لەوەرزی زستاندا بکرێت تاوانبار نابیت ئەگەر ئەو سوننەتە لە هاویندا جیٚ بە جیٚ نەکەیت؟**

**وەڵام :** مەسح کردن لەسەر گۆرەوی دروستە چ لە زستان یان لە هاویندا لە حەدیسی (المغیرة) ی کوڕی (شعبة) هاتووە : "أن رسول الله صلى الله عليه وسلم توضأ ومسح على الجوربين والنعلين" رواه أحمد والطحاوي وابن ماجه والترمذي وقال حديث حسن صحيح .

واتە : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستنوێژی هەڵگرتووە و مەسحی کردووە لەسەر گۆرەوییەکانی و نەعلەکانی .

جا هەرکەسێك وابزانێت (مەسح) لەسەر گۆرەوی تەنها بۆ وەرزی زستانە ئەوە هەڵە تێگەشتووە چونکە تایبەت نییە بە هیچیانەوە .

## پ٣٧/ نینۆك درێژكردن حەرامە؟

**وەڵام :**

نینۆك كردن و پاكڕاگرتنی نینۆكەكان یەكێكە لە دروشمـەكانی پێغەمبـەران و دروشمی موسڵمانان ، وەك لە فەرموودەی أبو هريره دا هـاتووە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویـەتی : "خمس من الفطرة : الاستحداد والختان وقص الشارب ونتف الإبط وتقليم الأظفار" رواه الجماعة .

واتە : پێنج شت لە فیترەت و ئیمانن :

١–خۆ قەدەغە كردنی ئەو ژنەی مێردەكەی دەمرێت تامـاوەی تـەواو بـوونی (عدّە) .

٢– خەتەنەكردن .

٣– سمێڵ كردن .

٤– هەڵكەندنی مووی بن باڵ .

٥– نینۆك كردن .

جـا درێـژ کردنــەوەی نینـۆك کـارێکی پـیس و حەرامــە و پێچــەوانەی ئــەو فیترەتەیە کە مرۆڤـی لەسـەر دروسـتکراوە و فـەرمانی پـێ کـراوە ، لـەوەش خراپتر ئێستا کەسانی خراپ و تاوانبار و عاشق وخنکـاو لـە نـاو دەریـای بـێ بنی شەیدا بوون و بێهۆشیدا ئەو کارە ئەنجام دەدەن تاوەکو بووەتە هـۆی ناسینەوەی ئـەو کەسـانەی ئـەوە ڕەفتاریانـە بۆیـە ، یـەکێك لـە نیشـانەکانی لەدەستدانی ژیری و هـۆش و فـام لای کەسـانی ئارەزووپەرسـت و عـەودالانی ڕەگەزی بەرامبەر بەبێ شەرعی ئەوەیە نینۆکت درێـژ بکـەیت ئـەگینا کەسـی پاك و بەئیمان و ئازاد کە خۆی نەخستبێتە داوی شەیدابوونەوە پێویستی بەو جۆرە کارانە نییە .

## پ٣٨/ ئایا دروستە لە حەمامدا لەدوای خۆشتن بەڕووتی پێش ئەوەی خۆداپۆشرێت دەستنوێژ بشۆردرێت؟

**وەڵام :** دەستنوێژ گرتن لە حەمامدا لـە پـێش خۆشـتن یـان دوای خۆشـتن بـە ڕووتی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە لەسەر قەدەغەکردنی کەوابوو دروسـتە إن شاء الله خۆ ئەگەر لەدەرەوەی حەمام دەستنوێژ هەڵبگیرێت باشترە .

**پ ٣٩/ سلاوتان لێبێت ماموستایان ....من ژنم بەلام زوربەی شەوان وەك پیاو شەیتانی دەبم واتە شەیتان پێم پیٚ دەکەنیٚ، ئایا ئەو کاتانە غوسلم لەسەرە؟ هیوادارم وەلامم بدەنەوە خوا خێرتان بنوسیٚ.**

**وەڵام :**

لەشگران بوون توشی پیاوان و ژنانیش دەبێت وە شتێکی ئاساییە مرۆڤ پێی تاوانبار نابێت بە مەرجێك مرۆڤ خۆی هەوڵی ئەوە نەدات وە هەوڵی ئەوە بدات دوای دەست نوێژ و زیکر کردن و بەکارهێنانی ئادابەکانی خەو بخوێنێت ، بەلام ئەگەر هەر تووشبوو ئەو کاتە تاوانبار نابێت ، دواتر بۆ مەسەلەی غوسلێ دەبێت تەماشا بکات ئایا (مني) دابەزیوە یان نا ئەگەر نا تەنها خەون بووە ئەوە غوسلی لەسەر نیە بەبەلگەی حەدیسی (أبو سعيد)ی الخدری کە ئەلێ : پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : (الماء من الماء)رواه مسلم . واتە : ئاوی غوسل واجبە بۆ ئاوی (منی) .

وە (أم سلمة) خوای لیٚ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە (أم سُليم) وتوویەتی ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوای گەورە لە بەیانکردنی حەقدا شەرم ناکات ئایا ئەگەر ئافرەت خەونی لەشگرانی بینی غوسڵی لەسەر

واجبـە؟ ئـەویش فـەرمووی (نعم إذا رأت الماء) رواه الشيخان وغیرهمـا . واتـە : بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی .

**پ٤٠/ مـن ٥٠ ڕۆژە منـداڵم بـووە بـە عەمـەلیات لـە ٣٥ ڕۆژەوە خوێنم نەما هەتا ٤٥ ڕۆژ بەڵام ئێستا لـە ٢٤ سـەعات جارێك ١بۆ ٢ قەترە خوێن هەیە بە لینیەکەوە دیتـە خـوارەوە ئایا هۆکـەی چیە ئایا دەتـوانم بـە ڕۆژوو بم و نوێـژ بکـەم؟ تکایـە زوو وەڵامـم بدەنـەوە زۆر سوپاستان دەکەم**

**وەڵام :**

خوێنی زەیسانی ئەو خوێنەیە کە لە پێشی ئافرەتەوە دەردەچێت بـە هـۆی منداڵبوونەوە ئەگەر تەنانەت منداڵ لە باریشی چوبێت ماوەی ئەم خوێنە هیچ سنورو کاتێکی دیاری کراوی نیە بۆ کەم ترینی ، جا ئەگەر منداڵی بـوو دوای کاتێکی کـەمیش ئەگـەر چـی چـەند چـرکەیەکیش بێـت و خـوێنی نـەما دوای منـداڵ بـوون یـان منـداڵی بـبێ و خـوێنی نـەبێت ئـەوا حـوکمی وەکـو بـاقی ئافرەتـانی پاکـە لـە خـوێن ، و دەبێـت نوێـژەکانی بکـات . زۆرتـرین کـاتیش عادەتی هەر ئافرەتێك خۆی دەیزانێت ئەگـەر دوای ئـەوە خـوێن هـەر هـەبوو

ئەوە خوێنی (**مستحاضة**) واتە (نەزیف)ە ، ئـەوە دەبـێ ڕۆژوو و نوێـژ بکـات ئەگەر (عادە)ی لێ تێکچوو ئەوە وەکو زۆربەی ئافرەتانی تر ڕەفتار دەکات.

**پ ٤١/ جیـاوازی لـە نێـوان ( مـني ) و ( مـذي ) چـی یـە کامـەیان غوسـلی دەوێـت وە لـە چ کاتێکـدا مـرۆڤ توشـیان دەبێـت واتـە دەیانبینێت.**

**وەڵام :**

منی بەو ئاوە دەوترێـت کـە تـۆوی تیایـە و خـوای گـەورە ئـادەمیزادی لـەوە دروست کردووە ، بەڵام (مەذی) ئاوێکی سپی لینجە لـە کـاتی بیرکردنـەوە لـە جووتبوون یان کاتی دەسـتبازی لەگـەڵ ئافرەتانـدا دادەبـەزێ زۆرجـار مـرۆڤ هەسـت بـە دەرچـوونی ناکـات لـە پیـاوان و ئافرەتانیشـدا هەیـە ، بـەڵام لای ئافرەتان زۆرترە جا مـەنی خـۆی پاکـە بـەڵام لەشـگران دەکـات ، و (مـەذی) پیسە بە ئیتیفاقی زانایان بـەڵام لەشـگران ناکـات واتـە غوسـڵ واجـب نابێـت بەڵام بۆ مەنی غوسڵ واجب دەبێت ، بەڵگەش لەسەر مەذی حەدیسـی (علـی) یـە کـە دەفـەرموێ : ((كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً ، وَكُنْتُ أَسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) لِمَكَـانِ ابْنَتِـهِ مِـنِّي ، فَـأَمَرْتُ الْـمِقْدَادَ بْـنَ الأَسْـوَدِ فَسَأَلَـهُ ، فَقَـالَ : يَغْسِـلُ ذَكَـرَهُ وَيَتَوَضَّأُ)) متفق عليه : [م (١/٢٤٧ / ٣٠٣) واللفظ له ، خ (١/٢٣٠ / ١٣٢) مُختصراً .

واتــە : (علي ﷺ) فەرموویــەتی : مــن پیــاوێکی (مــەذی) زۆر بــووم ، وە مــن شــەرمم دەکـرد لـەوەی کـە پرسـیار بکـەم لـە پێغەمبـەر (ﷺ) لەبـەر جـێی کچەکەی لە لام ، بۆیە فەرمانم کرد بە (المِقْدَاد بْنَ الأَسْوَد) پرسیارم بـۆ بکـات ئـەویش پرسـیاری لـــێ کـرد ، پێغەمبــەریش (ﷺ) فــەرمووی : (زەکــەری) دەشۆرێت و دەستنوێژ دەگرێت .

## پ٤٢/ ئەگەر ئافرەت لە (حیض) پاك بوویەوە پێش ئەوەی خـۆی بشوات دروستە جیماعی لەگەڵ بکرێت؟

**وەڵام** :بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لەم مەسەلەیەدا چەند بۆ چونێکی جیاواز هەیـە زۆربـەی زانایـان ئـەڵێن گـەر ئافرەت لە خوێنی حەیز پاك بوویەوە دەبێت (غوسل) بکـات ئـەنجا دروسـتە بۆ مێردەکەی جیماعی لەگەڵ بکات ئەم ئایەتەش دەکەنـە بەڵگـە کـە خـوای گــەورە دەفــەرموێ : {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ ...} (٢٢٢) سورة البقرة

واتــە ئــەی پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم پرســیارت لــێ دەکــەن دەربارەی عادەتی مانگانەی ئافرەت پێیان بڵێ : ئەوە ئـازار و زەرەرە کـەوا

بوو خۆتان بەدوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لـەو حاڵەتـەدا بـن و نزیکیـان مەکەون تا پاك دەبنەوە ، جـا کاتێـك پـاك و خـاوێن بوونـەوە خۆیـان شـۆرد بچنە لایان بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی پێ داوە .

دەڵێن (فَإِذَا تَطَهَّرْنَ) کاتێك پاکبوونەوە واتـە : بـە ئـاو ، ئـەم زانایانـەش وەك مالیـك و شـافعی و طـبري بـەلاّم (مجاهد) و (عكرمة) و (طاوس) ئـەڵێن تـەنها نەمانی خوێن بۆ مێرد دروسـتە بچـێتە لای و جیمـاعی لەگـەڵ بکـات ئەمـەش لەڕاستیەوە نزیکە . والله أعلم .

**پ٤٣/ دروستە لەکاتی سوڕی مانگانەدا خوێندنی قورئانی پیرۆز بێ دەست دان لە موصحەفی قورئانەکە واتە ئەوەی لەبەرتە لە قورئانی پیرۆز هەم بۆ مەبەستی پیرۆزی هەم ئەوەی کە لەیادت نەچێتەوە، ئەگەر ئەوە دروست نیە ئەی بەتەنها خوێندنی ئەو سورەت وئایەتانەی وەك ئەزکار بەکاری دەهێنیت بیخوێنی تاوانبار دەبیت؟**

**وەڵام :**

خوێندنی قورئان بـۆ ئـەو ئافرەتانـەی لـە سـوڕی مانگانـەدان دروسـتە هەرچەند جیاوازی تیایە لە نێوان زانایاندا بەلاّم ئەوەی پەسەندە ئەوەیە کـە

دروستە بەبەڵگەی فەرموودەی عائیشە کاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو (إفعلي ما يفعله الحاج غير أن لا تطوفي بالبيت...) واتە : حاجی لە بۆ کردنی حەج چی دەکات تۆش بیکە بەڵام تەواف مەکە بەدەوری ماڵی خوادا .هەمووەمان ئەوە دەزانین کەسی حاجی قورئان دەخوێنێ وزیکر دەکات و دەپاڕێتەوە .ئەوەش بزانە ئەو حەدیسانەی ئەوە دەگەیەنن کە ئافرەت لە حەیزدا ناتوانێ قورئان بخوێنێ هەموویان لاوازن بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە (تمام المنة في فقه السنة) .

**پ٤٤/ ئایا ڕاستە ئەگەر لەشتگران بێت نابێت موو لەلەشت بکەیتەوە تاخۆت ئەشۆی؟**

**وەڵام** :موو کردنەوە لە لەش هیچ پەیوەندی یەکی بەلەشگرانی یەوە نییە ، هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە ئەو مەسەلەیە قەدەغە بکات ئەسڵیش لەم جۆرە کارانەدا حەلاڵبوونە .

**پ٤٥/ ئەگەر دەست نوێژت هەبوو منداڵەکەت پاك بکەیتەوە ئەوە دەستنوێژت دەشکێ؟**

**وەڵام** :ئەسڵ لەم مەسەلەیەدا ئەو فەرموودەیەیە کە(بسره)ی کچی (صفوان) دەیگێڕێتەوەلە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی (من مس

ذكره فلا يُصلِّ حتى يتوضأ) رواه مالك والحميدى وأحمد وأصحاب السنن وقال الترمذي : هذا حديث حسن صحيح

**واتە : هەرکەس دەستی دا بە ئەندامی خۆیەوە با نوێژ نەکات تاوەکو دەستنوێژ نەگرێت .**

**زانایان وتویانە ئەم دەستپێوەدانە بۆ ئەندامی خۆی بێ یان هی یەکێکی تر هەمان حوکمی هەیە ، بەڵگەش ئەوەیە کە ابو هرەیرە خوای لێ ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە** صلى الله عليه وسلم **کە فەرموویەتی :** ( من افضى بيده إلى ذكر ليس دونه ستر فقد وجب عليه الوضوء) رواه أحمد وابن حبان والحاكم وصححه هو وابن عبد البر .

**واتە : هەر کەس دەستی دا بە عەورەتێکەوە بە ڕووتی ئەوا دەستنوێژی دەکەوێتە سەر .**

**چەندین ڕاو بۆ چوونی جیاواز لەم مەسەلەیەدا هەیە بۆ وەستان لەسەر درێژەی ئەو جیاوازیانە و یەکلاکردنەوەی ئەم بابەتە بڕوانە کتێبی** (تحفة الاحوذي) ج ١ **لاپەڕە ٢٨٢ ، یان** تمام المنة **لاپەڕە ١٠٣ .**

**پ٤٦/ئایا نوێژی ویتر چۆن دەکرێت وە کاتەکەی کەیە تکایە ڕوونکردنەوەیەکمان بدەنێ لەو بارەیەوە؟**

**وەڵام :**

نوێژی ویتر بەو نوێژانە دەگوترێت کە لەشەودا دەکرێت ، بەڵام بە تاك واتە یەك یان سێ یان پێنج تاوەکو یانزە ڕکات چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە یانزە ڕکاتی زیاتر نەکردووە لە ڕەمەزان و جگە لە ڕەمەزانیشدا وەك عائیشە باسیکردووە ، ئەم نوێژە تاکانە تەنها یەك (تحیات)یان تێدا دەخوێنرێت لە کۆتاییدا پێش سەلام ، کاتی ویتریش لە دوای نوێژی (عیشا) خەوتنانەوە دەست پێ دەکات تاوەکو نوێژی بەیانی .

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : (إن الله زادكم صلاةً وهي الوتر فصلوها فيما بين صلاة العشاء إلى الصلاة الفجر...) رواه أحمد بسند صحيح و صححه الألباني الصحيحة برقم ١٠٨ .

**پ٤٧/ ئایا نوێژی تەراویح بەس تایبەتە بە مانگی ڕەمەزانەوە؟یان دەتوانی لە جگە لە ڕەمەزانیش بیکەی؟**

**وەڵام :**

نوێژی تەراویح بریتی یە لە شەو نوێژ لە ڕەمەزاندا بێت یان جگە لەڕەمەزان ئەوەندە هەیە لەڕەمەزاندا ناونراوە تەراویح لەزاراوەی زانایاندا بەوەش ناونراوە کە لە دوای چوار ڕکات هەندێك پشوو وەردەگرن پاشان هەڵدەستن بۆ ئەوانی تر ، لە ڕاستیدا نازانم بەڵگە لەسەر ئەم پشووە هەیە یان نا ، بەڵام ئەصلْ ئەوەیە کە نەبێت مەگەر بەڵگە هەبێت ئەوکاتە ئێمەش باوەڕی پێ دەکەین ، بەهەرحالْ تەنها ناوە ، بەڵام خودی کارەکە یەك شتە ئەوەتە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە (قيام الليل) ناوی بردووە وە لە(أبو هريره) وە دەگێڕنەوە کە ئەڵێ : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : (من قام رمضان إيماناً واحتساباً غفر له ماتقدم من ذنبه) رواه الجماعة . واتە : هەرکەس لەشەوانی ڕەمەزاندا شەو نوێژبکات باوەڕی پێی هەبێت و بەتەمای پاداشتی هەبێت لای خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشووی دەبوررێت .

عائشە ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێ : (أن النبي صلى الله عليه وسلم ما كان يزيد في رمضان ولا في غيره على احدى عشرة ركعة) رواه الجماعة . واتە : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەڕەمەزان و غەیری ڕەمەزانیشدا لە یانزە ڕکات زیاتری نەکردووە . ئەمەش بەڵگەی ئەوەی تیادایە کە تەراویح تایبەت نی یە بەڕەمەزانەوە ، بەڵکو جگە لەڕەمەزانیشدا هەیە ، بەڵام زانایان

ناویان نەناوە تەراویح هەر لەسەر ئەسڵەکەی خۆی ناویان ناوە (قیام الليل) وەك خوای گەورە لە سورەتی المزمل دەفەرموێ : ﴿قُمْ اللَّيْلَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾

**پ٤٨/ من فەرمانبەرم دائیرەکەمان ئاودەستی نیە وە هیچ شوێنێك نیە دەست نوێژی تێدا بشۆین دەتوانین نوێژەکەمان تأخیر بکەین تا دەوام تەواو دەبێت؟ وە چەند جار بە بەڕێوەبەرەکەمان گوتووە بەڵام سوودی نەبووە .**

**وەڵام :**

نوێژەکان دەبێت لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا ئەنجام بدرێت مەگەر عوزرێك هەبێت خوای گەورە دەفەرموێت : {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ} (٢٣٨) سورة البقرة

جا ئەگەر هەر نەتوانی مۆڵەت وەربگرێت یان جێگای ئاو دەست و دەستنوێژتان بۆ دروست نەکرا ئەوە (جمع) یان بکە بەڵام هەوڵ بدە نەبێتە (**عادة**) وە هەوڵ بدەن فشار بخەنە سەر کەسانی پەیوەندیدار تاوەکو پێویستیەکانتان بۆ بکەن یان لە دەرەوە نوێژەکانتان بکەن .

**پ٤٩/ ئایا نوێژی قەزا هەیە وە ئەگەر هەیە بۆچی لەکاتی نەخۆشی و سەفەردا مەجالی نەکردنی نەدراوە .**

**وەڵام :**

قەزاکردنەوەی نوێژ تەنها بۆ خەوتن و لەبیر چوونە یان بۆ شتێکە هۆکارێکی شەرعی هەبێت نەك بەئەنقەست یان تەمبەڵی یان مەشغوڵ بوون

، بەڵێ ڕاستە لەکاتی نەخۆشی و سەفەردا هەر دەبێ بکرێت ئەمەش بەڵگەیە لەسەر قەزا نەکردنەوەی جگە لە خەوتن و لەبیرچوون .

**پ٥٠/ ئایا لە چ کاتێکدا دروستە نوێژ بە دانیشتنەوە بکرێت ؟**

**وەڵام :**

نوێژ کردن بە پێوە ڕاوەستان واجبە لەسەر کەسێك توانای هەبێت ئەگەر نەیتوانی بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەدەفەرموێ : (صلِّ قائماً فإن لم تستطع فقاعداً فان لم تستطع فعلى جنب) رواه البخاري وأبوداود وأحمد .

واتە : بەڕاوەستان نوێژ بکە ئەگەر نەتوانی بەدانیشتویی ئەگەر نەتوانی بە پاڵەوە .

**پ٥١/ ئەگەر لەکاتی خۆی دا نوێژم نەکرد چەند دەقەیەك تەئخیرم کرد ئەوە گوناهبار دەبم؟**

**وەڵام :**

نوێژکردن لەکاتی خۆیدا یەکێکە لە کردەوە چاکەکان لە شەریعەتی ئیسلامدا جا لە فیقهی ئیسلامدا بۆ هەموو نوێژێکی فەرز کات دانراوە ،ئەوەبوو جبریل سەلامی خوای لەسەر بێت لە دوو ڕۆژدا کاتی هەموو نوێژەکانی بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دیاری کرد لە ڕۆژی یەکەمدا سەرەتای کاتی نوێژەکانی پیٚ وت وە لە ڕۆژی دووەم دا کۆتایی نوێژەکانی پیٚ وت وە پێی فەرموو : (ما بين هذين الوقتين وقت) واتە : لەنێوان سەرەتا و کۆتاییدا کاتی نوێژەکانە .

جا پێویستە لەو کاتەی بۆمان دیاری کراوە نوێژەکانمان ئەنجام بدەین وە لە کۆتایی کاتەکان دوای نەخەین ئەگەر لەمەیان دوا بخرێت تاوانبار دەبین و تاوانێکی گەورەشە خوا پەنامان بدات

**پ٥٢/ ئایا تەکبیرەی چوونە رکوع لە کوێوە دەست پیٚ دەکات مەبەستم ئەوەیە لاشەی نوێژخوێن لەکوێدا بێت هەروەها هەستانەوە لە رکوع و چون بۆ سەجدە و هەستانەوە بۆ جلسەی ئیستراحە و**

**دووباره چوونەوه بۆ سەجده و هەستانەوه بۆ سەرجەم رکاتـەکانی تـر ..**

**وەڵام :**

تـەکبیرەی چـوونه ڕکـوع و هەسـتانەوه و هـەموو ئەوانـەی لـه پرسـیارەکەدا هاتوون له کاتێکدا دەگوترێت پێش ئەوەی بچیت بۆ ئـەو کـرداره زیکرەکـەی بۆ دەکەیت ، بۆ نموونـه (إذا ركع) واتـه (إذا أراد الركوع) واتـه : کـاتیٚ ویسـتی بچێت بۆ رکوع له کاتێکدا ئـەم هێشـتا بـه پێـوه وەسـتاوه هـەروەها زیکـر و شوێنەکانی تری نوێژ .

**پ٥٣/کاتێـك ئیمـام سـورەتی فاتیحـه دەخوێنێـت دوای ئـەوه سورەتێکی تر دەخوێنێت ئەوانەی له دوای ئیمام نوێژ دەکـەن دەبێـت سورەتی فاتیحه بخوێنن؟**

**وەڵام :**

خوێنـدنی قورئـان بـۆ ئـەو کەسـانەی لـه پشـتی ئیمامـەوه نوێـژ دەکـەن لـه نوێژێکدا که ئیمام دەنگی بەرز دەکاتـەوه لـه خوێندنـەوەی قورئانـدا زانایـان وەك شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لیٚ بـیٚ ئـەڵیٚ پێویسـت ناکـات بخوێنرێـت وەك لــه کتێبــی (صفة الصلاة النبي) دا ئەمــەی بــەجوانی یەکلاکردۆتــەوه ،

**بەڵگەشی ئەم فەرموودەیەیە کە ئیمامی مالك و الحمیدی و البخاری لە** (جزء)**ە کەیدا و أبوداود و أحمد ڕیوایەتیان کردووە** ( انصرف من صلاة جهر فيها بالقراءة (وفي رواية انها صلاة الصبح) فقال : هل قرأ معي منكم أحد آنفاً فقال رجل : نعم ، أنا يارسول الله فقال إني أقول مالي أنازع) قال أبو هريرة فانتهى الناس عن القراءة مع رسول الله صلى الله عليه وسلم فيما جهر فيه رسول الله صلى الله عليه وسلم بالقراءة حين سمعوا ذلك من رسول الله صلى الله عليه وسلم (وقرؤوا في نفسهم سرّا قيما لا يجهر فيه الإمام) .

**واتە : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژێك تەواو بوو کە بەدەنگی بەرز قورئانی تێدا دەخوێند (لە ڕیوایەتێکدا : نوێژی بەیانی بوو) فەرمووی : ئایا کەس لە نوێژەکەدا لەگەڵمدا خوێندی ، پیاوێك گووتی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەویش فەرمووی : وتم بۆیە یەکێك دەنگی تێکەڵ دەبێت لەگەڵ دەنگی من . أبو هريرە ئەڵێ : لەدوای ئەمەوە ئیتر خەڵکی لە نوێژێکدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەنگی تیا بەرز بوایە ئەوان قورئانیان نەدەخوێند.(وە لەدوای ئیمام دەنگی بەرز نەدەکرد بە دەنگی نزم دەیانخوێند) .**

وە زانایانی تر وەك شێخ ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێ وتوویەتی : دەبێ سورەتی فاتیحە لە هەردوو حاڵەتی دەنگ بەرزکردنەوە و نزمکردنەوە بخوێنرێت بەڵگەش ئەم فەرموودەیەیە کە دەفەرموێ : (لا صلاة لمن لم يقرأ فيها بفاتحة الكتاب) رواه البخاري ومسلم .

جا هەرکەس هەر یەك لەمانە بکات دوای دیراسە کردنی بەڵگەکان إن شاء الله هیچی لەسەر نییە ، چونکە مەسەلەیەکە خیلافی تیادایە بە بەڵگە .

**پ٥٤/ ئایا دروستە نوێژ بۆ مردوو بکرێت لەکاتێکدا کە بزانی خۆت هیچ نوێژ قەرزار نیت مەبەستم لە نوێژ بۆ مردوو ئەوەیە کە ئەو نوێژانەی بۆ بکەیت کە لە ژیانی دا فەوتاندبێتی .**

**وەڵام :**

نوێژ پەرستشێکی جەستەییە ومرۆڤ لە ژیانیدا فەرمانی پێ کراوە ئەنجامی بدات بەهەر شێوازێك بێت وە فەوتاندنی و نەکردنی نییە خوای گەورە دەفەرموێ : {إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا} سورة النساء(١٠٣)

ئەمە ئەگەر کەسێك خۆی لە ژیانیدا بەئەنقەست نوێژ بفەوتێنێ و نەیکات قەزا ناکرێتەوە وە ئەگەر تاوانی کردو چەند نوێژێکی فەوتاند ئەوە قەزا ناکرێتەوە

و نابێت قەزایان بکاتەوە بەڵام کردنی نوێژی سوننەت ئەوەی بۆ پڕدەکەنەوە بەڵام کەسێك بمرێت ئەوە بە هیچ شێوەیەك نوێژی لە جیاتی ناکرێتەوە.

**پ٥٥/ بەڕێزان من ناتوانم بۆ شەو نوێژ لەنیوەی شەودا هەستم ئایا دەکرێت بەر لەوەی بخەوم شەونوێژ بکەم ؟ وە ئایا دەتوانیت لە ١١ ڕکات کەمتر بکەیت ؟**

**وەڵام :**

برای بەڕێزم ڕەحمەتی خوات لێ بێت : شەو نوێژ کاتەکەی لە دوای نوێژی خەوتنانەوە (عشا )دەست پێ دەکات تاوەکو نوێژی بەیانی هەڵبەتە باشترین کات سێ یەکی کۆتاییە لەوکاتەی بۆ شەو نوێژ دانراوە ، بەڵام دەتوانیت لە هەر سێ سێیەکدا ئەنجامیان بدەیت واتە : دەتوانیت ڕاستەوخوا لە دوای نوێژی خەوتنانەوە بیانکەیت یان لە نیوەی شەودا سەعاتی ١١ یان ١٢ یان سێ یەکی کۆتاییدا دەتوانیت تەنها یەك ڕکاتیش بکەیت کە پێی دەگوترێت (وتر) واتە لەیەك ڕکاتەوە تا یانزە ڕکات وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەوە زیاتری نەکردووە وە باشترین ڕێباز ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم .

**پ٥٦/ ئایا نوێژکردن دروستە بە دانیشتنەوە؟**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

یەکێك لە فەرزو ڕوکنەکانی نوێژ ئەوەیە کە بە پێوە بکرێت بۆ کەسێك ساغ بێت جا هەرکەس نەخۆش بوو دەتوانێت بە دانیشتنەوە بیکات ئەمە بۆ نوێژی فەرز بەلاّم بۆ نوێژی سوننەت دەتوانرێ بە دانیشتنەوە بکرێت .

**پ٥٧/ السلام علیکم خوا جەزاتان بداتەوە بۆ ئەم سایتە چاکە کەداتاننناوە پرسیاری من دەربارەی نوێژی سوننەتە ئایا لە دوای نوێژەکان دەکرێت؟ وە شەونوێژ چەند ڕکاتە؟ زۆرسوپاستان دەکەم ئەگەر وەڵامم بدەنەوە**

**وەڵام :** وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته

خوای گەورە پاداشتی خەیری تۆش بداتەوە بۆ تەماشاکردن و ماندووبوونت لە بەسەرکردنەوەی سایتەکەمان ، ئەنجا نوێژی سوننەت لە پێش و پاش نوێژە فەرزەکان دەکرێت لە پاش و پێش نوێژی نیوەڕۆ ، لە پاش و لە پێش نوێژی عەسر (هەرچەندە زانایان جیاوازیان هەیە بۆ پاش عەسر) لە پێش و

لە پاش نوێژی مەغریب ، لە پێش و لە پاش نوێژی عیشا ،بەڵام نوێژی بەیانی تەنها لە پێشی نوێژی سوننەت هەیە لە پاشییەوە سوننەت نییە ، شەو نوێژ تەنها یانزە ڕکاتە بەدەقی فەرموودەیەك كە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) ڕیوایەتی كردووە كە دەفەرموێ : (ماكان رسول الله صلى الله عليه وسلم يزيد في رمضان ولا في غيره عن إحدى عشرة ركعة). رواه البخارى ومسلم

واتە : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەرگیز لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزاندا لە یانزە ركات زیاتری نەكردووە .

**پ٥٨/ئایا دروستە نوێژی سوننەت دوای نوێژی عەسر بكەی ئایا بیكەی گوناهبار نابیت؟**

**وەڵام :** نوێژ كردن لە دوای عەسر مەسەلەیەكی خیلافیە ، بەڵام ڕای پەسەند **إن شاء الله** ئەوەیە كە دروستە بەڵكو سوننەتە بكرێت ، ئەوانەی ئەڵێن ناكرێت ئەم فەرموودەیە دەكەنە بەڵگە كە دەفەرموێ : (لا تصلوا بعد صلاة الصبح حتى تطلع الشمس ولا تصلوا بعد صلاة العصر حتى تغرب الشمس) ئەمە و چەندین حەدیس لە م مانایە ، بەڵام ئەو زانایانە ڕای دووەمیان بردووەو دەڵێن ئەم حەدیسە (موتڵەقە) و حەدیسی (مقيّد) مان هەیە وەك حەدیسی ( نهى عن الصلاة بعد العصر إلا والشمس مرتفعة) بڕوانە السلسلة الصحيحة

لەنوسینی شێخی ئەلبانی ، کە ئەم حەدیسە ئەوە دەگەیەنێ نەهی کراوە لە نوێژ لە دوای عەسر ئەو کاتە نەبێ کە خۆر بەرزە واتە ئەو کاتەی خۆر زەرد دەبێتەوە لە ئاوابووندایە ، هەروەها فەرموودەی ترمان هەیە لە دایکان (أم سلمە) و (دایکە عائیشە) خوایان لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوو ڕکاتی دوای نیوەڕۆ و دوای نوێژی عەسر کردووە یان حەدیسی تر کە (عاصم)ی کوڕی (ضمرة) ئەڵێ : (كنا مع علي رضي الله عنه في سفر فصلى بنا العصر ركعتين ثم دخل فسطاطه وأنا أنظر فصلى ركعتين) یان حەدیسی بلال (لم ينه عن الصلاة إلا عند غروب الشمس) بۆ زیاتر تێگەشتن بڕوانە السلسلة الصحيحة للشيخ الألباني رحمه الله بەرگی یەکەم لاپەڕە ٣٤١–٣٤٥ . کەوا بوو دروستە یان سوننەتە نەك تاوانبار ببیت .

**پ٥٩/ بەیانیان هەرچیەك دەکەم ناتوانم هەموکات لەکاتی خۆیدا نوێژ بکەم هەتا جارێك وادەیکەم دەجار دوادەکەوێت سەرەڕای ئەوەی لەماڵەوە چەندین جار بانگم دەکەن ، بەلاّم من هەتا نزیکی ئەو کاتەی خۆرهەڵدێت هەرلەناوجێگاکە دام وبەهیچ جۆرێك خەو بەرم نادات تا هەستم نوێژەکەم بکەم.**

**وەڵام :**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**خوای گەورە دەفەرموێ :** {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ} سورة البقرة (٢٣٨)

**وە دەفەرموێ :** { إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا} النساء (١٠٣)

**وە دەفەرموێ :** {فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَن صَلاَتِهِمْ سَاهُونَ } سورة الماعون(٤-٥)

**کەوا بوو نوێژەکان کاتی دیاری کراویان هەیە و نەکردن و دواخستنی لەکاتی دیاری کراودا تاوانێکی گەورەیە و هەڕەشەی توندی لەسەر هاتووە ، بگرە هەندێ لە زانایان بە کوفریان داناوە دەبینی خوای گەورە دەفەرموێ :** {فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلاَةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا } سورة مريم (٥٩) .

**واتە : لە دوای (پێغەمبەران و ئەوانەش لە کەشتیەکەدا لەگەڵ نوحدا سوارمان کردن لەنەوەی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەی کە هیدایەتمان داون و هەڵمان بژاردوون کە سانێك لەنەوەکانیان بوونە جێنشین کە نوێژەکانیان بەزایە داو شوێنی ئارەزووەکانی نەفسیان کەوتن ئەوانە تووشی گومڕایی و سەرگەردانی و سزا دەبن لە دونیا و قیامەتدا) .**

کەوابوو دەبێ ئاگامان لە نوێژەکانمان بێ و بەتایبەت نوێژی بەیانیان لەم سەردەمەدا زۆر بەزایە دراوە هۆکارەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ تاوان ومەشغول

بـوون لـە دونیـاوە ، پاشـان خـواردنی زۆر و خواردنـەوەو درەنـگ خـەوتن و دانیشتن بەلای تەلـەفزیۆن و سـەتەلایت ، و بـۆ کەسـێك کـە بیـەوێت ئـەوەی بەسەر نەیەت پێویستە تەوبە بکات و ترسی خوای هەبێت پاشان هۆکارەکان بۆ زوو هەستان بگرێتە بەر وەك زوو خەوتن و کەم خواردن و کـات نەکوشـتن بە تەلەفزیۆن و ئامێرەکانەوە وە ڕاسپاردنی کەسێك یان ئامێرێك کە خەبەری بکاتەوە . خوای گەورە یارمەتی هەموو لایەکمان بدات.

**٦٠/ ئایا نوێژ نەکردن لەبەر تەمەڵی یان هەر نـەکردنی حـوکمی چی یە؟**

**وەڵام :**

پلەو پایەی نوێژ لە ئیسلامدا زۆر بەرز و گرنگە وەیەکێکە لە پایـەکانی ئیسلام بەڵکو لە دوای شەیەتومان یەکەم پایەیە ، جا ئاینی پیرۆزی ئیـسلام لە قورئـان و سـوننەتدا گرنگییـەکی زۆری داوە بـە نوێـژ وەك خـوای گـەورە دەفەرموێ: {قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ * الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاَتِهِمْ خَاشِعُونَ} (١-٢) سورة المؤمنون

واتــە :بەڕاســتی ئــەو بڕوادارانــە ســەركەوتوو ســەرفراز بــوون ئەوانــەی لــە نوێژەكانیانـدا ملكـەچ و دڵ ئـارام و دڵ دامـەزراون و دڵیـان لای خوایـە . لـە كۆتـایی ئـەو چـەند ئایەتـەدا دەفـەرموێ : {أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ * الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ} (١٠-١١) سورة المؤمنون .

واتە : ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فـیردەوس كەبـەرزترین و بـەنرخترین بەهەشتە و بۆ هەمیشە ژیانی نەبڕاوەی تیادا دەبەنە سەر .

بەلاَم ئەوانەی كە نوێژ ناكەن خوای گەورە دەفەرموێ : {مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ * قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ} (٤٢-٤٣) سورة المدثر .

واتە : ئەوە چی بوو ئێوەی ڕاپێچی دۆزەخ كرد؟ بەكەساسییەوە دەڵێن ئێمە لە نوێژخوێنان نەبووین .

هەروەها دەفەرموێ: {فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَن صَلاَتِهِمْ سَاهُونَ } (٤-٥) سورة الماعون .

واتە : جا هاوار و تیاچوون یان دۆڵێكی ئاگرین لە دۆزەخ بۆ نوێژكەرانێك گوێ نادەن بـە نوێـژەكانیان و لـەكاتی خۆیـدا نایكـەن و دوای دەخـەن وە ئەگـەر كردیان هیچ كاركردی لەسەر نیە لەسەریان و دڵی نادەنێ و لێی غافڵن .

وە چەندین هەڕەشەی لەمانەش توند تر هاتووە .

جا نەکردنی نوێژ ئەگەر کەسێك باوەڕی پێی نەبێ ئەوا کافر دەبێ بە (اتفاق) لەنێوان زانایاندا ، بەلاّم ئەگەر نەکردنەکەی تەنها تەمبەڵی بوو ئەو کاتە زانایانی ئەهلی سوننەت دوو ڕای جیاوازیان هەیە :

یەکەمیان ئەوەیە کە ئیمامی ئەحمەد ئەڵێ: کافر دەبێ ، وە ئەمەش بە لای منەوە پەسەندە .

دووەمیان ئەوەیە کەئیمامی شافیعی ئەڵێ : فاسق دەبێ بەلاّم لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە هەرکام لەم دووانە نوێژنەکردنی شتێکی مەترسیی دارە وەنیشانەی موسڵمانێتی نوێژە وە هیچ شتێك وەك نوێژ دووبارە نابێتەوە بۆیە پێویستە ئینسان ترسی خوای هەبێت و کەمتەرخەمی نەکات .

## پ٦١/ ئایا نوێژی تەراویح چۆنە وە چەند رکاتە؟

**وەڵام :**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**نوێژی تەراویح بریتی یە لە شەونوێژ لەمانگی ڕەمەزاندا کە بریتییە لە ١١ رکات کە لەدوای نوێژی خەوتنانەوە (عشاء) دەست پێ دەکات تا کاتی بانگی بەیانی ، نوێژی تەراویح دوو ڕکاتە لە کۆتاییدا یەك ڕکات بە تەنها**

دەکرێت یان ٨ ڕکات دوو دوو دەکرێت سێ ڕکاتیش نوێژی (وتر) لە کۆتاییدا دەکرێت .

حوکمی ئەم نوێژە سوننەتە لە ڕەمەزاندا پێی دەگوترێ تەراویح وە جگە لە ڕەمەزاندا (قیام اللیل) یان (الوتر) .

## پ٦٢/ نوێژی (الإستخارة) واتای چیە و شێوازەکەی چۆنە؟

**وەڵام :**

واتە ئەو نوێژەی کەداوا لە خوا دەکەیت کام شتەی چاکە ئەوەت بۆ بکات .

شێوازی نوێژەکە ئەوەیە دوو ڕکات نوێژ دەکەیت وەکو چۆن دوو ڕکات سوننەت دەکەیت بە نییەتی نوێژی (**الإستخارة**) لە دڵەوە . پاشان دوای نوێژەکە دوعای الاستخارە دەکەیت کە ئەمە دەقەکەیەتی : ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَمُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ – **ناوی پێویستی یەکەی دەهێنی**– خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي –**یان فەرمووی**– (عَاجِله وَآجِلِهِ) فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي –**یان فەرمووی**– (عَاجِله وَآجِلِهِ) فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي﴾

**واتە : خوایە من بە زانستی خـۆت داوای خێـرو چـاکەت لـێ دەکـەم وداوای توانات لێ دەکەم بە توانای خۆت وە لە فـەزڵی گـەورەت داوات لـێ دەکـەم بەڕاستی تۆ دەتوانی ومن ناتوانم و تۆ زانای و من نازانم و تـۆ زانـای نهـێنی غەیبەکانی ، خوایە ئەگەر ئەم مەسەلەیە چاکە و خێری تیایە بۆ دین و ژیان و بژێوی و کۆتایی تەمەنم یان ئێستا و کۆتایم ئەوا خوایە بەنسیبم بکەیت و ئاسانی بکەیت لەسەرم و بەرەکەتی تێ بخە بۆم ، و ئەگەر ئەم کارە خراپە بـۆ دیـن و بـژێوی وکۆتـایی تەمـەنم یـان ئێسـتا و کۆتـایم ئـەوا خوایـە لـێم دووربخەرەوە و منیش لەو دوور بخەرەوە و خەیرو چاکەم بە نسیب بکە لـە هەر شوێنێك و پاشان دەروونم ڕازی بکە پێی .**

**پ٦٣/ السلام علیکم....من پرسیارێکم هەیە من زۆر حەز دەکەم نوێژ بکەم و سەرم داپۆشم ، هەم و جار دەڵێم ئەمڕۆ سبەینێ ، بەڵام بۆچی لە بیری دەکەم ؟ ئایا چی بکـەم تـا لـەبیری نەکـەم ، چونکە زۆر حەز دەکەم نوێژ بکەم و سەرم داپۆشم.سوپاس.**

**وەڵام :** وعلیکم السلام ورحمه الله وبرکاته

نوێژکردن و پابەند بوون بە ئیسلامی پیرۆزەوە گەورەترین خەڵاتی خوایە وە گەورەترین خۆشبەختی مرۆڤە ، چونکە دڵ بە هیچ شتێك ئـارام نابێـت تـەنها

بە یادی خودا نەبێت وەك دەفەرموێ : ﴿ أَلاَ بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (٢٨) سورة الرعد

تەنانەت هەندێ لەزانایان وتویانە ئەگەر پادشایانی دونیا بەو خۆشبەختیەی ئێمە بزانن کە لە دڵەکانماندایە ئەوە بە زۆری شمشێر لیمان دەستێنن ، ئەنجا بالآپۆشی بۆ ئافرەتان نیشانەی پاکی و بەهاو چاکی ئەو ئافرەتەیە چونکە کەسێك لەشی خۆی بخاتە بەردەستی هەمووکەس واتە بێ بەهایە و زۆری لا مەبەست نییە جا بەڕاستی حیکمەتی بالآپۆشی زۆرن ، گەورەترین حیکمەت ڕێزلێنانە بۆ خودی ئافرەتان کە نەبنە کالآیەکی بێ نرخ بە دەستی هەلپەرستەکانەوە تەنها ببنە دروستکراوێك بۆ ئارەزوو شکاندنی ئەو چلێسانە ، بەڵکو ئافرەتیش مرۆڤێکە خاوەنی خودی خۆیەتی و سنوری تایبەتی خۆی هەیە و دایکی نەوەکانە و پێویستی بە هەبوونی کەسایەتی پارێزراوی خۆی هەیە نەك ببێتە پاروە چەورەی هەموو کەس .

جا ئەگەر بە بیروباوەڕەوە لە ئاینی ئیسلام تێگەشتین و زانیمان خوای گەورە بۆ ئێمەی داناوە و ئەویش باشتر دەزانێت ئەوە بە تەواوی و دەستبەجێ تەسلیم دەبین و دوو دڵی لە فەرمانەکانیدا ناکەین چونکە بەرژەوەندیمان لەوەدایە .

**پ٦٤/ کەسێك دەچێتە مزگەوتەوە بۆ نوێژی خەوتنان** (العشاء) **پاشان بیری دەکەوێتەوە کە نوێژی ئێوارە** (مەغریب)**ی نەکردوە چی بکات؟**

**وەڵام :**

ئەگەر چوویتە مزگەوت و قامەت کرا بوو بۆ نوێژی خەوتنان پاشان بیرت کەوتەوە کە نوێژی ئێوارەت نەکردوە لەم کاتەدا دەچێتە ناو ڕیزی جەماعەتەوە بە نیەتی نوێژی ئیوارە (المغرب) هەتا ئەو کاتەی کە ئیمام هەستایەوە بۆ ڕکاتی چوارەم ئەو کاتە تۆ دادەنیشیت و چاوەڕوانی دەکەیت تا سەلام دەداتەوە و تۆش لە گەڵ ئەو سەلام دەدەیتەوە، وە بۆتیش هەیە سەلام بدەیتەوە بەبێ ئیمام، پاشان نوێژی خەوتنان لە گەڵ ئیمامدا دادەبەستیت, جیاوازی نیەتی تۆ و ئیمام هیچ زیانێکی بۆ نوێژەکەت نی یە لە ڕای پەسەند کراوی زانایاندا, یان ئەگەر خۆت بە تەنها نوێژی ئیوارەت کردوو پاشان لە گەڵ ئەواندا نوێژی خەوتنان هەرچەند فریا کەوتی ئەوا دروستە[١].

---

[١] فتاوى أركان الإسلام للشيخ ابن العثيمين ص: (٢٩٠- ٢٩٢) .**وەرگێڕ : م.خليل**

**پ٦٥/ ئەگەر ڕێبوارێك (مسافر) گەیشتە دوو ڕکاتی کۆتای لە نوێژی چواریدا لەگەڵ ئیمامی نیشتەجێ ئایا لەگەڵ ئەودا سەلام بداتەوە بەنیەتی کورت کردنەوە؟**

**وەڵام :**

**دروست نی یە بۆ ڕێبوار ئەگەر لە پشت ئیمامی نیشتەجێ وە نوێژی کرد نوێژ کورت بکاتەوە بە بەڵگەی گشتی وتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ):** ((ما أدركتم فصلوا وما فاتكم فأتموا))[٢].

**کەوابوو ئەگەر ڕیبوار فریای دوو ڕکاتی کۆتای کەوت پێویستە دوو ڕکاتی تر بکات دوای سەلام دانەوەی ئیمام، دروستیش نی یە تەنها بە دوو ڕکات سەلام بداتەوە**[٣].

---

[٢] صحيح البخاري رقم: (٦٣٦) وصحيح مسلم رقم: (١٥١).

[٣] فتاوى أركان الإسلام للشيخ ابن العثيمين ص: (٣٠٧). **وەرگێر : م.خليل**

عن قال موسى بن سلمة قال: "كنا مع ابن عباس(رضي الله عنه) بمكة فقلت: إنا إذا كنا معكم صلينا أربعا وإذا رجعنا إلى رحالنا صلينا ركعتين؟ قال: تلك سنة أبي القاسم(ﷺ)" أخرجه أحمد بسند صحيح ورواه مسلم وأبو عوانة وغيرهما مختصرا وهو مخرج في الإرواء رقم: (٥٧١) انظر: "تمام المنة في التعليق على فقه السنة" ص: (٣١٨) .

**پ٦٦ / هۆکارەکانی سوجدەی سەهوو چین؟**

**وەڵام:**

بەکورتی سوجدەی سەهوو سێ هۆکاری هەیە:

١ ـ زیادەکردن .

٢ ـ کەمکردن .

٣ ـ دوو دڵی و گومان .

١ ـ **زیادەکردن:** نموونەی کەسێك شتێك لەمانە زیاد کات (کورنوش و سوجدە و وەستان — دانیشتن) .

٢ ـ **کەمکردن**: نموونەی کەسێك لەمانە کەمکاتەوە (ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی نوێژ یان واجبێك لەواجبەکانی نوێژ) .

٣ ـ **دوودڵی و گومان**: نموونەی کەسێك دوو دڵ بێت چەند ڕکاتی کردووە سێ یان چوار، زیادکردن لە نوێژدا گەر هاتوو نوێژکەر کورنوشێك یان سوجدەیەك یان وەستانێك یان دانیشتنێك بە ئەنقەست لە نوێژدا زیادبکات

نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە ، چونکە بەو زیاد کردنەی نوێژەکەی کردوە بە پێچەوانەی ئەوەی کە خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمانیان پێ کردووە .

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت: ((من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد))[٤].

بەڵام ئەگەر هاتوو بە لەبیر چونەوە زیادی کرد ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێت بەڵام دەبێت سوجدەی سەهو ببات دوای سەلام دانەوە ، بەڵگەش فەرموودەی (أبو هريرة)یە(رضي الله عنه)کە دەفەرموێت: "کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)لە یەکێك لە نوێژەکانی نیوەڕۆ یان عەسردا لە دوای دوو ڕکات سەلامی دایەوە، ئەنجا بیریان خستەوە و پێیان وت ، ئەویش ئەوەی مابوو کردی پاشان سەلامی دایەوە, پاشان دوای سەلام دانەوە دوو سوجدەی برد" [٥].

هەروەها فەرموودەی (أبن مسعود(رضي الله عنه)کە دەفەرموێت: "پێغەمبەر(ﷺ)نوێژی نیوەڕۆی بە پێنج ڕکات بۆ کردین، دوای لێبونەوەی پێیان وت: ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ ئەویش فەرمووی: ئەو پرسیارە بۆ دەکەن؟

---

[٤] صحيح مسلم رقم: (١٧١٨) .

[٥]صحيح البخاري رقم: (١٢٢٦)وصحيح مسلم رقم: (٥٧٣).

ووتیان: تۆ پێنج ڕکاتت بۆ کردین، ئەویش هـەردووپێی جـووت کـردو و ڕووی کردە ڕووگە و دوو سوجدەی برد"[٦].

بەڵام (کەم کردن) ئەگەر نوێژکەر ڕوکنێـك لـە ڕوکـەکانی نوێـژی کـەم کـرد ئەوا لەم حاڵەتانە بەدەر نی یە: یان پێش ئەوەی بگاتـەوە هـەمان شـوێن لـە ڕکاتی دوای ئەوە لـەم کاتـەدا پێویسـتە بگەڕێتـەوەو ئـەو ڕوکنـە بکاتـەوە و لەوەوە دەست پێ دەکات .

یان بیری ناکەوێت تا دەگاتـەوە هـەمان جێگـا لـە ڕکـاتی دوای ئـەوە لـەم کاتـەدا ئـەم ڕکاتـە جێگـای ئـەوی تـر کـە ڕوکنەکـەی نوقسـان بـوو حسـاب دەکرێت.

لەم دوو حاڵەتەدا دوای سەلام دانەوە سـوجدە ئـەبرێت، نموونـەی پیاوێـك دوای سوجدەی یەکەم لەڕکاتی یەکەم هەسـتێ بـۆ ڕکـاتی دوەم و سـوجدەی دووەمی لە بیربچێت کاتێك دەستی کرد بە خوێندنی قورئـان بـیری کەوتـەوە کـە سـوجدەی نـەبردووە و لـە نێـوان هـەردوو سـوجدەکە دانەنیشـتەوە لـەم کاتـەدا ئـەبێت دەسـت بـەجێ بگەڕێتـەوە و دانیشـێت لـە نێـوان هــەردوو

---

[٦]صحيح البخاري رقم: (١٢٢٧)وصحيح مسلم رقم: (٩٢٧).

سوجدەکەدا پاشان ئەبێت سوجدەی دووەم ببات و دوایی هەستێت بۆ ڕکاتەکانی تر دوای سەلام دانەوە سوجدەی سەهو ببات .

نموونەی ئەو کەسەی کە بیری نەکەوێتەوە تا دەگاتە هەمان شوێن وەکو کەسێك سوجدەی دووەمی لەبیر بچێت و بیری نەکەوێتەوە تا هەمان شوێن لە ڕکاتی دوای ئەوە لەم کاتەدا ڕکاتی دووەم بەیەکەم حساب دەکرێت وە ڕکاتێکی تر دەکات پاشان سەلام دەداتەوە و پاش سەلام سوجدەی سەهو دەبات .

بەڵام نوقسانی واجب: ئەگەر واجبێکی نەکرد و چووە سەر کردارێکی تر وەك کەسێك وتنی (سبحان ربي الأعلى)ی لە بیر بچێت و بیری نەکەوێتەوە تا کاتێك هەستایەوە لە سوجدە ئەم کەسە واجبێکی نەکردووە، نوێژەکەی بەردەوام دەکات بەڵام پێش سەلام دانەوە سوجدە دەبات، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك تەحیاتی یەکەمی لەبیر چوو نوێژەکەی بەردەوام کرد و نەگەڕایەوە بۆ دوا و پێش سەلامدانەوە سوجدەی سەهوی برد" [٧].

---

[٧] صحيح البخاري رقم: (١٢٢٤) وصحيح مسلم رقم: (٥٧٠) من حديث عبد الله بن بحينة .

ئـەمجا دوو دڵـی, دوو دڵـی بریتـی یـە لـە گومـان لـە نێـوان زیـادکردن و نوقسانی، وەکو کەسێك گومـانی هـەبێت سـێ ڕکـاتی کردبـێ یـان چـوار لـەم کاتەدا لە دوو حاڵەت بەدەر نی یە:

یا زیاد کردن یا کەم کردنـی بـۆ سـاغ دەبێتـەوە لەسـەر ئـەوەی کـە سـاغ دەبێتەوە بنیات دەنێت و لە دوای سەلامدانەوە سوجدە دەبات، بەڵاّم ئەگـەر هاتو بۆی ساغ نەبوەوە ئـەو کاتـە لەسـەر کـەمترین ڕێـژە بنیـات دەنێـت کـە دڵنیایە لێ ی پاشـان ئـەوەی مـاوە تـەواوی دەکـات و پـێش سـەلام سـوجدە دەبات .

**بۆ نموونە:** کەسێك نوێژی نیوەڕۆ دەکات دوو دڵ دەبێـت ئایـا لـە ڕکـاتی سێیەم دایە یان چـوارەم؟ بـۆی سـاغ دەبێتـەوە سـێیەم ڕکاتـە لـەم ڕکاتـەدا چوارەم دەکات پاشان سەلام دەداتەوە و سوجدەی سەهو دەبات .

نمونەی ئەو حاڵەتەی ساغ نەبێتەوە: کەسـێك نوێـژی نیـوەڕۆ دەکـات دوو دڵ دەبێت لەسێیەمدایە یان لـە چـوارەم بۆیشـی سـاغ نابێتـەوە لـەم کاتـەدا لەسـەر دڵنیـایی بنیـات دەنێـت کـە کەمترینـە کـە سـێ یـەو ڕکـاتی چـوارەم دەکات، پاشان سوجدەی سەهو دەبات پێش سەلام دانەوە .

لێرەوە بۆمان دەرکەوت سوجدەی سەهو پێش سەلامدانەوە دەبرێت لەم کاتانەدا:

کاتێك واجبێك لە بیربچێت، یان گومان لە ژمارەی ڕکاتەکاندا هەبوو بۆی ساغ کرایەوە .

وە پاش سەلامدانەوە لە کاتی زیادکردن لە نوێژدا یان گومان بێت و بۆی ساغ و یەکلا نەبێتەوە[٨] .

**پ٦٧ / کەسێك لەپشتی ئیمامەوە نوێژ دەکات کاتێك دەچێتە ناو نوێژی ئیمامەوە ئیمام خوێندنی فاتیحەی تەواو کردووە ئەمیش دەست پێدەکات فاتحە دەخوێنێت ، بەڵام ئیمام کوڕنوش دەبات ئایا ئەم کوڕنوش ببات یان خوێندنەکەی تەواو بکات؟**

**وەڵام:** ئەگەر نوێژکەر چووە ناو نوێژەوە ئیمام دەیویست کوڕنوش ببات وە ئەم ناتوانێت فاتیحەکە بخوێنێت، ئەگەر تەنها ئایەتێك یان زیاتر مابێت بە مەرجێك تەواوی بکات و فریای ئیمام بکەوێتەوە لە کوڕنوشدا ئەوا زۆر چاکە ئەگەر زۆری مابوو کاتێك کە بیخوێنێت فریای ئیمام نەکەوێت لە کوڕنوشدا

---

[٨] فتاوى أركان الإسلام لابن العثيمين ص: (٣٤٥- ٣٤٨) . **وەرگێر : م.خلیل**

لەم حاڵەتەدا لە گەڵ ئیمامدا کورنوش دەبات با فاتیحەش تەواو نەبووبێت [٩].

**پ٦٨ / ئەگەر چویتە مزگەوت و نەتتوانی** (تحية المسجد) **بکەیت لەبەر کەمی کات واتە تەنها کاتی دوورکات سوننەتی پێش نوێژ مابوو یان قامەت کرا بۆ نوێژی فەرز، ئایا دەتوانیت تەکبیرەی ئیحرام بکەیت بەنیەتی هەردوو نوێژەکە** (تحية المسجد) **لەگەڵ ئەوی تر (نوێژی مزگەوت لە گەڵ سوننەت یان نوێژی مزگەوت لە گەڵ فەرزەکە)؟**

**وەڵام :** ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێ: (هاوەڵانی ئێمە پێکهاتوون و بەڕاشکاوی وتویانە خێری فەرز و نوێژی مزگەوت (تحية المسجد)ی دەست دەکەوێت ، و وتویانە هیچ جیاوازی یەك نی یە لە بەدەست هێنانی هەردوو نوێژەکە .

نەوەوی دەفەرمووێ: من هیچ جیاوازی یەك نازانم دوای لێکۆڵینەوەی زۆر بەدرێژایی چەندین ساڵ) [١٠].

---

[٩] فتاوى أركان الإسلام ص: (٣٧١) . **وەرگێر : م.خلیل**

[١٠] المجموع: (١ / ٣٢٥ - ٣٢٦) .

(الحافظ ابن حجر) **لە** ((فتح الباري))**دا لە شەرح و لێکدانەوەی فەرموودەی:** ((إنَّما الاعمال بالنيات ..))**دا دەفەرمووێت:** (أما إذا لم ينو شيئاً مخصوصا لكن كانت هناك نية عامة تشمله فهذا مما اختلفت فية أنظار العلماء ويتخرج عليه من المسائل ما لا يُعصى وقد يحصل غير المنوي لمدرك آخر كمن دخل المسجد فصلى الفرض أو الراتبة قبل أن يقعد فإنه يحصل له تحية المسجد نواها أو لم ينوها لأن القصد بالتحية شغل البقعة وقد حصل وهذا بخلاف من اغتسل يوم الجمعة عن الجنابة فإنه لا يحصل له غسل الجمعة على الراجح لأن غسل الجمعة ينظر فيه إلى التعبد لا إلى محض التنظيف فلا بُدَّ فيه من القصد إليه بخلاف تحية المسجد، والله اعلم)[١١].

---

[١١] فتح الباري شرح صحيح البخاري: (١ / ١٨) .

**پ٦٩ / پرسیار کراوە لە شێخی ئیسلام** (ابن تيمية) **ڕەحمەتی خوای لێ بێت, ئایا سەفەر سوننەتی هەیە؟ لەکاتێکدا نوێژی چوار ڕکاتی کراوە بە دوو وەکو ڕەحمەتێك لە خوای گەورەوە بۆ بەندەکانی, کەوایە بەڵگەی ئەوانە چیە کە ئەڵێن سوننەتی هەیە, لە کاتێکدا ئیمامی عومەر خوای لێ ڕازی بێت ئینکاری کردە سەر ئەو کەسەی لەدوای فەرز سونەتی کرد, ئایا لەهەندێ مەزهەبدا بەسوننەت دادەنرێت وەکو مەزهەبی ئەبو حەنیفە، وە ئایا ئەم ڕایە لە ئیمامی ئەبو حەنیفەوە نەقڵ کراوە؟**

**وەڵام :**

ئەوەی کە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)سەلمێنراوە ئەوەیە کە: پێغەمبەر (ﷺ)لە سەفەردا دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی کردووە تەنانەت کاتێك خۆی و هاوەڵانی لەدوای جەنگی خەیبەر خەویان لێکەوت بە قەزا لەگەڵ نوێژی بەیانی کردیانەوە، هەروەها شەونوێژ و نوێژی (وتر) لە صەحیحدا

**سەلمێنراوە كە:** ((أنه كان يصلي على راحلته قبل أي وجه توجهت به ويوتر عليها غير أنه لا يصلي عليها المكتوبة))[١٢].

**بەڵام نوێژكردن پێش نیوەڕۆ یان پاش ئەوا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)ڕیوایەت نەكراوە كە كردبێتی لە سەفەردا، وە لە گەڵ ئەو نوێژەدا هیچ نوێژێكی نەكردوە وە زانراوە لە** (مِنی) **دووڕكات دووڕكات نوێژی كردوە وهیچی تری لە گەڵدا نەكردوە .**

**(ابن عمر)یش كە شارەزاترین كەسە بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)و شوێنكەوتەیەكی ڕاستەقینەی سوننەتە سوننەتی پێش و پاش فەرزەكانی نەكردووە لە سەفەردا .**

**بەڵام زانایان جیاوازیان هەیە لە سوننەتێتی ئەم مەسەلە**

[مجموع الفتاوى: (٢٣ / ١٢٨ ـ ١٢٩)] **. وەرگێڕ : م.خلیل**

---

[١٢] صحيح سنن النسائي رقم: (٧٤٤) .

**پ٧٠/ ئایا خوتبەی نوێژی جەژن یەك خوتبەیە یان دوو؟ وە ئایا نۆ (الله أكبر) لەیەکەمیاندا و حەوت لەدووەمیاندا سوننەتە یان نا؟.**

**وەڵام :**

خوتبەی جەژن یەك خوتبەیە، نەسەلماوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) لەجەژندا دوو خوتبەی خوێندبێ هەرچەندە حەدیسێکی لاواز هەیە ئیمامی شەوکانی لەکتێبی (نیل الأوطار )دا هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەجەژندا دوو خوتبەی خوێندووە ئیمامی شەوکانی ئەڵێ : (قیاس) کردنی لەسەر خوتبەی جومعە پشتیوانی ئەو حەدیسە دەکات. بەڵام ئەوەی لە(بوخاری وموسلیم) دا هاتووە ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) خوتبەیەکی بۆ پیاوان خوێند و پاشان بەجێی هێشتن و ڕۆشت خوتبەیەکی بۆ ئافرەتان خوێند .

کەوابوو ئەگەر ئافرەتان هەبوون خۆتیش پێت باشبوو خوتبەیان بەیت- وەلە فیتنەیان پارێزراو بوویت-ئەوە دروستەو خوتبەیان بۆ بخوێنە ، وەئەگەر دەستەواژە هەبوو بۆ گەیاندنی دەنگ وەك (بڵندگۆ) ئەوا باشترە، خوتبەی جەژن وەك هەموو خوتبەکانی تر بریتییە لەهاندان لەسەر چاکەو

ترساندن لەخراپە و وریا کردنەوە لەخراپی داهێنراوەکان وەلەو کردەوانەی خەڵکی دەکەونە ناویەوەو پێچەوانەی شەرعی خوایە و هاندانی خەڵك بۆ شتانێك شەرع هانمان دەدات بۆی ، کەوابوو لێرەوە زانرا وتەی ڕاست و دروست لەوتەی زانایان ئەوەیە : خوتبەی جەژن یەکەو (الله أكبر) کردن لەخوتبەکەیدا وەك دەکرێت لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) نەسەلمێنراوە و نەهاتووە[1].

**پ ٧١ / ئایا ڕەوایە کرێکارانی کاربەدەست لە شوێنە خزمەتگوزاریە گەورەو بایەخدارەکاندا ، وەك : کارگەی پترۆکیمیاوییات ، یان کانگەی وزە ( محطة الطاقة ) دوا بکەون لە ئەنجامدانی نوێژی جومعەدا ، لە کاتێکدا ئەگەر ئامێرەکانیان ڕابوەستێنرێت ، و جارێکی تر بخرێنە کار تادەگەنە ئاستی پێویست بۆ بەرهەم هێنان زەرەرێکی گەورەی ئەوتۆی مادی لێ دەکەوێتەوە کە بە ملیۆنەها دۆلار دەخەمڵێنرێت کە کاریگەریان دەبێت لە سەر دەرامەتی کارگە نەتەوەیی یەکانی ئەو وڵاتەدا ؟ جا داواکارین وتەی خۆتمان لەو بارەیەوە بۆ بخەیتە ڕوو .**

---

(١) انظر : غارة الأشرطة لشيخ مقبل ج٢ل ٢٥١ . **وەرگێر : مامۆستا خلیل أحمد**

**وەڵام:**

ئەگـــەر ڕۆشـــتنتان بـــو نویـــژی جومعـــە زەرەرێکـــی گـــەورەی لێ دەکەویتەوە ئەوا ئەو کەسانەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بەو کارەوە هەیـە هیچیان لە سەر نی یە و بۆیان ڕەوایە نوێژی جومعـە نەکـەن ، وە لـە جیاتی نوێژی نیوەڕۆ دەکەن ، بـەڵام ئـەبی کـەمترین کـەس بـن کـە کارەکـەیان پـێ هەڵدەسوڕێت ، هەروەها دەبێت بە شێوەیەك بێت جارێك ئـەوان جـارێکی تـر کۆمەڵێکی تر ، بەڵام ئەگەر بە ڕۆشتنیان بۆ نوێژەکـەیان زەرەر نەکەوێتـەوە بەڵکو قازانجیان لە دەست دەردەچێت ، ئـەوا پێویسـتە نوێژەکـەیان ئـەنجام بدەن ، لە بەر وتەی خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی :

﴿ إِذَا نُـودِي لِلصَّـلاَةِ مِـن يَـوْمِ الْجُمُعَـةِ فَاسْـعَوْا إِلَى ذِكْـرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْـعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ [سورة الجمعة : ٩] .

فتاوى الشيخ ابن العثيمين رحمه الله ، المجلد السادس عشر ، رسالة من الشيخ ابن العثيمين رحمه الله .

**وەرگێر : مامۆستا خليل أحمد**

**پ٧٢/ مامۆستایانی خۆشەویست چاوتان ماچ دەکەم من ماوەیەك پێش ئێستا وتم ئەگەر لە تاقی کردنەوە دەربچم حەیوانێك سەردەبڕم ئایا دەبێ نەزرەکەم جێ بە جێ بکەم؟ ئایا دەتوانم خۆم یان ماڵەوەمان لێی بخۆین؟**

**وەڵام :**

**ئەوەی تۆ کردووتە نموونەیەکە لە نموونەکانی نەزر ئەوەش بزانە نەزر عیبادەتێکی کۆنە و لە مێژووی ئومەتەکانی تردا کراوە بەڵگەش لە قورئان هاتووە لەسەر دروستێتی وەك خوای گەورە دەفەرموێ :**{وَمَا أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ اللّهَ يَعْلَمُهُ } (٢٧٠) سورة البقرة

**واتە : هەرشتێکتان بەخشی بێت یان هەر نەزر و بڕیارێکتان دابێت ئەوا خوا پێی دەزانێت .**

**وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم :** (من نذر أن يطيع لله فليطعه ومن نذر أن يعصيه فلا يعصه) رواه البخاري ومسلم عن عائشة

**نەزریش بریتی یە لە خۆپابەند کردن بە عیبادەتێکەوە کەواجب نیە لەشەرع دا وە واجبی دەکەیت لەسەر خۆت .**

ئەوەش بزانە نەزر دەبێت بە دوو بەشەوە :

یەکەم : نەزری مشروط

دووەم : نەزری غیر مشروط

یەکەمیان : خۆپابەند کردنە بە شتێکەوە لە کاتی دەستکەوتنی نیعمەتێك یان نەمانی خراپەیەك وەك ئەوەی تۆ کردووتە زانایان ئەم جۆرەیان بە مەکروهـ داناوە ، بەڵاّم دەبێت وەفای هەبێت بە نەزرەکەیەوە و وە نەزرەکەی بکات .

دووەمیان : خۆپابەند کردنە بە شتێکەوە پێشی ڕوودانی شت یان ڕوونەدانی ئەمەش دەبێت وەفای هەبێت و بیکات .

وە بە شێوەیەکی گشتی نەزر واجبێکە مرۆڤ خۆی واجبی دەکات وەك زانایانی (ئوصول) دەڵێن : واجب دەبێت بە دوو بەشەوە بە پێی واجب کارە:

**یەکەم : واجب بالشرع ، دووەم : واجب بالشرط**

جا هەرکەسێك شتێك واجب دەکات لەسەر خۆی ئەوە خۆی دەزانێت چەندێکی واجب کردووە خۆ ئەگەر تەواوی ئاژەڵەکەی نەزر کرد نابێت لێی

بخوات بەڵام ئەگەر تەنها مەبەستی سەربڕینی ئاژەڵێك بوو ئەوە دەتوانێت لێی بخوات .

**پ٧٣/ ئایا (صرّاف) ئەوەی پارە گۆڕینەوە دەکات زەکاتی لەسەر بیدات؟ وە چۆن؟ خوای پەروەردگار پاداشتی خێرتان بداتەوە .**

**وەڵام :**

ئەوانەی پارە دەگۆڕنەوە (صرّاف) لەبەر ئەوەی هەمیشە خاوەنی پارەن و پارەش حیسابی شتی کەوتوو نەفرۆشراوی بۆ ناکرێت پێویستە زەکاتی بدەن وە چۆنێتی زەکاتی پارە بریتی یە لە 2.5% بۆ هەر جۆرە دراوێك .

**پ ٧٤/ مـن فەرمانبـەرم مـاوەی چـوار سـاڵە بـڕی چـوار مليـۆن دينـاری چـاپی عێـراقيم كۆكردۆتـەوە بەمەبەسـتی ژنهێنـان و دروسـت كردنی ماڵ ئايا ئەو پارەيە زەكاتی ئەكـەوێت؟ وە لـەماوەی ئـەم چـوار سـاڵەدا زەكـاتی ئـەو پارەيـەم دەركـردووە ، بـەلاّم ئێسـتاپێم دەڵـێن پارەيـەك بـۆ مـاڵ دروسـت كـردن بێـت زەكـاتی ناكـەوێت ئێسـتا نـازانم چی بكەم تكايە وەلاّم .**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندە و ميهرەبان

زەكات حوكمێكی شەرعييە و ناوێكە بۆ ئەو حەقـەی مـرۆڤ دەری دەكـات لـە مـاڵ و سـامانی خـۆی لـە مـافی خـوای گـەورە بـۆ هـەژاران خـوای گـەورە دەفەرموێت : {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا } (١٠٣) سورة التوبة

جا ئەم مافەی خوای گـەورە بـۆ هـەژاران لەسـەر موسـڵمانی ئـازادی خـاوەن سامان كە گەشتبێتە ئەندازەی (نصاب) واتە : ڕێـژەی واجـب بـوونی زەكـات وە مەرجە ئەو ڕێژەيە (نصاب) زياد بێت لەو پێويستيانەی مـرۆڤ پێويسـتيان پێـی هەيـە ئەوانـەی كـە مـرۆڤ ژيـانی پـێ بەسـەر دەبـات وەك : خـۆراك و جلوبەرگ و سەيارە و ئامڕازەكانی كاركردن وە سـاڵێك بەسـەر ئـەو ڕێژەيـەدا

بڕوات شێوەی حیسابکردنیشی ئەوەیە کەی مرۆڤ بوو بە خاوەن ئەو ڕێژەیە ساڵێك حیساب دەكات جا ئەگەر کەسێك ماڵی نەبوو یان هەر پێویستیە لەوانە هەبوو یان ژنهێنان زەکاتی لەسەر نییە.

**پ٧٥/ من پرسیارم تەنها ئەوەیە دەبێ لە جیاتی ئەو کەفارەتەی بۆ سوێند شکاندن بە خوا پارە بدەی بە فەقیرەکان لە جیاتی نانخواردنیان و جلوپۆشاك و ئازادکردنیان؟ وەبڕی پارەکە چەندە بێت ئەگەر بکرێت خوا جەزای خێرتان بداتەوە .**

**وەڵام :**

کەفارەتی سوێند بە نان دان واتە (إطعام) دەکرێت وە دروست نییە بە پارە بدرێت چونکە ئەگەر ببوایە ئەو کاتە ئەوە حەڵاڵ دەکرا بە پارە بکرێت لە کاتێکا خەڵك پێویستیان بە پارە زیاتر بووە ، بەڵام هەر بە نان دان هاتووە ئەمەش بۆچوونی زۆربەی زانایانە .

**پ٧٦/ چۆن بزانین مانگی نوێمان بەسەردا هاتووە لە هەموو مانگەکاندا بۆ نموونە مانگی ڕەمەزان؟**

**وەڵام :**

مانگی نوێ دەرکەوتنی (هِلال) واتە: بینینی مانگی نوێ پاش ئەوەی خۆر ئاوا بێت, ئەگەر دوای ئەوەی خۆرئاوابوو بینرا ئەوا بێ گومان دەچینە ناو یەکەم شەوی مانگی داهاتووەوە، ئەوەش بزانە لەم کاتەدا تەنها ئەوانە دەیبینن چاویان تیژە, بەڵام لە شەوی دووەمدا هەموو کەسێك دەتوانێت بیبینێت، لەم شەوەدا ئاوابوونی مانگ نزیکەی سێ چارەك سەعات لە خۆر ئاوابوون دوا دەکەوێت, هەروەها لە نزیك شەوی سێیەمدا لە کاتی نوێژی خەوتنان (عشاء) ئاوا دەبێت، لە (نوعمان)ی کوڕی (بەشیر)ەوە سەلمێنراوە کە فەرموویەتی: (من زاناترین کەسم بەکاتی نوێژی خەوتنان (عیشا) (واتە: کاتی ئاوابوونی مانگی شەوی سێیەم لە مانگدا, واتە: دوای ئاوابوونی خۆر بەیەك سەعات و نیو ئەمەش کاتی نەمانی سورایی خۆرە (شەفەق) .

بەڵام ئەگەر مانگ بینرا زۆر نزیك بوو لە خۆر یان پێشی کەوتبوو ئەوە هی مانگی پێشووە, هەروەها ئەگەر هی کۆتایی مانگ بێت ئەوا لە ئاسۆدا بە

شێوەی کەوانە دەبینرێت هەر دووسەری کەوانەیە ڕووی لە سەرەوە دەبێت، والله اعلم[١].

## پ٧٧/ ئایا بۆ موسڵمانان دروستە بۆ گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان و شکاندنی لە کۆتایی مانگدا پشت بە حیسابی فەلەکی ببەستن یان هەر ئەبێت مانگ ببینن؟

**وەڵام :**

شەریعەتی ئیسلام شەریعەتێکی ئاسان و گشتی‌یە حوکمەکانی بۆ هەموو عالەمی جن و ئادەمیزادە بە هەموو چین و توێژەکانیانەوە ، زانا و نەزان و شاریی و دەشتەکییان، بۆیە خوای گەورە ڕێگەی زانینی کاتەکانی بۆ ئاسان کردوون ، وای کردووە بۆیان ، هاتن و تەواو بوونی کاتەکانی بۆ دیاری کردوون بە چەند نیشان و شتانێك هەموویان وەك یەك بیناسن و بزانن .

بۆیە ئاوابوونی خۆری بۆ کردوون بە نیشانێك بۆ هاتنی کاتی نوێژی ئێوارە (مغرب) و نەمانی نوێژی عەسر، هەروەها نەمانی سورایی پاش ئاوابوونی خۆری بۆ کردوون بە نیشانێك بۆ هاتنی کاتی نوێژی (عیشاء)، هەروەها

---

[١] جواب (الشيخ عبد الله بن عبد الرحمن بن جبرين) فتاوى رمضان : (٥٧/١) ترتيب أشرف عبد المقصود .

بینینی مانگ دوای دیار نەمانی لە کۆتایی مانگی پێشوو بۆ کردوون بە نیشان بۆ دەست پێکردنی مانگی تازە و کۆتایی هاتنی مانگی پێشوو ، خوای گەورە تەکلیفی لیّ نەکردووین ـ بۆ زانینی مانگی تازە ـ بە شتانێك کە کەسانێکی کەم دەیزانن وەك زانستی ئەستێرەناسی یان زانستی حیسابی فەلەکی ، بۆیە دەقەکانی قورئان و سوننەت ئەم بۆچوونە پشت ئەستوور دەکەن:

بینینی مانگی ڕەمەزان بەچاو نیشانەیە بۆ دەست پێکردنی ڕۆژوو گرتن، هەروەها بۆ جەژنی قوربان و ڕۆژی (عرفه)،

خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ [ البقرة: (١٨٥)]،

وە دەفەرموویّت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ﴾[البقرة: (١٨٩)]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویّت: ((إذا رأيتموهُ فصوموا، وإذا رأيتموهُ فأفطروا، فإنْ غُمَّ عليكم فأكملوا العدة ثلاثين))[٢].

پێغەمبەری خوا (ﷺ) جێگیر بوونی ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان و شکاندنی بە ستووە بە بینینی مانگەوە بە چاو نەك بە حساب و بەدواگەڕانی

[٢] صحيح البخاري رقم: (١٩٠٠) .

ئەستێرەکانەوە، بەمەش کارکراوە لە کاتی پێغەمبەر (ﷺ) و کاتی هەر چوار خەلیفەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و چوار پێشەوای بەناوبانگ و سێ سەدەی شایەتی بۆ دراوە لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە فەزڵ و چاکە .

کارکردن و گەڕانەوە لەم مەسەلەیەدا بە زانستی ئەستێرەناسی بیدعەیە و خێری تێدا نییە و هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە ، بۆیە وڵاتی سعوودیە بەوە کار دەکات کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێشینە پیاو چاکان لەسەری بوونە ، بەڕاستی لە دینداریدا خێر لەوەدایە شوێنی پێشینە پیاو چاکەکان بکەویت و هەموو خراپەیەکیش لە شوێنکەوتنی بیدعەدایە[٣].

**پ٧٨/ ئایا حوکمی موسافیر لە ڕەمەزاندا شۆفێری ئۆتۆمبیلەکان دەگرێتەوە لە سەفەردا لە کاتێکدا بەردەوام لە سەفەردان؟**

**وەڵام :**

بەڵێ حوکمی سەفەریان لەسەردا دێت ، بۆیان هەیە نوێژ کورت بکەنەوە و کۆبکەنەوە و بە ڕۆژووش نەبن.

---

[٣]وەڵامی لیژنەی هەیشەیی بۆ توێژینەوەی زانستی و فەتوا،لە کتێبی: فتاوی رمضان: (١ /٦٠. ٦١)

ئەگەر کەسێك بڵێت: ئەی کەی ڕۆژوو بگرن لە کاتێکدا بە درێژایی ساڵ ئەمە کاریانە؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: لە ڕۆژانی زستاندا با ڕۆژوو بگرن لەبەر ئەوەی ڕۆژەکانی کورت و ساردن، بەڵام ئەو شۆفێرانەی لە ناو شاردا کار دەکەن ئەم حوکمەیان نییە و واجبە بە ڕۆژوو بن[٤].

**پ٧٩ / ئایا دروستە بۆ ئافرەتان داو و دەرمان بەکار بهێنن بۆ قەدەغە کردنی خوێنی (حیض) لە ڕەمەزاندا یان نا؟**

**وەڵام**: دروستە ئافرەتان داو و دەرمان لە ڕەمەزاندا بەکار بهێنن بۆ قەدەغە کردنی خوێنی (حیض) بەمەرجێك پزیشکی متمانە پێکراوی پسپۆڕ یان کەسانی شارەزا ئەوە بسەلمێنن کە هیچ زیانی بۆیان نییە و هیچ کاریگەری بۆ سەر منداڵدانی نییە ، چاکتر وایە بۆ ئافرەتان ئەمانە بەکار نەهێنن چونکە خوای گەورە حەڵاڵی کردووە بۆیان ڕۆژوو نەگرن و لە کاتێکی تردا قەزای بکەنەوە[٥].

---

[٤] جواب الشيخ محمد بن صالح العثيمين رحمه الله، فتاوى رمضان: (٢ / ٣٣٣ - ٣٣٤).

[٥] وەڵامی لیژنەی هەیشەیی بۆ توێژینەوەی زانستی و فەتوا، لە کتێبی: فتاوى رمضان: (١ / ٣٥٤) .

**پ٨٠/ ئایا بۆ ئافرەتی حامل و شیردەر دروستە بە ڕۆژوو نەبن لە ڕەمەزاندا؟ ئایا واجبە لەسەریان قەزای بکەنەوە یان (کەفارەت)یان لە سەرە؟**

**وەڵام :**

(ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ئەگەر لەخۆیان و منداڵەکانیان بترسن بە ڕۆژوو نابن و هەموو ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدەن، بەڵگەی ئەوەیش لە کتێبی خوای پەروەردگار دا:

﴿ وَ عَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، ڕووی هەڵێنجاندی بەڵگەش (وجة الإستدلال) ئەوەیە کە ئەم ئایەتە تایبەتە بە پیاو و ئافرەتی پیر و نەخۆشێك کە هیوای چاك بوونەوەی لێ نەکرێ و شیردەر و سك پڕ ئەگەر لە خۆیان و منداڵەکانیان بترسن، هەر وەکو باسەکە ئاشکرا دەکرێت لە ڕیوایەتەکانی (ابن عباس) و (ابن عمر)ەوە (رضي الله عنهم)...

(ابن عباس ﵄) **فەرموویەتی:** ((... وَثَبَتَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيْرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيْرَةِ إِذَا كَانَا لا يُطِيْقَانِ الصَّوْمَ، وَالحُبْلَى والمرْضِعُ إِذَا خَافَتَا أَفْطَرَتَا وَأَطْعَمَتَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِيْنَا))[٦].

**واتە: ... وە ئەوە جێگیر بوو کە پیاو و ئافرەتی پیر ئەگەر توانای ڕۆژوویان نەبێ و ئافرەتی سك پڕ و شیر دەریش ئەگەر لە خۆیان و منداڵەکانیان ترسان بە ڕۆژوو نابن و بۆ هەموو ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدەن ...**

(ابن عباس) (﵄) **ئەم حوکمەی داوە بۆ ئافرەتی سك پڕ و شیردەر، باشە لە کوێوە ئەم حوکمەی داونەتێ؟ گومان لەوە دا نییە کە لە**

---

[٦] أخرجهُ ابن الجارود رقم: (٣٨١) ، والبيهقي: (٤/٢٣٠)، وأبو داود رقم: (٢٣١٨)،وسندهُ صحيحٌ .

وثبت عنه أنه قال: ((إذا خافت الحامل على نفسها، والمرضع على ولدها في رمضان، قال: يفطران ويطعمان مكان كل يومٍ مسكيناً، ولا يقضيانِ صوماً)) صحيح عزاهُ الشيخ الألباني في "الإرواء" (١٩ / ٤) إلى الطبري (٢٧٥٨) وقال إسنادهُ صحيح على شرط مسلم . نقلاً عن "الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز" ص : (١٩٩) .

**واتە: ئەگەر ئافرەتی سك پڕ (حامل) ترسی لەسەر خۆی هەبوو، وە ئافرەتی شیردەر ترسی لەسەر منداڵەکەی هەبوو لە ڕەمەزاندا ئەوا بە ڕۆژوو نابن و لە جیاتی هەموو ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدەن، و ڕۆژوو قەزا ناکەنەوە .**

سوننەتەوە، بە تایبەت خۆی بە تەنها ئەمەی نەفەرمووە، بەڵكو (عبدالله بن عمر) (رضي الله عنه) هاو دەنگە لە گەڵی دا كە دەگێڕێتەوە ئەم ئایەتە (مەنسوخە) .

لە (مالك) ەوە دەگێڕنەوە ئەویش لە (نافع)ەوە كە (ابن عمر) (رضي الله عنه) پرسیاری لێ كرا دەربارەی ئافرەتی سك پڕ ئەگەر لە منداڵەكەی ترسا، فەرمووی:

" تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ مَكَانَ كُلَّ يَوْمٍ مسْكِيْنَاً مُدَّاً مِنْ حنْطَة "[٧]، واتە: ڕۆژوو ناگرێت و بەرامبەر بە هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات بە گوێل(مُدّ)یك لە گەنم .

وە لە (ابن عمر)ەوە(رضي الله عنه) دەیگێڕینەوە كە فەرموویەتی:

(الحَامِلُ وَالمرْضِعُ تُفْطِرُ وَلا تَقْضي)[٨]. واتە: ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ڕۆژوو ناگرێت و قەزاشی ناكاتەوە.

وە لە ڕێگەیەكی ترەوە: (أنَّ امْرَأتَهُ سَأَلَتْهُ وَهْيَ حُبْلَى، فَقَالَ: أَفْطِري وَأَطْعِمي عَنْ كَلِّ يَومٍ مسْكِيْنَاً وَلا تَقْضي) (إسناد)ەكەشی (جید)ە، وە لە ڕێگەی سێیەمەوە

---

[٧] أخرجهُ البيهقي في "سننه": (٤/٢٣٠) من طريق الإمام الشافعي، وسندهُ صحيحٌ.

[٨] أخرجهُ الدارقطني: (١ / ٢٠٧) وصَحَّحَهُ .

هــەر لــەوەوە(ﷺ): ( أنَّ بِنْتَاً لَهُ كَانَتْ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْش، وَكَانَتْ حَامِلاً، فَأَصَابَهَا عَطَشٌ فِي رَمَضَان، فَأَمَرَهَا أَنْ تُفْطِرَ وَتُطْعِمَ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مسْكِيْنَاً ...).

له ( ابن عباس ) ەوە(ﷺ) دەگێڕنەوە كە یەكێك ـ لەو كەنیزەكانەی كە منداڵی لێی هەبوو (أم ولد) ـ بە سك پڕی یان شیردەری بینی و فەرمووی:

( أَنْتِ مِن الَّذينَ لا يُطِيْقُونَ ، عَلَيْكِ الجَزَاءُ ، وَلَيْسَ عَلَيْكِ القَّضَاءُ)[٩].

واتە: تۆ لەوانەی كە توانای ڕۆژوویان نییە، فیدیەدانت لە سەرە نەك قـەزا كردنەوە

**پ٨١ / ئەگەر هاتوو پیاو لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژ ماچ یان دەسبازی لەگەڵ خێزانی خۆی كرد ئایا ڕۆژووەكەی بەتاڵ دەبێتەوە یا نا؟**

**وەڵام** : ماچ كردن و دەسبازی پیاو لە گەڵ خێزانیدا بە بێ جیماع كردن لە كاتێكدا بە ڕۆژوو بێت دروستە و هیچی تێدا نـییـە، چـونكە پێغەمبـەر (ﷺ) ماچی خێزانی دەكـرد و یـاری لـە گـەڵ دەكـرد، بـەڵام ئەگـەر ترسـا بكەوێتـە حەرامەوە لە بەر ئەوە شەهوەتی بەرز بوو مەكروهە ئەو شتانە بكات، ئەگـەر (مَني) دابەزی ئەبێت خـۆی بگرێتـەوە لـە خـواردن و خواردنـەوە و جمـاع تـا

---

[٩] أخرجهُ الدارقطني: (١ / ٢٠٧).

ئێوارەی ئەو ڕۆژە، پاشان ئەو ڕۆژە بگرێتەوە و (کفارە)ی لەسەر نییە لای زۆربەی زانایان، بەڵام (مَذي) ڕۆژووی پێ بەتاڵ نابێتەوە لە ڕای پەسەندکراوی زانایاندا، چونکە ئەسڵ ئەوەیە ڕۆژووەکە تەواو بێت و بەتاڵ نەبێتەوە، هەروەها گرانە ئادەمیزاد خۆی لەو کارە بپارێزێت[١١].

**پ٨٢/ پرسیار کرا لە شێخ محمد بن صالح العثمین دەربارەی ڕۆشتنی خوێن لە ڕۆژووان ئایا ڕۆژوو دەشکێنێت؟**

**وەڵام :**

ئەو خوێن ڕۆشتنەی بە هۆی ددانەوە دروست دەبێت هیچ زیانێکی بۆ ڕۆژووەکە نییە، بە مەرجێك هەوڵ بدات خۆی بپارێزێت لە قوتدانی ئەو خوێنە چونکە دەرچوونی خوێن بەبێ ویستی مرۆڤ بە یەکێك لەوانەی ڕۆژوو دەشکێنێت ناژمێردرێت، کەسێك ئەم حاڵەی بەسەر هات واجب نییە ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە[١٢].

---

[١١] جواب (الشيخ ابن باز رحمه الله)، فتاوى رمضان: (٢ / ٤٥٢) .

[١٢] جواب (الشيخ محمد بن صالح العثيمين رحمه الله)، فتاوى رمضان: (٢ / ٤٦٠) .

**پ٨٣/ حوکمی ئەو کەسە چییە کە بە ڕۆژووە و خوێنی لێ وەردەگیرێت بەمەبەستی شیکاری خوێن؟**

**وەڵام :**

ئەم جۆرە شیکاریانە ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە، بەڵکو بواری پێدراوە، چونکە ئادەمیزاد پیویستی بەم جۆرە شیکاریانە هەیە، ئەنجا لەو شتە ئاشکرایانە نییە کە ڕۆژوو دەشکێنن لە شەرعدا [١٣].

**پ٨٣/ پرسیار کراوە لە شێخ ابن باز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی بەکارهێنانی دەرزی لە دەمار** (وَريد) **و** (عضلة)**, جیاوازی بۆ ڕۆژووان چییە؟**

لە وەڵامدا دەفەرمووێت: ئەوەی پەسەندە ڕۆژوو ناشکێنن، تەنها ئەوەی ڕۆژوو دەشکێنێت دەرزی (مُغذي)یە[١٤]...

---

[١٣] جواب (الشيخ ابن باز رحمه الله)، فتاوى رمضان: (٢ / ٤٦٥) .

[١٤] **بڕوانە**: فتاوى رمضان: (٢ / ٤٨٥) .

**پ٨٤/ پرسیار کراوە لە شێخ ابن باز (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەربارەی حوکمی هەڵگرتنی دەرمان لە کۆمەوە** (الحقنة الشرجية) **بۆ ڕۆژووان لە کاتی پێویستیشدا؟**

**لە وەڵامدا دەفەرموویێت: لە وەڵامی پەسەندکراوی زانایاندا بۆ نەخۆش ئەگەر پیویستی پێی هەبوو دروستە ئەمە هەڵبژاردەی شێخی ئیسلام** (ابن تيمية)**یە (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) هەروەها کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان، چونکە وەکو خواردن و خواردنەوە نیيە** [١٥].

**پ٨٥/ پرسیار کراوە لە شێخ** محمد بن صالح العثمين **(ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەربارەی قەترەی چاو و لووت هەروەها چاوڕەشتن و قەترەکردنە گویٚ ئایا ئەمانە ڕۆژوو دەشکێنن؟**

**لە وەڵامدا دەفەرمویێت: قەترەی لووت ئەگەر بگاتە گەروو یان قورگ ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەی** (لقيط)**ی کوڕی** (صبرة)**دا دەفەرمویێت:** ((بالِغْ في الاستنشاق إلاَّ أنْ تكونَ صائماً))[١٦].

---

[١٥] **بڕوانە**: فتاوى رمضان: (٢ / ٤٨٥) .

[١٦] صحيح أبي داود رقم: (١٤٢) و (١٤٤) .

کەوابوو بۆ ڕۆژووان دروست نی‌یە قەترە بکاتە لووتی ئەگەر بگاتە گەروو یان قورگی، وە ئەگەر نەگاتە قورگی یان گەرووی ئەوە ڕۆژوو ناشکێنێت.

بەڵام قەترەی چاو و چاوڕەشتن و قەترەی گویٚ ئەوا ڕۆژوو ناشکێنن، چونکە بەڵگەی لەسەر نەهاتووە بە تایبەت و هیچ دەقێکیش نەهاتووە بیانگرێتەوە ، هەروەها چاو دەرگا و کونێك نی‌یە بۆ خواردن و خواردنەوە، هەروەها گوێچکەش.

زانایان وتویانە: ئەگەر مرۆڤ هەردوو پێی بەشتێك چەور بکات تامی ئەو شتەش لە قورگی دا هەست پیٚ بکات ڕۆژووەکەی ناشکێت، چونکە دەرگای چوونە ژوورەوەی خواردن نی‌یە، کەوابوو ئەگەر کل بکاتە چاووی یان قەترە بکاتە چاووی یان گوێی ڕۆژووەکەی ناشکێت ئەگەر لە قورگیدا هەست بەتامی نەکات .

هەروەها خۆی چەورکات بە ڕۆنێك بۆ چارەسەری یان بۆ مەبەستی چارەسەریش نەبێت هیچ زیانێکی نی‌یە، یان ئەگەر هەناسەی کورت بێت ئەتوانێت (بەخاخ) بەکاربهێنێت بۆ ئاسانکردنی هەناسەی ئەوە ڕۆژوو

ناشکێنێت، چونکە ناگاتە گەرووی، وە خـواردن و خواردنـەوەش نـىیـە، والله أعلم[١٧] .

**پ٨٦/ پرسـیار کـرا لـە شـێخ صـالح الفـوزان ئایـا بـۆ ڕۆژووان دروستە (معجون)ی ددان بەکاربهێنێت لە ڕۆژەکانی ڕەمەزاندا؟**

لە وەڵامدا دەفەرموێت: بەڵێ بۆ ڕۆژووان دروستە بەکاری بهێنێت لەگـەڵ ئاگاداریدا کە هەندێك لەو گیراوەیە بچێتە ناو قورگیەوە، سوننەتە دانـەکانی پاك بکاتەوە بە سیواك و شتی تر جگە لە سیواك، بە شتانێك نەگاتە قـورگی، هەروەها دروستە ئاو هەڵدات بـە دەمیـدا بـۆ دەسـت نوێـژ بەمـەرجێك زیـادە ڕەووی نەکات بۆ ئەوەی نەچێتە ژوورەوە[١٨] .

---

[١٧] **بڕوانە**: فتاوى رمضان: (٢ / ٥١١) .

[١٨] **بڕوانە**: فتاوى رمضان: (٢ / ٤٩٦) .

**پ٨٧/ پرسـیار كـراوە لـە شـێخ** محمد بن صالح العثمين **(ڕەحمـەتی خوای لێ بێت) دەربارەی غوسڵی لەشگرانی دوای دەركـەوتنی فـەجر بۆ ڕۆژووان؟**

لە وەڵامدا فەرموویەتی: ئەڵێین دروستە و ڕۆژووەكەشی تەواوە، چـونكە هیچ گوناهی تێدا نی‌یە كەسی ڕۆژووان دەست بە ڕۆژووگرتن بكات لە كاتێكدا لەشی گران بێت با فەجریش دەركەوێت، بەڵێ هیچی لەسـەر نـی‌یـە و پاشـان خۆی دەشوات، بۆ لەشـگرانی پێغەمبـەر (ﷺ) فـەجری بەسـەردا دەهـات لـە كاتێكدا لەشی گرانبوو لە خێزانەكانی ئەنجا خوسڵی دەكـرد و ڕۆژووەكەشـی بەسەر دەبرد.

ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كردوویەتی گومانی تێدا نی‌یە دروستە بـۆ ئێمـەش، چـونكە ڕابـەر و سەرمەشـقی ئێمەیـە، هـەر شـتێك ئـەو بیكـات موسوڵمانان شوێنكەوتەی ئەون لەو شتەدا مەگـەر بەڵگـە تایبـەتی بكـات بـە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) [١٩].

---

[١٩] **بڕوانە** : فتاوى رمضان : (٢ / ٥٤٧) .

**پ٨٨/ ئایا ڕۆژووی شەش ڕۆژی مانگی شەوال پێویستە ڕاستەوخۆ دوای ڕۆژی چەژنی ڕەمەزان بگیرێت یان دەتوانرێت چەند ڕۆژێك دوای جەژن ئەنجام بدرێت بەیەکەوە واتە یەك لەدوای یەك؟**

**وەڵام** / واجب نی‌یە ڕاستەوخۆ دوای ڕۆژی جەژن ئەنجام بدرێت، بەڵکو دروستە دوای جەژن بە ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێك لەسەر یەك (مُتتالي) یان بە لە یەك جیا (متفرق) لە مانگی (شەوال)دا بگرێت چۆن بۆی ڕێککەوت، مەسەلەکە فراوانە، ئەنجا حوکمی سوننەتە واجب نی‌یە[٢٠].

**پ٨٩/ دکتۆرەکان دەڵێن : کەمخواردن جنس زیاد دەکات لەکاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت (من استطاع منكم الباءة فليتزوج ....) چۆن قسەی زاناکان و خوای گەورە لێك دەدەنەوە؟**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

دەقی (من استطاع منكم الباءة فليتزوج ومن لم يستطع فعليه بالصوم...) فەرموودەیەکی (صحيح)ە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم نەك وتەی

---

[٢٠] **بڕوانە** : فتاوی رمضان : (٢ / ٦٩٣) .

خـوای گـەورە بێـت ، بەهـەر حـاڵ وتەیـەکی ڕاسـت و دروسـتە دەبـێ وەك موسوڵمان باوەڕمان پێی هەبێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە شتێکی واقعـی یـە زۆر خـواردن ئـارەزووی سێکسـی لـە مرۆڤـدا زیـاد دەکـات ، مەبەسـتیش ئارەزووی خراپ واتە حەزکردن لەحەرام ، واتـە حـەز و ئارەزوویـەك کۆنترۆڵ نەکرێت بۆیە زانایان وتویانە (من ضبط بطنـه ضـبط دينـه) واتـە : هەرکـەس سکی خۆی کۆك بکات دینی خۆی کوك کردووە .

یان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : (ما ملأ ابن آدم وعـاءً شراً من بطنه ) واتە ئادەمیزاد هـیچ دەفرێکـی پـڕ نـەکردووە خـراپتر بێـت لـە سکی .

ئەنجا من ئـەڵێم بـۆ کەسـێك هەیـە نـەزانێت زۆر خـواردن خراپـە و ئـارەزووی خراپی سێکس زیاد دەکات ئەی قسەی دکتۆرەکان چی ؟ ئەگەر مەبەسـتیان ئەوە بێت مرۆڤی کەمخۆر توانای سێکسی ڕێك و بەهێز دەبێت ئێمەش ئەڵێین ڕاستە کەوابوو جیاوازی لەوەدایە زۆر خۆری ئارەزووی بێ سەرو بەر و خـراپ دروست دەکات هەر وەك چۆن بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردەیـە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی کردووە بە ژن هێنان ، کـەوابوو ئـاینی پـیرۆزی ئیسلام سێکسی دروست نـامرێنێ ، بـەڵام ئـەو سێکسـەی زیـان بـەخش بێـت

چارەسەری دەکات ئەوەش بزانە نە ئیسلام و نە دکتۆرەکان ناڵێن ئەوەندە کەم بخورێت لە ئاستی سروشتی دابەزێت ، کەوابوو وتەی دکتۆرەکان باس لە خواردنی سروشتی دەکات ئەوەی کە مرۆڤ پێویستی پێیەتی ئیسلامیش ئەوە قەدەغە دەکات کە لەو ئاستە زیاترە ئەوەش لەبەر ئەوەیە مرۆڤ حەز و ئارەزووی نارێکی بۆ دروست دەبێت .

**پ٩٠/ ئایا دروستە ژن و پیاو ئەندامی زاوزێی یەکتر بمژن و بیلیّسنەوە؟ وە ئایا خواردنی مەنی پیاو دروستە وە ئایا پاکە؟وەئایا دروستە مەمکی خێزانت بمژی یان شیرەکەی بخۆی؟**

**وەڵام :**

**مەسەلەی مژین یان لێسینەوەی ئەندامی نێرینە بۆ ئافرەت وە بە پێچەوانەوە ئەڵێم:**

**بەداخەوە هەموو ئەوەی ئێمە زانیومانە لەشارستانی ڕۆژئاوا ئەوەیە کە فیترەت لەناوبدرێ و دژی کار بکرێت وە بەدوای ئەوانەدا بگەڕێن کە قەدەغە و کارێکی زیانبەخشە لەهەواو ئارەزوو چێژ وەرگرتن ی نادروست لە ژێر دروشمی ئازادی و سەربەستی مرۆڤ ، ئێمەی موسڵمانیش بەنەزانیەوە لەهەمو شتێکدا لاساییان دەکەینەوە وەك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ :** (لتتبعن سننَ من قبلكم شبرًا بشبرٍ ، وذراعًا بذراعٍ ، حتى لو سلكوا جحرَ ضبّ لسلكتموه . قلْنا : يا رسولَ اللهِ ، اليهودُ والنصارى ؟ قال : فمن) البخاري

.

**واتە " شوێن ڕێچکەو ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان ئەکەون بست بە بست و باڵ بە باڵ بەشێوەیەك ئەگەر هاتو ڕۆشتنە کونی بزن مژەکێکەوە شوێنیان**

دەکەون " ، فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستت گاور و خاچ پەرستانە ؟ فەرمووی : " ئەی کێم مەبەستە ؟ "

جا بۆ ئەم بابەتەی خۆمان ئێمەی موسڵمان لە فەرهەنگ و کەلتور و تێگەشتنی پێشینانمان بۆ قورئان و سوننەت شتی وامان نەبووە هەرگیز ڕەوشتی موسڵمانان بەژن و پیاوەوە لەوە بەرزتر بووە لە هیچ سەردەمێکدا لە مێژووی ئیسلام موسڵمانان حەوەجێیان بەشتی وا نەکەوتووە لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمەشتێکی نامۆیە و دوورە لە ئاکاری ئیسلامی بەڵکو خوای گەورە فەرمان پێ دەکات بەو جێگایەی کە خوا خۆی فەرمانی پێ کردووە وەك دەفەرموێ: ﴿ **فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ** ﴾ (٢٢٢) سورة البقرة .

واتە : جا کاتێك پاك و خاوێن بوونەوە و خۆیان شت بچنە لایان بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی داوە . مەبەستی ئەم بڕگەیە (بەو شێوەیەی کەخوا فەرمانی داوە) سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وە تێگەشتنی هاوەڵان و پێشەوایانی ئیسلام ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ئەم کارەی تیا نەبووە بەڵکو شوێنی تایبەت بۆ چونە لای ئافرەت ئەوەیە کە خوا دیاری کردوە بۆیە ئیمامی قرطبي لەتەفسیرەکەیدا ئەفەرموێ : (**وذكر الحرث يدل على أن الإتيان في غير المأتي محرّم**) بەرگی ٣ لاپەڕە ٩٣ – واتە :

باسکردنی کێڵگە لە ئایەتەکەدا کە دەفەرموێ : ﴿ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾ (٢٢٣) سورة البقرة

واتە : جا بەهەرشێوەیەك دەتانەوێت تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە ئەوە بەڵگەیە کە چونە لای ئافرەت جگە لە شوێنی تایبەت حەرامە .

ئەمە وەکو تێگەشتن و کاری موسڵمانان لە مێژووی ئیسلامدا ئەمما وەکو خودی ئەو کارە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای پسپۆڕان لە زانایانی پزیشکی چونکە ئەگەر زیانی هەبوو بەئافرەتەکە یان بە پیاوەکە یان بەهەردووکیان ئەوکاتە حەرام دەبێت چونکەپێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ : (**لا ضرر ولا ضرار**)أخرجه مالك والحاكم والبيهقي والدارقطني وابن ماجه وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجه . **واتە : زیان گەیاندن بە غەیر دروست نییە لەسەرەتا، وە دروستیش نییە زیان بە زیان وەڵام بدەیتەوە .**

ئەمەش پێویستە پسپۆڕان دیراسەی بکەن بزانن زیانی لێ دەکەوێتەوە یان نا چونکە بەڕاستی ئەگەر شتێکی باش بوایە قورئان و سوننەت باسیان دەکرد یان هاوەڵان دەیانکرد یان ئەگەر حەڵاڵ بوایە لە مێژووی موسڵماناندا شتێکی باو دەبوو ئەوەش بزانە چەندین لێکۆڵینەوە و دیراسات هەن کە هەندێ نەخۆشی هەن هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ (سێکسی دەم) (الجنس الفموی)

بۆ نموونە : دیراسەیەکی فەرەنسی ئەوەی سەلماندوە کە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان (وەرەم سەرەتان) و سێکسی دەمدا ئەو دیراسەیە ئەوەشی ئاشکراکردووە بەبەڵگەی بەهێز کە پەیوەندی توند هەیە لە نێوان خانەی سەرەتانی لەدەمدا لەگەڵ ئەنجامدانی ئەو کارە قێزەونە لە فیترەتی مرۆڤدا ، و دەمێکە زانایان گومانیان بۆ ئەوە دەچێ کە پەیوەندی لە نێوان جنسی دەم بە هۆی گواستنەوەی (ڤایرۆس)ە وە بۆ منداڵدان کە دەبێتە سەرەتانی منداڵەکە ئەو (ڤایرۆس)ە ش ناسراوە بە (ئێچ پی ڤی) وە ئەگەری جۆری تر لەسەرەتان، وە گۆڤاری (نیوسنستف)ی زانستی تایبەت لەم بوارەدا یەکێك لە بارترین ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی تۆمار کردووە کە ئەمە کورتەکەیەتی : (سێکسی دەم لەوانەیە مرۆڤ دوچاری شێرپەنجەی دەم بکات بە ئاماژەکردن بە دیراسە و لێکۆڵینەوەیەك ئەنجامدراوە لەسەر نزیکەی – ١٦٠٠– هەزارو شەش سەد کەس نەخۆش توشبوو بە شێرپەنجەی دەم لە ئەوروپا و کەنەدا و ئوستralیا و سودان وکوبا بەراورد لەگەڵ –١٧٠٠– کەس لەوانەی لەش ساغن لەئەنجامدا لێکۆڵەرەوەکان لە وەکالەی نێو دەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە نەخۆشی (سرطان) ئەوەیان دەستکەوتووە و دۆزیوەتەوە لە شاری –لیون– لەفەرەنسا کە بوونی رێژەی جۆرێك لە جۆرەکانی ڤایرۆس ناسراو بە hpv لای ئەو نەخۆشانەی کەشێرپەنجەی

دەمیان هەیە ئەوانەی سێکسی دەم بەکاردەهێنن زیاترە لە سێ بەرامبەر بەوانەی ئەو جۆرە سێکسە بەکارناهێنن )

وە هەمان گۆڤار ئەوەی تۆمار کردووە کە ئەم جۆرەڤایرۆسە کە ناسراوە بە (HPV16) لای کەسانی لەش ساغ نییە . هەروەها گۆڤاری بەریتانی ئەوەی ئاشکرا کردووە کەلێکۆڵەرەوەکان لەو بڕوایەدان کە (مژینی ئەندامی پیاو) و لێسینەوەی ئەندامی زاوزێی ژن لەوانەیە ئەنجامدارەکانی دوچاری (وەرەم) بکات لە دەمدا . (رائیل فنیری) پسپۆڕ لە ڤایرۆس و یەکێکە لە هاوکارانی ئەم دیراسەیە ئەڵێ : هاوڕێیان و هاوکارانم گەشتونەتە ئەو قەناعەتەی کە ئەو دیراسەتەی کردوویانە هەموو مرۆڤەکان قایل دەکات بە ئەنجامەکەی .

جا لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت پێویستە لەسەر موسڵمانان لە خوابترسن و شوێنی هەنگاوەکانی گاور و جولەکە نەکەون وە پێویستە شوێنی فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وە تێگەشتنی هاوەڵان بکەون .

وە ئەو بڕگەیەی کە دەڵێ ئایا پاکە ؟ ئەگەر مەبەست لە خودی ئەندامەکان بێت ئەوە پاکە بەڵام ئەو شتانەی لەو دوو ئەندامەوە دەردەچن زانایان ئەڵێن هەموو ئەو شتانەی لە ئەندامی ئافرەتەوە دەرئەچێ دروست نیە دەمی پێوە بدرێت بەڵام بۆ ئاو (منی) پیاو زانایان ڕاو بۆچونی جیاوازیان هەیە ڕای

پەسەند ئەوەیە دروست نییە بۆ مەسەلەی خواردنی (مەنی)پیاوەکە هەندێ لەزانایان خودی ئاوەکە بە پاك دادەنەن – دوو ڕای جیاواز هەیە ئەوەی کە دروست و بەناوبانگە ئەوەیە کە دروست نیە (ئاوی پیاو) بوخورێتەوە . بروانە کتێبی المجموع هی ئیمامی نەوەوی لە زانایانی شافعی مەزهەب .

وە بۆ مەسەلەی مەمك مژینی ئافرەت دروستە هیچ ڕیگرێکمان نیە بۆ قەدەغەکردنی بەڵام نابێت زیادەڕەوی تیا بکرێت وە ئازاری ئافرەتەکە بدرێت بەوەی برینداری بکات وە خوێنی برینەکە بخوات ، و پێویستە لەسەر پیاوان خۆیان بەدوور بگرن لەو سێکسانەی لە ئاستی پیاوەتی دایان دەبەزێنێ ، و نابێ لەشیری مەمکی خێزانەکەی بخوات ، و ئەگەر ئەندازەیەکی کەم ڕۆشتە دەمی پیاوەکەوە ئەوە هیچ شتێك ڕونادات ، بەڵام وا چاکترە موسڵمانان خۆیان لەم جۆرە زیادەڕەویانە بپارێزن.

## پ٩١/ ئایا جووت بوون لەگەڵ خێزانی خۆت لەکاتی عادەی مانگانە تاوانە؟

**وەڵام :**

جووت بوون لەگەڵ ئافرەت لەکاتی عادەی مانگانە تاوانە و کارێکی خراپە یەکێکە لەتاوانە گەورەکان خوای گەورە دەفەرموێ : [وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ

قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ]**سورەتی** البقرة **ئایەتی** ٢٢٢ .

**پێغەمبەری خوا فەرموویەتی :** (إصنعوا كل شيءٍ إلا النكاح) رواه الجماعة إلا البخاري وفي لفظ (إلا الجماع) **وە ئەفەرمویٚ :** (من أتى حائضاً أو امرأة في دبرها أو كاهناً فقد كفر بما أنزل على محمد) رواه الترمذي و أبو داود وابن ماجه وغيرهم وصححه الألباني . **واتە : هەر کەسێك بچێتە لای ژنەکەی لە کاتی حەیزدا ، یان لە کونی دواوە ، یان بچێت بۆ لای جادووبازێك و قسەکەی بە ڕاست بخاتەوە ، ئەوا کوفری کردووە و بێباوەڕ بووە بەوەی کە دابەزیوەتە سەر (محمد** صلى الله عليه وسلم) .

**واتە : کوفری بچووك ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تاوانێکی گەورەیە کەوابوو هەرکەسێ بەئەنقەست و بزانێت حەرامەو ئەو کارە بکات ، ئەوە تاوانێکی گەورەی کردووە پێویستە تەوبەی لێ بکات و ئەبێت** (كفارة)**ەکەی بدات ، کە بریتی یە لە یەك دیناری زێڕ ئەگەر لە پێشەکی بێ نوێژییەوە بوو وەئەگەر لە کۆتایی بێ نوێژییەوە بوو نیو دیناری زێڕ . ابن عباس خوای لێ ڕازی بێ ئەم حوکمەمان لە پێغەمبەرەوە** صلى الله عليه وسلم **دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی :** (يتصدق بدينار أو نصف دينار) رواه أبو داود و النسائي وابن ماجه و صححه الألباني .

ئەوەی کە وتمان ئەگەر لەپێشەکی بێ نوێژییەوە بوو یان لە کۆتایی لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی : (إن أصابها في فور الدم تصدق بدينار وإن كان في آخره فنصف دينار) صحيح . بڕوانە کتێبی الإرواء (٢٠٢) .

ڕوونکردنەوە : یەك دینار زێڕ واتە : پێنج گرام ئاڵتون .

بۆ ئەوەی بزانین پێنج گرام چەنێك پارە دەكات پێویستە X٥ نرخی یەك گرام ئاڵتون بکەین = ئەو پارەیەی کە پێویستە بدرێت بە هەژاران لە بری کەفارەتی کردنی ئەم تاوانە.

**پ٩٢/ حوکمی صیغە یان هاوسەرێتی بۆ ماوەیەکی کەم چییە؟ بە دەلیلی شەرعی و عەقڵی وەڵامم بدەنەوە جزاكم الله خيرا:**

**وەڵام :**

زەواجی سیغە یان کاتی زانایان پێناسەیان کردووە بەم شێوەیە کە بریتیە لە : (زەواجی کات بۆ دانراو بە زەمانێکی زانراو یان نەزانراو کە کۆتایەکەی ٤٥ ڕۆژە کە ئەو زەواجەیە هەڵدەوەشێتەوە بۆ ئەو ئافرەتانەی حەیزیان نەماوە بەو کاتە وە بە دوو حەیز بۆ ئەو ئافرەتانەی دەکەونە حەیزەوە وە چوارمانگ و دەڕۆژ بۆ ئەو ئافرەتانەی (سیغە)کرابن ، بەڵام پیاوەکانیان بمرن حوکمی ئەم زەواجە تەنها ئەو مارەیەی پێ دەدرێت کە بەمەرج گیراوە وە

هیچ نەفەقەیەکی نادرێتێ و نـە مـیرات وەردەگرێـت وە نـە لێـی دەگیرێـت وە هیچ عیدەیەکی نی یە ئەو چوار مانگ و دەڕۆژە نەبێت وە بـەو زەواجـە هـیچ خزمایەتیەك جێگیرنابێت و خزمایەتی ژن و ژنخوازی پێ جێگیر نابێت)

حوکمی ئەم زەواجە ئەوەیە کە زۆربەی زانایانی ئیسلام بە حـەرامیان دانـاوە بەبەڵگەی :

**یەکەم** خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (*) إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (*) فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ﴾المؤمنون ٥-٧

دووەم :حەدیسی ئیمامی موسلیم کە (سبره)الجهینی ئەڵێ : پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی : (يا أيها الناس اني قد كنت أذنت لكم في الاستمتاع من النساء وإن الله حرّم ذلك إلى يوم القيامة فمن كان عنده منهن شيءٌفليخل سبيله ولا تأخذ مما آتيتموهن شيئاً)رقم ٣٤٠٨

کەوا بوو ئەم زەواجە شتێکی خراپ و حەرامە و با چیتر ئافرەتان نەکرێن بـە کاڵا و بۆ کاتێکی کەم بۆ تێرکردنـی ئارەزووەکـان کـڕین و فرۆشـتنیان پێـوە بکرێت .

**پ٩٣/ مـن لايـەنی جنسـيم لاوازە ئايـا بـەکارهێنانی حـەب و دەرمان بۆ بەهێزکردنی لایەنی جنسی تاوانە یان نا؟**

**وەڵام :**

خواردنی داو و دەرمـان بـۆ بـەهێزکردنی ئاسـتی سێکسـی ئەگـەر بـۆ حـەڵاڵ بـەکاربێت و ئـەو دەرمانانـەش زیانبـەخش نـەبن ئـەوا دروسـتە و هۆکـارێکی پزیشکی یە ، بەڵام ئەگەر ئەو مەرجانەی تێدا نەبێت ئەوا دروست نیە .

**پ٩٤/ ئايـا چ جۆرە هەڵسوکەوتێکی سێکسـی حەرامـە لەگـەڵ هاوسەری خۆتدا.**

**وەڵام :**

لەو هەڵسوکەوتە سێکسی یانەی لەگەڵ خێزاندا حەرامە :

یەکەم : جووتبوون لەگەڵ خێزاندا لە پاشـەوە ئەمـەش لەبەرفـەرمودەی (ابو هريرة) لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی : (لا ينظر الله إلى رجل جامع امراته في دبرها)رواه أبوداود وابن ماجه وصححه الألباني انظر صحيح سنن ابن ماجه ١٥٦٠ .

**واتە : خوای گەورە تەماشای ئەو پیاوە ناکات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جوتببێت لە پاشەوە .**

**دووەم : چونە لای هاوسەر لە کاتی خوێنی حەیز و زەیستاندا بە بەڵگەی فەرموودەی أبو هريرە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی :** (من أتى حائضاً او امرأة في دبرها أو كاهناً فصدّقه بما يقول فقد كفر بما انزل على محمد) رواه أحمد والترمذي وابن ماجه برقم ٦٣٩ وصححه الشيخ الألباني في الإرواء برقم ٢٠٠٦ .

**واتە هەر کەس بچێتە لای هاوسەری خۆی لە کاتی حەیز دا یان لە پاشەوە یان سەردانی فاڵچییەك بکات و باوەڕ بە قسەکانی بکات ئەوە بێ باوەڕ بووە بە (قورئان) ئەوەی بەسەر (محمد) دا صلى الله عليه وسلم دابەزیوە .**

**پ٩٥/ ئایا هیچ ڕێگایەك هەیە کە بەدیلی جووت بوون بێت لەکاتی حەیزدا؟دەزانم کە جووتبوون حەرامە لەکاتی حەیزدا خوا یار و یاوەرتان بێت بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەو گوناهانەی کە زۆر کەس نایزانیٚ کە گوناحە.**

**وەڵام :**

ئەگەر ئافرەت لە حەیزدا بوو وا چاکترە ئەو ماوەیە پیاو لێی دووربکەوێتەوە بەبەڵگەی ئەم ئایەتە : {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ} (٢٢٢) سورة البقرة

واتە :پرسیارت لیٚ دەکەن دەربارەی عادەتی مانگانەی ئافرەت پێیان بڵێ : ئەوە ئازار و زەرەرە کەوابوو خۆتان بەدووربگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاك دەبنەوە جا کاتێك پاك و خاوێن بوونەوە و خۆیان شت بچنە لایان بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی داوە .

دروستیشە هەموو یارییەکی لەگەڵ بکات بەمەرجیٚ جیماعی لەگەڵ نەکات بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە و چەندین فەرموودەی تر (إصنعوا کُلَّ شيء إلا النکاح) واتە : دروستە هەموو شتێکی لەگەڵ بکەن جیماع نەبێت هەروەها لە

پاشەوە بەبەڵگەی تر قەدەغەکراوە وەك دەفەرمویٚ : (من أتـى حائضاً فقـد كفر ومن أتـى امـراة في دبرهـا فقـد كفـر...) هـەروەها سێكسـی دەم (الجـنس الفموي)یش حەرامە لەبەر زیان و پیسێتی ئەو كارە .

**پ٩٦/ بەڕێزان تكاتان لێدەكەم كە وەڵامم بدەنەوە...من مێـردم هەیە بەس قەت خۆشیم لیٚ نەبینیوە زۆریش هەوڵم داوە لەگەڵی باش نابێت ، زۆر جار بە زۆری خۆم دێت بۆ لام ،من ئێستە خۆشم ناوێـت و كوڕێكی تـرم خـۆش ئـەوێت . ئایـا گونـاهی مـن چیە؟ مـن ئەمـەویٚ وازی لێبهێنم دوو منداڵیشم هەیە ...تكاتـان لێدەكـەم وەڵامـم بدەنـەوە ...**

**وەڵام :**

حیكمەت لـە هاوسـەرگیری و ژن و مێـرد دروسـتكردنی ژیـانی خۆشـبەختی و خۆشەویسـتی و ئارامیـە لـە نێـوان ژن و مێـردا پاشـان وەك قوتابخانەیـە بـۆ پەروەردەكردنی و فێركردنی ئەو ساوایانەی دەكەونـە ژێـر ڕكێفـی دایكـان و باوكانەوە ، جا پێویستە نە پیاو نە ژن خیانەت لەیـەك نەكـەن و ڕاسـتگۆ بـن لەگەڵ یەكدا و هەردووكیان پێشەنگ بن لە چاكێتی دا ، بەڵام ئەگەر نـەتوانرا لەگەڵ یەكـدا ژیـان بەسـەر ببرێـت ئـەوا دەبێـت ئـەو ڕێگـە چارانەی ئیسـلام

دایناون بۆ چاککردنی نێوان ژن و پیاو لەکاتی کێشـەدا بیگرنـه بـەر ، ئەگـەر هەر سوودی نەبوو دەتوانن لەیەك جودا ببنەوە و هیچیان زوڵـم لـەوی تریـان نەکات ، ئەوەی لە پرسیارەکە بەدی دەکرێـت هـەردوولاتان هەڵـە و تاوانتـان کردووە جا ئەگەر دەتەوێ چارەسەری دروست وەرگریت ئەوەیـە یـان نێـوان خۆت و مێردەکەت چاك بێت یان جودا بوونەوە ، ئەنجا هاوسـەرێتی شـەرعی لەگەڵ کەسی تردا نەك ئەوەی باستکردووە ئەوە حەرامە و وازی لێ بێنە .

**پ۹۷/ لـەدوای مردنـی مێردەکـەم دروسـتە شـوو بکـەم بـە بـرای مێردەکەم؟ ئایا ئەمە نابێتە هۆی ناشرین کردنی کەلتوری موسڵمانان**

**وەڵام :**

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

مێردن کـردن بەکەسـانی نامـەحرەم واتـە کەسـانێك کـە بـرا و بـاوك و مـام و باپیرە و برازا و خوشکەزا ئەمانـە نـەبێت دروسـتە جـا بـرای هاوسـەر هـەمان حوکمی هاوسەری هەیە چۆن پێشتر دروست بـوو مێـردی پـێ بکرێـت ئـاواش دروســتە ئێســتا مێــرد بکرێــت بــە براکــەی ئەمــە کــارێکی دروســتە و هــیچ ناشــرینکردنی کــەلتوری ئیســلام نیــەو بەڵگــەی شــەرعی و واقعــیش ئەمــە دەسەلمێنێت .

## پ٩٨/ ئایـا زەواج لــە نێــوان کچــێکی موســڵمان و کــوڕێکی مەسیحی دا حەرامە؟

**وەڵام :**

مێرد کردنی کچی موسڵمان بە کوڕی مەسیحی دروست نیە ، یەکەم لەبەر ئەوەی ژنهێنان لێیان بەڵگەی لەسەرە کە خوای گەورە دەفەرموێ : { وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ } وە لەبەر ئەوەی ژنان زۆر جار دێنە سەر ئاینی پیاوەکانیان وەکاتێ ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەمەی حەلاڵکردووە حیکمەتی ئەوەشی تیادایە هەندێك دیوار و بەربەست لە نێوان ئەهلی کیتاب و موسڵماناندا هەن نەمێنێت ، چونکە بە هۆی ژن لێ مارە کردنیان تێکەڵاوی و نزیکبوونەوە خێزانەکان ڕوو دەدات ئەمەش ئوسلوبێکە لە ئوسلوبەکانی بانگ کردنیان بۆ ڕێنمایی و دینی خوا ، بەڵام ژن پێدانیان دەبێتە هۆی لەناوچوونی ئەو کچە و ئەگەری هەڵگەڕانەوەی ئەو کچە وەك وتمان ئافرەتان شوێنکەوتەی پیاوەکانیانن زۆر جار ، جا هەر پیاوێ ترسا شوێنی ژنە مەسیحیەکەی بکەوێت مەکروهە یان دروست نیە بۆی ئەو کارە بکات .

**پ٩٩/ من کوڕێکم خۆش دەوێت بەڕاستی و لەناخی دڵەوە ئەویش وایە مەبەستمان زەواجە زۆر ڕاستین لەگەڵ یەك ئایا گوناهبار دەبین؟**

**وەڵام :**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**خۆشەویستی جۆری زۆرە باشترینیان ئەوەیە لەبەر خوا بێت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ :** (من أحب لله وأبغض وأعطى لله ومنع لله فقد استكمل الإيمان) **واتە : هەرکەس کەس و شتی خۆش بوێت و ڕقی بێتەوە لەبەر خوا وە ببەخشێ و دەست بگرێتەوە لەبەر خوا ئەوە ئیمانی تەواو بووە.**

بەلاّم خۆشەویستی کردن کە بریتی بێ لە پەیوەندی ، دروست نییە و تووش بوون پێی کارێکی خراپەو مرۆڤ دوچاری چەندین کێشەی کۆمەلاّیەتی و دەروونی گەورە دەکات ، بەلاّم کەسێك کوڕ بێت یان کچ ویستی بەرامبەرەکەی بخوازێت واتە مارە بکات ئەوە دەتوانێت تەماشای بکات و سەرنجی بدات بەمەبەستی هاوسەرگیری ئەو کاتە ئەگەر خۆشی ویست قەیدی ناکات بەڵکو خۆشەویستی دەبێتە بەشێك لە ژیانیان ئەمەش نابێت وەکو پەیوەندییەك بێت وە نابێ زۆر بخایەنێت ، چونکە دەرگای خراپەی پێ

دەکرێتەوە بەڵکو دوای تەماشا کردن ڕاستەوخۆ داوای بکات لە ماڵی باوکی و ئەگـەر درا ئـەوە باشـە و ئەگـەر نـەکرا ئـەوە نابێـت تەماشـای بکاتـەوە و پەیوەندی لەگەڵ بمێنێت ، لەپرسیاری ئـەم بـەڕێزە ئـەوە بـەدی دەکـەم کـە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە بەڵام وەك خۆیان ئەڵێن مەبەستمان زەواجـە جـا لەبەر بوونی پەیوەندی و مانەوە لەسەر ئەو حاڵەتە بەبێ داواکردن لە کەس و کاری کچەکە بێ گومان تووشی حەرام دەبن .

**پ١٠٠/ ئەگەر کەسێك تەڵاق بخوات لە حاڵەتی توڕەییدا و بڵـێ : تەڵاقم کەوتبێ شیری مانگاکەتان ناخۆم بەڵام خاوەن مانگاکە ئێستا مـەڕی کڕیـوە ئایـا ئەگـەر شـیری مانگـاو مەڕەکـە تێکـەڵ بکـرێ پاشـان بکرێـت بـە ماسـتاو ئایـا ئەگـەر لـەو ماسـتاوە بخـوات تەڵاقەکـەی دەکەوێت ؟**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

تـەڵاق خـواردن لـەکاتی تـوڕەیی دا سـێ حاڵـەتی هەیـە وەکـو (ابـن القـیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێ باسی کردووە .

یەکەم : تورِە بونێك کە خۆی نەزانێت چی گوتووە ، کە دەگاتە قۆناغی (إغلاق) لەم حاڵەتەدا تەلاّقی ناکەوێت .

دووەم : تورِە بونێك کە پێشەکی تورِە بونە و خۆی بەئەنقەست و ویستی خۆی تەلاّق دەخوات ئەم جۆرەیان تەلاّقی پێ دەکەوێت .

سێ یەم : تورِە بونێك کە نەگاتە جۆری یەکەم و دووەمیش نەبێت بەڵکو تەلاّقێك بە دەمیدا بێت لە تورِەییدا کە مەبەستی نیە ، بەلاّم تورِەیی وای لێ دەکات . ئەم جۆرە زانایان رِای جیاوازیان تێدا هەیە ، وە رِای پەسەند ئەوەیە کە تەلاّق لەم حاڵەتەدا ناکەوێت ئەمە لە بارەی تورِەییەوە لە تەلاّقدا بە گشتی . ئەمما بەستنەوەی تەلاّق بە کردن یان نەکردنی شتێکەوە ئەوە پێی دەگوترێت (**طلاق التعليق**) ئەمەش زانایان کردوویانە بە دوو بەشەوە :

**یەکەم** : **التعليق القسمي** : بریتی یە لەو تەلاّقەی ئەو کەتەلاّقەکەی دەبەستێت بە شتێکەوە وە تەنها مەبەستی کردن یان نەکردنی شتەکەیە بەبێ ئەوەی مەبەستی تەلاّق خستنی ژنەکەی هەبێت تەنها وەکو سوێندێك دەیکات ، ئەمەش رِای زانایان لەسەری جیاوازە ، بەلاّم رِای پەسەند بە لای زانایان (ابن تيميه و ابن القيم) و کۆمەڵێکی تر لە زانایان تەلاّقی ناکەوێت .

**دووەم** : **التعليـق الشـرطي** : کـە بـریتی یـە لـە تـەلاقی کەسـێك تەلاقەکـەی دەبەستێت بە کردن یان نەکردنی شتێکەوە لەگەڵ ئەوەشـدا مـەرجی دانـاوە کە تەلاقی لە ژنەکەی بکەوێت لەکاتی ڕوودانی پێچـەوانەی خواسـتەکەی ئـەو ئەم بەشەیان زانایان ئەڵێن یەك تەلاقی پێ ئەکەوێت .

جا وەڵام بۆ پرسیارەکەت ئەوەیە با توڕەبونی خۆی لە یەکێك لەو سێ جۆرە دەست نیشان بکات ، ئەگەر ئەوەیان بوو کە تەلاقی پێ دەکـەوێت ئـەنجا بـا لە بەشەکانی (**طلاق التعليق**) دا خۆی بدۆزێتەوە ، وە ئایا لە کاتی خـواردنی تەلاقەکە نیازی تەلاقدانی خێزانی هەبووە ئەگەر هـەیبوبێ ئـەوا یـەك تـەلاقی دەکـەوێت هەرچـەندە تـەلاقی وتبێـت ، ئەگـەر نـەیبوبێ ئـەوا ئەگـەر ئـەو خواردنەی خوارد کە سوێندی لەسەر خـواردووە ئـەبێت کـەفارەتی سـوێندێك بدات کە بریتی یە لە ناندانی (دە) هەژار کە دەگاتـە نزیکـەی (دوانـزە) کیلـۆ گرام برنج یان گەنم .

**پ١٠١/ سەرەتا سلاو ڕێزم هەیە بۆتان من پرسیارەکەم ئەمەیە:**

**ئایـە لەشـەرعی ئیسـلام زەواج مسـیار هەیـە .ئەگـەر نیـە ئەوانـەی ئـەو**

زەواجەیان کردوە تاوانەکەیان چیە؟ وە ئەگەر هەیە چۆنە دووبارە

سلاو ڕێزم هەیە .

وەلام :

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

زەواجی مسیار یەکێکە لەو زەواجانەوەی لەم سەردەمەدا پەیدا بووە و پێشتر لە ناو موسوڵمانانەدا نەبووە ، ئەسڵی وشەکە دەگەڕێتەوە بۆ (سیر) واتە : ڕۆشتن بەمانای ئەوەی مێردەکە بەبەردەوامی لای ژنەکە نەبێت هەرکات ڕێی کەوتە ماڵی ژنەکە دەچێت بۆ لای هۆکاریش بۆ دروست بوونی ئەم زەواجە زۆرن لەوانە :

١- زۆربوونی ڕێژەی ئافرەتان لە کۆمەڵگادا .

٢- کارنەکردن بە هاوسەرگیری ئیسلامی و لەبەرچاوگرتنی تەنها مەرجی جوانی بۆ ئافرەتان یان هەبوونی پلەوپایە و بڕوانامە و سامانی دونیا .

٣- گرانکردنی مارەیی ئافرەتان و گرنگی دان بە ماڵ و باڵەخانە و زێڕ و زیو .. هەموو ئەمانە بوونەتە مایەی قەیرە کردنی کچان و شونەکردنیان لەمەشەوە کچان ناچار بوونە دەست هەڵگرن لە هەندێ لە مافەکانی خۆیان لە شوکردندا لەوانە خەرج و ماڵ لەکاتێکدا ئەم دووانە مافی ئافرەتانن بەسەر پیاوانەوە ئەوەش بزانە ڕوکنەکانی هاوسەرگیری ئەمانەن :

کچ و کوڕ وخاوەنی کچ و (پێدان و قەبوڵ کردن) و بوونی دوو شایەت دەبینی هاوسەرگیری (مسیار) هەموو پێنج ڕوکنەکەی تێدایە تەنها ئەوەندە هەیە ئافرەت لە ماڵی باوکی خۆیدا یان لەماڵی خۆی دەمێنێتەوە بە بێ مافی داواکردنی ماڵ وخەرجی (نفقة) هەر کات مێردەکە ڕۆشت دەچێتە ماڵی ژنەکە یان ماڵی باوکی ژنەکە .

ئەوەش بزانە ئەم زەواجە کاتیی نییە و مارەییش بۆ ئافرەتەکە دیاری کراوە جا حوکمی زانایان ئەوەیە هەندێ لەزانایان فەتوای ئەوەیان داوە کە مەرجەکانی هاوسەرگیری شەرعی تێدایە تەنها ئەوەیە ئافرەتەکە (تەنازول لە مافی خۆی دەکات) . بەڵام کەسانی تریش ڕای جیاوازیان هەیە دەڵێن بوونی ماڵ و خەرج (نفقة) ناگەڕێتەوە بۆ ویستی ئافرەتەکە بەڵکو تشریع کراوە لەسەر پیاوان و حیکمەتی تیادایە وە لەم شێوەیە (سالاری پیاو) لە ناو دەچێت وەك خوای گەورە دەفەرموێ : {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء } لەمەشەوە چەندین کەم و کوڕی و نوقسانی وخراپە ڕوو ئەدات وەك :

١ – دووری مێردەکە لە چاودێری و پەروەردەی ئەو ئافرەتەیە.

٢ – مەحروم بوونی ئەومندالأنەی دەکەونەوە لە پەروەردەی باوك .

٣– قورس بوونی خەرجی دان لەسەر ئافرەتەکە .

٤– کرانەوەی دەرگای بایەخ نەدان و بەسەر نەکردنەوەی ژنەکە لە لایەن مێردەکەوە ئەمەش ئەگەری ڕودانی کاری خراپی لێ دەکرێت .

**٥- ساردکردنەوەی خەڵك لە زەواجی ئیسلامی کارپێکراو بە هۆی هەڵگرتنی ماڵ دروست کردن و خەرج دانی ژنەکە کە ئەمەش لەم سەردەمەدا دژوارە و ئەمەشە هۆی ژن نەهێنان و قەیرە بوونی زۆرێکە لە کچان .**

**بۆیە ئەمەیان بەکارێکی خراپ داناوە و ڕەخنەیان لێگرتووە تەنانەت لە کۆمەڵگەدا کەسانێکی کەم نەناسراو ئەو کارەیە دەکەن بە تایبەت ئەو خانەوادەو خێزانانەی لە ناو کۆمەڵگەدا پلەو پایە و ناوبانگیان هەیە و خاوەنی کەسایەتی خۆیانن ئەو کارە ناکەن ، جا وا چاکترە ئەم دەرگایە نەکرێتەوە و هاوسەرگیری شەرعی زیان نەبینێت چونکە بەڕاستی ئەمە کاردەکاتە سەر هاوسەرگیری ئیسلامی کارپێکراو.**

خوایش زاناترە.

**پ ١٠٢/ بەناوی خوای گەورە سلاوی خوات لێ بێ ئایا لە ڕێگەی ئینتەرنێت یان تەلەفۆن مارە بڕین دروستە لە حاڵەتی زەروریدا؟**

**وەڵام :**

مارە کردن و ژن بە مێرددان لای زانایان چەندین مەرجی هەیە دوای ئەوەی هەردوو لا واتە : (کوڕ و کچ)موسڵمان بن وە لە ئیسلام دەرنەچوبن . ئەو مەرجانەش بریتین لە : (ڕەزامەندی کچ و کوڕ سەرپەرشتی کردنی بەشوودان

لەلایەن خاوەنی کچەوە ، مارەیی دانان ، بونی دوو شایەت ، داڕشتە (صیغة)ی گرێبەستی هاوسەرگیری) .

پێویستە (لای زۆربەی زانایان)بۆ هەموو ژن بە مێردانێك ئەم مەرجانە هەبێت ئەگەر نەبوون ئەوا ئەو هاوسەرگیریە دروست نەبووە ، جا ئەوەی کە لە پرسیارەکەدا هاتووە دەربارەی ژن بە مێردان لەڕێگەی تەلەفۆنەوە یان ئینتەرنێت یان هەر دەستەواژەیەك لەم جۆرە ، بۆ وەڵامی ئەم شێوازە پێویستە دیراسەی ڕوکنەکانی ژن بە مێردان بکەین ڕەزامەندی کچ و کوڕ ، دانانی مارەیی بۆ کچ ، پێدانی (إیجاب) و قەبوڵکردن لە لایەن مێردەوە ڕوبدات تا ئێرە کێشەمان نییە هەموو هەیە تەنها شایەتەکان جا ئەوانەی کە دەڵێن ئامادەبوونی شایەتەکان مەرجی دروست بوونی زەواجەکەیە دەڵێن لەبەر ئەوەی شایە تەکان لە گەڵ کچ و کوڕەکە لەیەك شوێندا کۆنابنەوە دروست نیە . بەڵام ئەوانەی کە ئەڵێن بوونی شایەت مەرجی دروستبوونی زەواجەکە نیە هەبوونی شتێکی باشە بەڵام مەرجیش نیە . وە ئەو فەرموودانەی کراون بە بەڵگە بۆ ئەم مەسەلەیە هەموو لاوازن لەوانە حەدیسی (لا نكاح الا بوليّ وشاهدي عدل) رواه الدارقطني والطبراني والبيهقي ئەمە وەکو فەرموودەی (مرفوع) وەکو قسەی هاوەڵان (ابن عباس) وتوویەتی .

بۆیە ئەم مەسەلەیە دیراسەی زیاتری دەوێ بەلاَم ڕای پەسەند إن شاء الله ئەوەیە ئەگەر شایەتیش نەبوو دروستە بەمەرجێ ئەو بە مێردانە ئاشکرا بکرێت وەکو شێخی ئیسلام ابن تیمیە ئەڵێ : ئەگەر ژن بە مێردان شایەتیش نەبێت بەڵکو خاوەنی کچەکە بەشوی بدات و ئەم شوکردنەش لەناو خەڵکدا بلاَوبێتەوە دروستە لە مەزهەبی ئیمامی مالیکدا ، وە ڕیوایەتێك لە ئیمامی ئەحمەدەوە ئەم ڕاوبۆچونەش دیارترین و ڕونترین وتەی زانایانە موسڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم ژنیان بە شوو دەدا و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ نەدەکردن بە شایەت گرتن وە لە بەمەرجگرتنی شایەت لە هاوسەرگیری هیچ فەرموودەیەکی سەلمێنراو نیە نە لە (صحاح)دا و نە لە (السنن) دا و نە لە (المساند) دا ...هتد .

وە ئەگەر بکرێت ئەو شایەتانە کوڕو کچەکە بناسن باشترە هەروەها دەتوانرێ لای کوڕە دوو شایەت هەبێ و لای کچیش دوو شایەت هەبێ . شایەتەکانیش خۆیان گوێیان لە گفتوگۆی هەردوو لابێ : ژنپێدانی خاوەن و قەبوڵکردنی مێردەکە و ڕەزامەندی کچەکە ببیستن ئەمە ئەگەر نەتوانرا لە جێگایەکدا کۆببنەوە ئەگەر بکرێت بەیەکەوە دابنیشن باشترە .

**پ ١٠٣/ ئەگەر ژن و پیاوێك منداڵیان نەبێ و خەتا لە پیاوەکە بێت ژنەکە بۆی هەیە داوای تەڵاق بکات لە پیاوەکەی لەبەر منداڵ؟.**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

زانایانی شەریعەتی ئیسلامی پێکهاتوون لەسەر ئەوەی ساغ و سەلامەت بوونی مێرد لە هەندێ نوقسانی مەرجێکی بنەڕەتی یە بۆ بەردەوام بوونی ژیانی هاوسەرگیری لەلایەن ئافرەتەکەوە ، بەو مانایەی ئەگەر ئافرەت نوقسانی بەدی کرد لە مێردەکەیدا مافی خۆیەتی داوا بەر بکاتەوە بۆ لای دادوەر بەمەبەستی جیابوونەوە وە لەنێوان خۆی و مێردەکەی .

شەرعزانەکان هەرچەندە جیاوازن لە دیاری کردنی نوقسانییەکان بەڵام پێکهاتوون لەسەر ئەوەی (شلەپەتە)یی ناتەواوی یە و دەبێتە هۆکار بۆ داواکاری ژن بۆ جیابوونەوەی لەگەڵ مێردیدا ، بەڵام منداڵ نەبوون دەسەڵاتی پیاو یان ژنی تیا نیە هۆکار نیە بۆ جیابوونەوەی ژن و مێرد لەیەکتری ، مەبەستمان لە هۆکار نەبوونی ئەوەی مافی خۆیان نیە گرێبەستی هاوسەرگیری هەڵوەشێنێتەوە . والله اعلم.

**پ ١٠٤/ أ- ئەگەر کەسێ شیری دایکمی خواردبێ من شیری دایکی ئەوم نەخواردبێ ئەتوانم خوشکی ئەو بێنم؟ خوشکەکەی شەش ساڵ لە خۆم بچوکترە . خوا خێرتان بنوسێت .**

**پ ١٠٥/ ب- هاوڕێیەکم ئەڵێت : من شیری پورم زیاتر لە پێنج جار خواردووە ئێستا شووم کردوە بە کوڕێکی پورم کە نزیکەی دە ساڵ لە خۆم گەورە ترە و دوو منداڵم هەیە ژیانمان زۆر خۆشە پێکەوە ئایا ئەمە دروستە؟ چونکە هەندێ مەلا ئەڵێن ئەبێ لەگەڵ ئەو کەسەی کە خواردووتە شیرەکە هی کام منداڵ بێت لەگەڵ ئەوە ئەبێت بە خوشك و برا بەس ئەوانەی لە تۆ گەورەترن نابێت بە خوشك و برات. ئایا هاوڕێکەم چی بکات؟**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**وەڵام**

أ / هەرکەسێك شیری هەر ژنێك بخوات ئەوە کەسی شیر خواردوو دەبێتە کوڕی ئەو ژنە شیر دەرە وە براو خوشکی کەسی شیر خواردوو نابنە هیچی ئەو ژنە ، بەڵام ئەم دەبێتە ئەندامێك لە خێزانی ئەوان وە دەبێتە خزمی ئەوانەی کە خزم و کەس و کاری ئەمانن وەکو باقی ئەندامەکانی ئەو خێزانە

بەڵگەش لە قورئاندا ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: {... وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ ...} سورة النساء (٢٣) . واتە : خوشکەکانتان لە شیرەوە لەسەرتان حەرامکراوە مارەیان بکەن بۆ خۆتان واتە بەهۆی شیرەوە خوشکی ئێوەن .

هەروەها حەدیسی ئیمامی موسلیم کاتێ بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)یان وت بۆچی کچەکەی حەمزەی مامت مارە ناکەیت ئەویش فەرمووی :(انها لا تحل لي انها ابنة أخي من الرضاعة)چونکە ئافرەتێك شیری داوە بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وە شیریشی داوە بە حەمزە لە کاتێکدا هەردووکیان منداڵ بوون .

وەڵامیش بۆ ئەم بەڕێزە کە دەڵێ من شیری دایکی ئەوم نەخواردووە ئایا دەتوانم خوشکی ئەو بێنم کە براکەی شیری دایکی منی خواردوە لەوەڵامدا بەڵێ ئەو کچە هیچی تۆ نیە بەڵام خوشکی براکەتە بۆ مەسەلەی تەمەن کە شەش ساڵ بچوکترە لە ڕووی شەرعەوە هیچی تیادا نییە هەرچەند گەورە یان بچووك بێت .

**ب/** بۆ کەسی دووەم کە پرسیارێکی لەم بابەتەی کردووە کە کەسێك شیری پوری خواردووە زیاتر لە پێنج جار پاشان شووی کردوە بە یەکێك لە کوڕەکانی پوری وە دوو منداڵی لێی هەیە ؟

بەڕێزان ئەمە کارێکی حەرامە و بە هیچ شێوەیەك دروست نیە وە پێویستە لەیەك جیابکرێنەوە ، چونکە ئەم دووانە برا و خوشکی یەکن ئەگینا تووشی زینا کردن دەبن ، و لە پرسیارەکەدا نووسیویەتی هەندێ مەلا ئەڵێن تەنها لەگەڵ ئەو کەسەدا دروست نیە کە لەگەڵیدا شیرت خواردووە بەڕاستی ئەمە فتوایەکی سەیرە لەوانەیە ئەو کەسانە مەلا نەبن کە فتوایان داوە یان بە هەڵەدا ڕۆشتوون ، چونکە ئەو فەرموودەی باسمان کرد لە شیر خواردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ پێشەوا (حمزە) دا خوای لێ ڕازی بێت لە شیری ئافرەتێك کە پەیوەندی بە هیچکامیانەوە نەبوو وایکرد کچی حەمزە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەرام ببێ بەو قسەیەی سەرەوە بوایە حەرام نەدەبوو ، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ کچە مامەکەی دا شیری نەخواردووە جا ئەو فەتوایە قسەیەکی نادروستە و پێچەوانەی قورئان و فەرموودەیە با موسوڵمانان وریا بن لە ئەحکامەکانی شیرخواردن ، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ (فانه يحرم من الرضاعة ما يحرم من النسب)رواه مسلم .

واتە / چ ئافرەتێك لەبەر خزمایەتی مارەکردنی حەرام بێت شیرخواردنیش ئەوە حەرام دەکات.

**پ ١٠٦/ سلاْوی خوا لەئێوەی بەڕێز بێت ، سەبارەت بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سیْ پرسیارمان هەیە ئەگەر بکرێت وەلاْممان بدەنەوە ، پرسیاری یەکەم : ئایا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چۆن خەدیجەی دایکی ئیماندارانی مارە کرد ؟**

**پرسیاری دووەم : ئایە لەسەر چی دینێك مارەی کرد ؟**

**پرسیاری سێهەم : ئەو دینەی کە خەدیجەی لەسەر مارەکرد لەناو خەڵکانی دەورو بەریدا تاچپڕادەیەك بەربلاْوبو'؟**

**وەلاْم :**

**وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته**

پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم خەدیجەی مارە کردوە لەسەر داب ونەریتی ئەو کاتەی ئەوکەسانەی لەسەر شەریعەتی ئیبراهیم مابون (علیه السلام)، خەدیجە ئافرەتێکی خانەدان وخاوەن سامان بو، پیاوانی بەکرێ دەگرت بۆی یان بەقازانج شەراکەت(**المضاربة**) هاوبەشی دەکردن، کاتێك ناوبانگی ڕاستگۆیەتی وئەمانەتپارێزی وڕەوشتبەرزی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم ی بیست وپێگەیشت هەواڵی بۆ نارد و داوای لێکرد بەقازانج

شەراکەت ماڵیاتەکەی ببات و بۆ شام بڕوات لەگەڵ خزمەتکارەکەی کەناوی (**ميسرة**) بو، ئەویش داواکەی قەبوڵ کرد و ڕۆشت، لەوێ ڕاهیبێك بەناوی (**نسطور**) بینیویەتی هەواڵی بە میسر داوە کە ئەم کەسە دەبێتە پێغەمبەر، پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەوەی کەویستی لەکڕین وفرۆشتن ئەنجامیدا ئەوجا گەڕایەوە بۆ مەککە و میسرە ئەوهەواڵەی ڕاگەیاند بەخەدیجە ئەویش کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم و پێی ڕاگەیاند کەمن حەز دەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ تۆدا بکەم لەبەر خزمایەتی و ڕێزداری و ئەمانەت و ڕەوشت جوانی و ڕاستگۆیەتیت ، ئەویش ئەمەی بۆ مامەکانی باسکرد حەمزەو ئەبوتالیب لەگەڵیدا ڕۆشتن تاوەکو چونە ماڵی باوکی خەدیجەو وەلەگەڵ باوکیدا قسەیان کرد و داوایانکرد بۆ پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم ئەویش بە مێردی دا، وەوتراوە عەمری کوری ئەسەد مامی خەدیجە، خەدیجەی داوە بە پێغەمبەری خودا وە بە خەدیجەی وتووە موحەممەد داوای خەدیجە بکات: ئەوە پیاوێکە لەلوتی نادرێت واتە بەڕێزەو خاوەن کەسایەتی تەواوە وەئەوکاتە تەمەنی خەدیجە چڵ ساڵبووە.

وە کەسوکاری (**بنو هاشم**) و پیاو ماقوڵانی عەشیرەتی (**مضر**)
ئامادەی مەجلیسەکە بون پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم دوانزە
ئۆقەو نیو و چل دیرهەمی کرد بەمارەیی، وەوتراویشە بیست بەکرەی
کردوە،ئەمەش دوای دومانگ دوای گەڕانەوەی لە شام پێش ئەوەی وەحی
دابەزیت وەتەمەنی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم ئەوکاتە بیست
وپێنج ساڵ بووە ، جائەم شێوازە لەداواکردن و پێدان و مارەیی و
کۆبونەوەیە لەشەریعەتی ئیبراهیمەوە سەلامی خوای لەسەربێت وەرگیراوە
کە عەرەب لە سەری دەژیان ، هەروەها تەڵاق وحەج و عومرەو سەعی نێوان
سەفا و مەروەو وەستان لە عەرەفەو گەورە راگرتنی مانگەکانی موحەڕەم و
غوسلی لەشگرانی و شۆردن و کفن کردنی مردوەکانیان وەچەندین شتی تر
کە لە ناویاندا مابویەوە لەشەریعەتی ئیبراهیم، ئەوانیش لەسەری دەڕۆشتن
تاوەکو ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات جائەوەی پەسەند کرد کردی و ئەوەشی
پێچەوانە بوو لەگەڵی نەسخی کرد وەحوکمی نیکاحیش ئەوانەی کە لەپێش
هاتنی ئیسلام ئەنجامدرابون پاشان ئیسلام هات بە سەریدا ئەوە زانایان
یەکدەنگن لەسەر دروستێتی هاوسەرگیرییەك ئەگەر پیاو و ژنەکە موسڵمان
بوبون، وە هەردوولا لەوانەبن کە لە ئیسلامدا ڕێگایان پێدراوە هاوسەرگیری

بەیەکەوە بکەن وە نیکاحی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم لەم جۆرە بوە.

**پ ١٠٧/ئایا ئەگەر زەکەری پیاو داخلی فەرجی خێزانی بێت و ئاوی نەیەتەوە لەشی پیس دەبێت ؟**

**وەڵام :**

**ئەگەر زەکەری پیاو داخل فەرجی ئافرەت بوو تەنها سەری زەکەری دیار نەما غوسلی دەکەوێتە سەر با ئاویشی دانەبەزێ ، لەبەر ئەم فەرموودەیە کە أبو هریرە ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی** : (إذا جلس بين شعبها الأربع ثم جهدها فقد وجب الغسل انزل أم لم ينزل) رواه مسلم .

**واتە : ئەگەر پیاو لە نێوان چوار پەلی ئافرەت دانیشت و پاشان زەکەری خستە ژوورەوە ئەوە غوسلی دەکەوێتە سەر ئاوی دابەزێ یان دانەبەزێ ، وە لەفەرموودەیەکی تردا هاتوە** : (إذا أصاب الختانُ الختان فقد وجب الغسل)رواه أحمد ومالك .

**واتە : هەردوو خەتەنە کراوەکە بەیەك گەیشتن غوسل واجب دەبێ .**

**پ ١٠٨/ ئایا دەکرێ پیاوێك دوو ژن بهێنێت و لەیەك ژووردا بخەون؟**

**وەڵام :**

**ئاینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانی کردووە بە عەورەت پۆشی لە هەموو کاتێکدا تەنها لە چەند کاتێکدا نەبێت کە لە شەرعدا مۆڵەتی پێدراوە ، وەك لەم فەرموودەیەوە بۆمان ڕوندەبێتەوە کە (بهز) ی کوڕی (حکیم) لە باپیریەوە دەیگێڕێتەوە کە وتوویەتی : وتم ئەی پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وسلم **(عەورەتەکانمان کامەی داپۆشین و کامی دانەپۆشین ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی :** (احفظ عورتك إلا من زوجتك أو ما ملكت يمينك قلت يا سول الله إذا كان القوم بعضهم في بعض؟ قال إن كان احدنا خالياً قال فالله أحق أن يستحيا من الناس ) رواه الترمذي برقم ٢٧٦٩ وابن حبان برقم ١٩٢٠ وحسنه الشيخ الألباني برقم ١٥٥٩.

**کەوا بوو ئاینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانی کردووە بە عەورەت پۆشی تەنانەت ئەگەر بەتەنهاش بێت فەرمانی سوننەتە واتە واجب نیە ، ئەم پرسیارەش کە هاتووە پیاوێك لەگەڵ دوو خێزانی بەیەکەوە بخەوێت ئەمەش بێگومان سەرەڕای ئەوەی کاری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وا نەبووە ، ئەنجا**

عەورەتی یەکێك لەو خێزانە بۆ ئەوی تریان دەردەکەوێت ، وە پەیڕەو کردنی سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم باشترین چارەسەرە .

**پ ١٠٩ / خاوەن کچ گەر هاتوو خوازبێنی کچی بچوکی کرا و ئەویش قەدەغەی بەشودانی کرد بەبیانوی (ترتیب)، واتە : بەپێی تەمەنی کچەکانی، بچوك بەشوو نەدات پێش گەورە ؟ ئەمەش گرفتێکە توشیی من بووە، گەنجێك هاتە خوازبێنیم کەئاستێکی بەرزی هەبوو لەدینداری و ڕەوشت و چاودێریی کردن لەسەر نوێژەکانی بەلاَم باوکم هەر قایل نەبوو بەشوودانم ی ڕەتکردەوە ، ئەمەش لەبەر ئەوەی خوشکێکی لە خۆم گەورەترم هەیە مێردی نەکردووە ، بۆیە داوا لەبەڕێزتان دەکەم دەربارەی ئەم کێشەیە ڕێنماییم بکەن ، چونکە کۆمەڵگاکەمان مەسەلەی ژنهێنان و مێردکرنی زۆر ئاڵۆز کردووە ، تەنها کچانیش بوون بەقوربانیی ؟.**

وەلاَم / پێویستە ئەوە بزانین کە کچ ئەمانەتە لەگەردنی باوکیدا، خاوەنی کچ بەرپرسیارە لەسەر ئەم ئەمانەتە ئەنجا کچ نابێ وەکو شت و مەك بێت لای باوك، ئەگەر ویستی بیفرۆشێت و ئەگەر نا قەدەغەی بکات ، بەڵکە چاودێر و بەرپرسیارە لەوەی پێی سپێردراوە ، لەسەری واجبە ئەوەی بۆ

کچـەکەی چـاکە هەڵیبـژێرێت ، ئەگـەر کەسـێکی شـیاو لـەئاین و ڕەوشـتدا خـوازبێنی کـچ بچـوکەکەی کـرد پێویسـتە بـەمێردی بـدات وحەرامـە ئەگـەر قەدەغـەی بکـات لەبـەر هـەر هۆیـەکی ناشـەرعی ، چـونکە ئـەوەی گرنگـە خوازبێنی کار بەدین و ڕەوشـت بێـت و ئـەوەی هەنـدێ نـەفام کردوویانـە بـە عادەت کە کچی بچوکی بەمێرد نادات ، لەبەر ئـەوەی کچـی گـەورەی هەیـە ، ئەمـەش عـادەتێکی خراپـە لەبـەر ئـەوەی پێچـەوانەی ئەوەیـە کەشـەریعەتی ئیسلام دەیخوازێت ، لەسەر ئەو باوکە کەقەدەغەی بـەمێردانی کچـی بچـوکی دەکـات ، (واجـب)ە چـاودێری وگرنگـی دان بەکچـی گـەورەی بـدات و لـەخوا بترسـێت ، چـونکە پێدەچـێت جـارێکی تـر مێردێکـی هاوشـانی بـۆ ئامـادە نەبێتـەوە و داوای بـەمێردانی لێ بکرێـت، کـەوابوو لەسـەری (واجـب)ە بیـدات بەکەسێکی هاوشانی کچەکەی خـۆی ، کچـی گـەورەش خـوا ڕزقـی دەدات و مێرد دەکات ، لەوانەیە دەرگایەکیش بێـت خـوای گـەورە لـە کچـی گـەورەش بیکاتـەوە، خـوا بـۆی ئاسـان بکـات کەسـێکی شایسـتەی بـەدین و ڕەوشـت خوازبێنی بکات ، والله الموفق(٢).

---

(٢) انظر : فتاوى منار الأسلام ج٣ ص٢١٥.

**پ١١٠/ ئەگەر هاتوو پیاو ژنی خۆی تەڵاقدا(سێ تەڵاقەو لەیەك جێگادا)ئایا بەیەك تەڵاق دادەنرێت یان بەسێ ؟داوا كارین بەوردی ولەگەڵ بەڵگەدا وەڵاممان بدەنەوە؟**

وەڵام / ئەمە بەیەك تەڵاق حیساب دەكرێت ، بەبەڵگەی ئەو حەدیسەی ئیمامی موسلیم لە (صحیح)ەكەیدا ڕیوایەتی كردوە لە ئیبن عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت كەفەرمویەتی : تەلاقی سێ بەسێ(واتە:تەلاقێك گەڕانەوەی نەبێت)لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) و ئەبو بەكر و پێشەكی خیلافەتی ئیمامی عومەردا بەیەك تەڵاق دادەنرا پاشان ئیمامی عومەر فەرمووی (خەڵكی پەلەیان كرد لەشتێكدا كەبواری تێدا خۆیان ئەو بوارەیان نەهێشت و تەسكیان كردەوە ئەویش ئەوەی لەسەر دانان) بۆیە پێشەوایانی هەرچوار مەزهەبەكان ئیشیان بە ئیجتیهادەكەی ئیمامی عومەر كرد هەروەها شوینكەوتوانیانیش ئیشیان پێ كرد، ئیمامی شەوكانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت : ئەگەر ئێوە سوننەتی پێغەمبەرتان (ﷺ) وازلێ هێنا لەبەر قسەی ئیمامی عومەر ئەوە ئیمامی عومەر چی یە لەبەراوردی پێغەمبەردا (ﷺ) وەئەگەر وازتان لێ هێنا لەبەر مەزهەبەكان ئەو كاتە ئەوان كەمترن لەوەی بەرامبەر بەسوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوەستنەوە ، لەحەدیسی

فاتیمـــەی کچـــی قەیســـدا هـــاتووە کـــەمێردی بەیـــەکجاری تـــەلأقی داوە و لەڕیوایەتێکدا هەرسێ تەلأقی _ بەلأم ڕونکردنەوەی لەڕیوایەتی تـردا هـاتووە کەبەسـێ جـار تـەلأقی داوە _ کـەدوای یـەك تـەلأق گەڕاندوویەتیـەوە _ئـەم ڕیوایەتەش (صحیح)ە.

وەلە حەدیسی (رکانة) دا هاتووە کەژنەکـەی تـەلأق دابێـت سـێ تەلأقـە و پێغەمبـەریش (ﷺ) سـوێندی دابێـت کەسـێ تەلأقـەی مەبەسـتە و ئـەویش هەرســـێ تـــەلأقی خســـتبێ ، بـــەلأم ئـــەم بەســـەر هاتـــەی (رکانـــة) لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) نەسەلمێنراوە ، خوای گەورە دوای ئەوەی باسـی تـەلأق دەکات دەفەرموێت: ﴿لَعَلَ الله يُحْدِثُ بَعْدَ ذلك أمراً﴾

کەوابوو بۆ موسوڵمان وا چاکترە کەتەلأقی دا یەك تـەلأقی بـدات ئەمـەش ڕێبازی پێغەمبەرە(ﷺ).

لەوەیە ئەگەر هاتوو بەیەك تـەلأق تـەلأقی ژنـی بـدات پاشـان بیگێڕێتـەوە پاشـان تـەلأقی بـدات وپاشـان بیگێڕێتـەوە پاشـان تـەلأقی بـدات پاشـان

بیگێڕێتـەوە و حـەز لـەژنی خـۆی بکـات و ئـەویش حـەز لـەم بکـات لەوەشـە پێویستیان بکەوێت بە (التحلیل) کەحەرامکەرە[٣].

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت:

(لعن الله المحلل والمحلل له) .

واتە: لەعنەتی خوا لەو کەسەی ژن بۆ یەکێکی تـر حـەلاڵ دەکـاو ئـەوەش بۆی حەلاڵ دەکرێت، ئەمەش کارێکی نادروستە وەپێویستە مرۆڤی موسـڵمان دور بگرێـت لـەو هۆکارانـەی دەبنـە مایـەی موخالەفـەی سـوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ)، سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) لەتەڵاقدا بریتی یە لەوەی خێزانـت کاتێـك تـەڵاق بـدەیت کـەپاك بـێ و نەچـوبیتە لای، هەرکـەس بـەخێزانی وت: سـێ تەڵاقەت کەوتبێ ئەوە بەتەڵاقی جۆری (بدعي) حیساب دەکرێت و تەنها یـەك تەڵاقی پێ دەکەوێت . والله المستعان[٤].

وبالله التوفيق وصلّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلّم.

---

(٣) واتە : ئافرەتێك مارە بکرێت بەمەبەستی ئەوەی بۆ مێردی یەکەمی ئافرەتەکەحەلال بکرێت.

(٤) انظر : قمع المعاند وزجر الحاقد الحاسد ج٢ص٣١٩.

**پ۱۱۱/ من لەگەڵ کچێکی پورما لەسەر یەك جێگا ئەخەوم کە لەیەك ماڵ ئەژین ، بێ ئەوەی هیچ جۆرە هەستێکی شەیتانیم بۆ دروست بووبێت وە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لە نێوانمان ڕووبدات.... ئەوە بۆ ماوەی یەك ساڵیشە !ئایا ئەمە گوناهە؟ سوپاس.**

**وەڵام :**

ئیسلامی پیرۆز فەرموویەتی کە ئەگەر خوشك و برایەك گەشتنە بالّغ بوون نابێت لەسەر جێگایەك لە تەنیشت یەکەوە بخەون ، بەڵام ئایینی پیرۆزی ئیسلام هی خوای گەورەیە و هەموو حیکمەت و داناییەکی تێدایە و ئاینێکی واقعیشە ئەنجا چارەسەری هەموو گەندەڵی و خراپەکان دەکات ، وە پێش وەخت چارەسەری تێروتەسەلیان بۆ دروست دەکات ، بۆیە پێش بالّغ بوون جێگای کچ و کوڕ لەیەك جیادەکرێتەوە بۆ ئەوەی نەوەك بەهەڵە ئارەزووەکانیان بەکاربهێنن ئەمە پێش بالّغ بوون چ جای دوای ئەوە ئەوەی شەریعەتی ئیسلامیش دایناوە ئەوە بۆ عاممەتی خەڵکە نەك بۆ کەسێك کە ڕیز پەڕبێت لە زۆرینەی خەڵکی بەڵگەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ : (مروا أولادکم بالصلاة إذا بلغوا سبعاً واضربوهم علیها إذا

بلغوا عشراً وفرّقوا بينهم في المضاجع) رواه أحمد وأبوداود والحاكم وقال صحيح على شرط مسلم والترمذي وقال حسن الصحيح .

واتە : فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژ کردن ئەگەر تەمەنیان گەشتە حەوت ساڵاَن وە ئەگەر گەشتنە دە ساڵاَن و نەیانکرد لێیان بدەن بۆ کردنی وە جێ خەوەکانیان لەیەك جیا بکەنەوە .

ئەمە پەروەردەی ئیسلامە و خوای گەورەش چاکتر مرۆڤەکان دەناسێ جا ئەم جیاکردنەوەیە ئەگەر کچ و کوڕ برا و خوشکی یەکتربن ، بەلاَم ئەگەر کەسی نامەحرەم وەك ئامۆزا و پورزا و خاڵۆزا و ئەوانی تر ئەوە حەرامە بە تایبەت ئەگەر باڵغ بوبون ئەنجا خاوەنی پرسیار کە ئەڵێت وەکو خوشکی خۆم تەماشای دەکەم ئەگەر وا بێت ئەوە هەرچەندە کارێکی حەرامت کردووە پێویستی بەتەوبە لێکردن هەیە شوکری خوا بکە کە نەفسێکی وای پێ بەخشیویت کە چاوت لێی نەبووە ، بەلاَم ئاگاداربە شەیتانەکان لەبۆسەدان بۆ کەسی موسڵمان و داوێن پاکەکان تا لە خشتەی بەرن و تاوانەکانیشی لەناو خەڵکیدا ئاشکرا بکەن بۆ ناشرین کردنی ، خوای گەورە هەموو موسڵمانان بپارێزێت لە فێڵەکانی شەیتان .

**پ ١١٢/ دەرزی لێدانی ئافرەتان لە لایەن پیاوانەوە حەرامە یان نا ،چونکە ئەگەر عیادەت هەبوو زۆر توشی ئەم حاڵەتانە دەبی!؟**

**وەڵام :**

دەرزی لێدانی ئافرەتان لە لایەن پیاوانەوە یان بە پێچەوانەوە ئەمە بە پێی زەرورەتە ئەگەر ئافرەتان نەبوون بۆ پیاو دروستە ئەو کارەیە بکات ، چونکە پاراستنی ژیانی مرۆڤ گەورەترە لە بینینی عەورەتی ، بەڵام دەبێت موسڵمانان کەمتەرخەمی نەکەن بە ئاسانی ئەم مەسەلەیە وەرنەگرن ، چونکە سەر ڕادەکێشیٚ بۆ شتی تر .

ئەمەش دروستە ئەگەر ڕێگە چارەی تر نەبوو.

**پ ١١٣/ من زۆر دەمێکە حەزم لە کردنی حیجابە بەلاّم نازانم دودڵم ، لەخوا بەزیاد بێت نوێژ ئەکەم وە هاوسەرەکەم ڕێگر نیە بەس کە بەکەسانێك ئەڵێم ئەبم بە حیجاب پەشیمانم ئەکەنەوە نازانم چی بکەم ئەترسم بیکەم دوای پەشیمان ببمەوە .**

**وەلاّم :**

سوپاس بۆ خوای گەورە کە خۆشەویستی بالآپۆشی خستۆتە دلتەوە وە سوپاس بۆ خوای گەورە هاوسەرەکەت ڕێگر نییە لە بالآپۆشیت ، جا خوشکی بەڕێز بالآپۆشی فەرمانی خوای گەورەیە وە دڵنیاش بە خوای گەورە دەیەوێ ڕەوشت و حەیاوحشمەتی ئافرەتانی موسوڵمان قورس و سەنگین بێت ، و ئەویش باشتر دەزانێ کام شت و کام جلوبەرگ بۆ بەندەکانی بۆ خێری دونیاو قیامەتی باشترە وەك دەفەرموێ : {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلاَبِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلاَ يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا} سورة الأحزاب(٥٩) . واتە : ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هاوسەرەکانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ کە پۆشاکی بالآپۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لە بارترین شتە کە پێی بناسرێن

تـا ئـازار نـەدرێن و تووشـی گێروگرفـت نـەبن ، هەمیشـە و بـەردەوام خـوا لێخۆشبو و میهرەبانە لە کەموکوڕی ڕابوردوتان خۆش دەبێ .

پاشان گوێ لە قسەی ئەوانە مـەگرە کـە ساردت دەکەنـەوە و بـەرەو خراپـە ئاڕاستەت دەکەن ، بەڵکو پشت بە خوا ببەستەو بە ئیمانـەوە بـاڵاپۆش بـە و مەترسە لە پەشـیمان بوونـەوە ، و دوورکـەوە لەوانـەی یارمـەتیت دەدەن لـە خراپەدا . وەکەسی ژیریش دەبێت ئەوە بکات کە خۆی باوەڕی پێیـەتی نـەك ئەوەی خەڵکی وەسوەسەی بۆ دەکەن .

**پ ١١٤/ ئایا میکیاج کردن بۆ دەرەوەی ماڵ حەرامە؟وە حوکمی کردنی چیە؟**

**وەڵام :**

خۆجوانکردنـەوە و خۆدەرخسـتن لـەدەرەوەی مـاڵ واتـە بـۆ جگـە لـە مێـرد کارێکی حەرامە و هۆکارە بۆ لەدەست دانـی ڕەوشـت و قورسـی و سـەنگینی ئافرەتەکە وە سەرپێچی فەرمانی خوایە ، و خوای گەورە دەفەرموێ : {وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ

نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاء وَلاَ يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} (٣١) سورة النور.

**واتە : بەئافرەتانی ئیماندار بڵێ چاویان بپارێزن لەتەماشای نامەحرەم وە داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناھ و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە ، با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بەتەواوەتی بۆ ھاوسەرەکانیان نەبێت یان باوکی خۆیان یان باوکی مێردەکانیان یان کوڕی خۆیان یان کوڕی مێردەکانیان یان بۆ براکانی خۆیان یان برازاکانیان یان خوشکەزاکانیان یان ئافرەتێك کە پەیوەندییان ھەیە پێکەوە یان ئەوانەش کە کەنیزەکیانن یان ئەوانەی لەماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان بە ئافرەت نییە (لەبەر پیری و نەخۆشی ...) یاخود ئەو منداڵانەی کە ھێشتا شارەزاییان لە ئافرەت نیە نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەوی دا تادەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت و بزانرێت کە زینەتدار و خشڵدارن کەواتە ھەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستھێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفرازبن .**

بۆیە پێویستە ئافرەتان خۆیان بۆ مێردەکانیان جوانبکەنەوە وە کەرەستەی جوانکردنەوەی حەلاڵ بەکاربهێنن نەك بۆ کەسانی تر لەدەرەوە ، بەڕاستی ئەمە کارێکی سەیرە لەم سەردەمەدا ئافرەتان تێیکەوتوون بەشکو بە پشتیوانی خوای گەورە خوشکانمان لەم گرفتە ڕزگاریان بێت خوا یارمەتی هەموولایەکمان بدات .

**پ ١١٥/ ئایا پانتۆڵ لەبەر کردن بۆ ئافرەتان حەلاڵە ئەگەر لەگەڵ شتێکی درێژ ، واتە تاوەکو سەر چۆکت لەبەری بکەی ئەگەر حەرامە لە چ کاتێکدا و بە چ شێوەیەك حەلاڵە؟**

**وەڵام :**

پانتۆڵ پۆشاکی موسوڵمانان نیە چ بۆ پیاوان یان بۆ ئافرەتان ، ئەگەر بە هەندێ مەرج بۆ پیاوان حەلاڵ بکرێت ئەوە بۆ ئافرەتان هەر دروست نیە ، چونکە لەشی ئافرەت دەردەخات باشتر ئەوەیە لەبەر نەکرێت ئەگەر هەر لەبەرکرا و کراسێکی درێژی بکرێتە سەر ئەو کاتەش پانتۆڵ هیچ سودێکی نابێت .

**پ ١١٦/ خەتەنــەکردنی کچــان لــە ڕووی شــەرعەوە دروســتە بکرێت یان نا؟**

**وەڵام :**

خەتەنەکردنی کچان دروستە و یەکێکە لە فیترەت جا حوکمی لە نێوان واجب و سوننەتدا زانایان بە هەردوو حوکمەکە حوکمان پێ داوە ، هەندێ لە زانایان ئەڵێن هەر کچێك پێویستی پـێ هـەبێت ئـەوە واجبـە یـان سـوننەتە بیکـات ، بەڵام ئەوەش بزانە سـوودی زۆر تێدایـە بـۆ تـاك و کۆمەڵگـە هەرچـەندە لـەم زەمانەدا کەسانێکی ئارەزوو پەرسـت ئـەم بابەتـە دەوروژێـنن وە خۆیـان بـە دڵسۆزی ئافرەتان دەزانن بەڵام بە ڕاسـتی ئەوانـە تـەنها مەبەسـتیان ئەوەیـە ئافرەت ببێتە کاڵایەك ئارەزووەکانی خۆیانیان پێ تێر بکەن .

**پ ١١٧/ ئایا ئافرەت بچێت بۆ لای دکتۆری پیاو حەرامە؟**

**وەڵام :**

پێویستە لەسەر موسڵمانان دکتۆری ئافرەتیان هەبێت لـە هـەموو بوارەکانـدا بۆ ئەوەی چارەسەری ئافرەتـان بکـەن و ڕێگـەی ئەگـەری خـراپ دابخرێـت ، بەڵام ئەگەر نەبوو ئەوە ئەو کاتە لەبەر نەبوون و ناچاری دروستە ، بـەڵام بـۆ لای دکتۆری موسڵمان و دەسـت پـاك و داوێـن پـاك و متمانـە پێکـراو لەگـەڵ

ئەوەشدا پێویستە عەورەت بپارێزێت مەگەر ئەوەندەی پێویستە ئاشکرا بکرێت .

**پ ١١٨/ من وەکو کچێکی موسوڵمان و داپۆشراو ڕۆژانە دەوامم هەیە ئایا جائیزە بەتەنیا لەگەڵ شۆفێردا بیت؟چونکە ئاوا بۆم ڕێکەوتووە کەس لە نزیكماڵمان نیە تا هاتوچۆی لەگەڵ بکەم .**

**وەڵام :**

بە تەنها بوون لەگەڵ نامەحرەمدا یان بە تەنها ڕۆشتن و سەفەرکردن لەگەڵ کەسی نامەحرەمدا وەك شۆفێر و فەرمانبەر و ...هتد دروست نییە وە مەترسی خراپی لێ دەکرێت ، پێویستە کەسی موسوڵمان کەمتەرخەمی نەکات لەم مەسەلەیەدا چونکە هەوڵی خراپە دەدات بە تایبەت ئافرەتی داپۆشرا و بەدین دوژمنی زۆرە و هەوڵێ زیاتر هەیە بۆ لەکەدار کردنی خوای گەورە ئافرەتانی موسڵمانان بپارێزێت .

**پ ١١٩/ بەڕێزان سەلامی خواتان لێ بێت پرسیارێکم هەیە بەڵام هیوادارم زوو وەڵامم بدەنەوە من یەکێکم لەو کەسانەی کە هەموو ڕۆژێ سەردانی سایتەکەتان دەکەم :**

**ئایا سۆنەر کردن بۆ ئافرەتی دووگیان بەمەبەستی زانینی ڕەگەزی منداڵەکە گوناحە؟**

**وەڵام :**

سۆنەر کردن بەمەبەستی زانینی ڕەگەزی منداڵ لە سکدا ڕازی نەبوونە بەقەدەری خوا و سیفەتێکی (جاهلی) یە و دوا ئەنجامیش هەندێ جار دژایەتی کردنی تەقدیری خوایە ، لەوانەشە هەندێ کەس هەوڵی ئەوە بدەن ئەو منداڵە لەبار ببەن ، خوای گەورە لە باسی نەفامەکانی پێش ئیسلامدا دەفەرموێت : {وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ } (٥٨) سورة النحل.

بۆیە هەمان نەفامی یە و گەڕاوەتەوە بۆیە پێویستە (واجب)ە ڕازی بن بە تەقدیری خوا و ئەو ڕێگەیە نەگرنە بەر .

**پ ١٢٠/ئەگەر ئافرەت لەگەڵ مێردەکەی خراپ بوو پاداشتی چیە؟**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

خوای گەورە فەرمانی کردووە بە تێکڕای موسوڵمانان بە چاکبوون لـە نێـوان خۆیاندا بەرامبەر بە خودا ، و ژنان بەرامبەر بە پیاوان و پیـاوانیش بەرامبـەر بە ژنان بەتایبەت ژن و مێرد دەبێ تەواو کەری یەکتر بن و ڕێـز لەیـەك بگـرن وە دەبێ قسە لەیـەکرت وەربگـرن و ژنـانیش گوێڕایـەڵی مێردەکـانی خۆیـان بکەن ، جا خراپ بوون لەگەڵ مێرددا تاوانە و لەسنور دەرچوونە ، چونکە بۆ ڕاگرتنی شـێرازەی خێـزان ئـاینی ئیسـلام وا فێرمـان دەکـات و دەڵـێ ئەگـەر سـوژدە بـردن بـۆ کـەس و دروسـتکراوەکان ڕەوا بوایـە ئـەوا دەبـو ئـافرەت سوژدە بۆ مێردەکەی ببات ، بەڵام سوژدە بردن تەنها بـۆ خودایـە . ئەمـەش لەبەر پاراستنی خێزانە و بەتایبەتیش بۆ پاراسـتنی خـودی ئافرەتەکەیـە لـە گومڕابوون و توشبون بە تاوان .

**پ ١٢١/ خێزانەکەم زۆر حەز دەکات پانتۆڵ لەبەر بکات بەڵام من قەبوڵ ناکەم چونکە دەزانم کارێکە لە ئاینەکەماندا نیە ، بەڵام ئەو حەز دەکات لەبەری بکات ئایا بە چ شێوەیەك لەبەری بکات گوناح نیە واتە ئەگەر لەگەڵ کراسی درێژ تاکو سەر چۆك گوناحە ئەگەر نا بە چ شێوەیەك گوناح نی یە ؟**

**وەڵام :**

پانتۆڵ لە پێ کردن بۆ ژنان دروست نییە ، چونکە پیاوان لە پێی دەکەن هەر چەندە خودی پانتۆڵ جلێکی خراپە بۆ پیاوانیش ئەوەش باشترە بۆ ئافرەتان کە پانتۆڵ لە پێ نەکەن هەرچەندە کراسی درێژی بکەنە سەر ، ئەوەی لەسەر ئافرەتان پێویستە ئەوەیە جلێکی شەرعی بەو مەرجانەی هەیەتی کە لە شوێنی تردا باس کراوە لەبەر بکەن .

**پ ١٢٢/ من بەتەمام ببم بە بالاّپۆش إن شاء الله بە پشتیوانی خوای گەورە پرسیارەکەی من لێرەدا ئەوەیە ئەگەر تەوبە بکەیت وەك منداڵێك وایت کە تازە لەدایك بوبێت؟ یانی هەموو ئەوانەی پێشتر کردوومە کە بوەتە مایەی سەرپێچیەکانی خوای گەورە ، بۆ نموونە من پێشتر کەسێکی سفور بووم ئێستا خوای گەورە هیدایەتی داوم بڕیارێکی وام داوە کە ببم بە بالاّپۆش ئایا خوای گەورە تاوانی سفوریەکەم هەموو بۆ ئەسڕێتەوە و لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانم هەڵئەدرێتەوە؟**

**وەلاّم :**

ئافرەتان لەسەریان واجبە لەشیان داپۆشن و جلی شەرعی لەبەر بکەن ئەمەش دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوای گەورە و پاراستن بۆ خۆیان لە چاوی

خەڵکانی خراپ و مانەوەیان لەسەر حەیا و پاکی ڕەوشت و بەو کارەیان دەبنە ڕێگرێك لەبەردەم گورگەکانی ڕەوشت خراپی و هەڵناوەرێن لە ژێر دەستیان دا کە پاشانیش هیچ بەهایەکیان بۆ دانانێن ، جا هەر سفورێك تەوبە بکات و ببێتە بالآپۆش خوای گەورە تەوبەی لێ وەردەگرێ و تاوانەکانی دەسڕێتەوە وە خوای گەورە وای لێ دەکات کە تاوانی نەبووبێ وەك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ : "التائب من الذنب كمن لا ذنب له" صحيح الجامع . واتە : کەسی تەوبەکارو پەشیمان لەتاوان وەکو ئەو کەسە وایە کەتاوانی نییە ، و ئەو دڵخۆشی و خۆشبەختییەی هەستی پێ دەکەیت ئەو دەرگایە بۆ خۆشبەختی گەورەتر لە دونیا و قیامەتدا إن شاء الله جا خێراکە ساتێك زووتر تەوبە بکەو جلی شەرم و حیشمەت و ڕێز لەبەر بکە نەفرەت بێت لە جلی سفور و نەهێشتنی دین و ڕەوشت .

**پ ١٢٣/ئایا دروستە قسەکردن لەگەڵ ئافرەتێك دا پێش ئەوەی مارەت بڕیبێت و بەتەما بیت بیهێنیت؟**

**وەڵام :**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

قسەکردن لەگەڵ ئافرەتدا پێش ئەوەی مارەی بکەیت بەمەبەستی مارەکردنی دروستە ئەگەر تەنها نەبێت واتە کەسێکی لەگەڵ بێت ، و ئەو سەیرکردن و شتانەش تەنها بۆ خوازبێنی بێت و بەردەوام نەبێت و پەیوەندی بوون نەبێت وە لە میانەی ئەو سەیر کردن و قسەکردنەدا تەنها ئەوە بێت کە ئەم دەیەوێت بیخوازێت لەگەڵ ئەوەدا دەبێت دوربکەونەوە لەقسەی ئارەزوومەدانە و هەرزەیی .

**پ ١٢٤/السلام علیکم ئایا ئافرەت قژی ڕەنگ بکات بە ماددەیەك کە ڕێگر نەبێت لە تەڕبوونی قژەکە وە تەنها بۆ ڕازاندنەوە بێت بۆ هاوسەری خۆی جگە لە ڕەنگی ڕەش گوناهبار دەبێت؟؟ خوای گەورە پاداشتان بداتەوە .**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

ڕەنگ کردنی قژ بۆ ئافرەت ئەگەر بۆ هاوسەرەکەی خۆی بێت و جوانی خۆی بۆ خەڵکانی تر دەرنەخات وە ئەو مادەیەی قژی پێ ڕەنگ دەکات ڕێگر نەبێت لە ئاوی دەستنوێژ و غوسل ئەنجا ڕەش و سپی نەبێت ئەوە دروستە و هیچی تیادا نیە إن شاء الله .

**پ ١٢٥/ ئایا حیجاب بۆ ئافرەتان واجبە یان سوننەتە؟ ئایا باوك تا چەند تاوانبارە ئەگەر كچەكەی ئاگادارنەكاتەوە؟**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

بێ گومان حیجاب واجبە وەزانایان (اتفاق) یان هەیە لەسەر ئەم مەسەلەیە

## بەڵگەی واجبی حیجاب پۆشین

**بەڵگەی یەكەم**/خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاء وَلاَ يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [النور : ٣١] ، **واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێ بە ئافرەتە ئیماندارەكان , باچاویان بپارێزن لەسەیر كردنی پیاوی بێگانە, وە با داوێنی خۆیان بەدوور بگرن لەبەد ڕەوشتی. وە جوانی و ڕازاوەیی و زینەتی**

خۆیان بەدەرنەخەن بۆ نامەحرەمەکانیان. وە با لەچك و سەرپۆش بەسەرو سنگیاندا بێتە خوارەوە ... وە با لەکاتی ڕۆیشتنیاندا قاچیان نەدەن لەزەوی یەکە و تەقە تەق بکەن بۆ ئەوەی بزانرێت چ زینەتێکیان شاردۆتەوە ، ئەی ئیمانداران هەمووتان تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار چونکە ئەمە مایەی سەرفرازیتانە .

**بەڵگەی دووەم/** خوای گەورەفەرموویەتی : ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ [الأحزاب ٥٩ ]. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمان بدە بە خێزانەکانت و کچەکانت و خێزانی باوەڕدارانیش (چونکە خێزان و کچەکانی پێغەمبەر نزیك ترین کەسن لێیەوە ئەوان لە پێش ترن لە بەجێ گەیاندنی ئەم حوکمە) بەوەی کە عاباکانیان بە سەریاندا بدەن ، تا ئافرەتانی موسوڵمان بە جل و بەرگەکانیانەوە بناسرێنەوە بەوەی کە بە حەیا و قورس و سەنگینن تاوەکو ئەزێت نەدرێن ، وە خوای گەورە بەبەزەییە بەرامبەر ئەوانەی کە لەمەو پێش خۆیان نەپۆشیوە .

**بەڵگەی سێیەم /خوای گەورە فەرموویەتی :** ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ﴾ [ الاحزاب : ٣٣ ] **واتە: ئەی ئافرەتان لە ماڵەکانی خۆتان بمێننەوە وە نەچنە دەرەوە مەگەر بۆ پێویستی نەبێ , وە ئەگەریش**

**هاتنـە دەرەوە جـوانی خۆتـان بەدەرمەخـەن و خۆتـان مەڕازێننـەوە وەك ئافرەتانی سەردەمی جاهلی ئەنجامیان دەدا لەپێش ئیسلامدا.**

## ﴿ لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)﴾

**بەڵگەی یەکەم/** لە ( عومـەری کـوڕی خـەتتاب )ەوە ( ﵁) هـاتووە کەوا وتی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ((أحجب نسائك ... قالت عائشة : فأنزل الله آية الحجاب )) صحيح البخاري رقم : (١٤٦) وصحيح مسلم رقم : (٢١٧٠) .

واتە: باخێزانەکانت خۆیان داپۆشن ، عائیشە فەرمووی لەدوای ئەمە خوای گەورە ئایەتی حیجابی دابەزاند .

هەروەها عومەر ( ﵁) فەرمووی بـە پێغەمبـەر (ﷺ) : (( يارسول الله , لو أمرتَ أمهات المؤمنين بالحجاب فأنزل الله آية الحجاب) صحيح البخاري رقم : (٤٤٨٣) و (٤٧٩٠) .

واتـە: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) خۆزگـە فـەرمانت دەدا بـە دایکـانی ئیمانداران واتە خێزانەکانت خۆیان دەپۆشی بە حیجاب لەبەرکردن , لەدوای ئەمە خوای گەورە ئایەتی فەرزبوونی حیجابی دابەزاند.

**بەڵگــەی دووەم/** (عبـدالله) ی کـوڕی مەسـعود (رضي الله عنه) فەرموویـەتی: پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی : ((المرأة عورة)) سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٨٦) .

واتە : ئافرەت هـەموو لەشـی عەورەتـە دەبـێ دای پۆشـێ جگـە لـەو شوێنانەی کە شەرع بۆی بەڕەوای داناوە دەریبخات کە بریتی یە لە ڕوومـەت و هەردوو لەپی .

ب / پێویستە لەسەر باوکان و دایکانیش ئەم بابەتە بۆ ڕۆڵەکانیان باس بکەن وە ئەگـەر نـەیانکرد یـان کەمتەرخـەمیان کـرد ئـەوا تاوانبـار دەبـن و دەبنـە هاوبەش لە تاوانی کچەکانیاندا .

**پ ١٢٦/ ئایا ئەگەر ئافرەت سکی پڕ بوو مێردەکەی دەتوانێ جیماعی لەگەڵ بکات یان نا وە ئەگەر دەتوانێ چۆن چۆنی؟**

**وەڵام :**

مەسەلەی جوتبون (جیماع) لەگەڵ هاوسەردا (ژن) مۆڵەتی پێدراوە لە هەموو کاتێکدا تەنها لەکاتی حەیز و زەیستانیدا نەبێت کەوا بوو لە کـاتی (سـك پـڕ) یدا دروستە و هیچ زیـانێکی شـەرعی و واقیعـی تێـدا نییـە و چۆنییەتێکەشـی دەگەڕێتەوە بۆ لای ژن و مێرد و لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت .

**پ ١٢٧ / ئایا ئافرەتان دەتوانن بچنە حەمام ( گەرماو ) ەوە گشتی یەکانەوە ؟**

**وەڵام** / شێخی پایە بەرز و فەرموودەناسی سەردەم ئیمامی (الألباني) لە کتێبە بەنرخەکەی ( **آداب الزفاف** )دا[٦] لە باسی پێویستی دروست کردنی حەمام لە ماڵدا فەرموویەتی : " وە پێویستە لە سەریان ( واتە : ژن و مێرد ) کە حەمامێك لە ماڵەکەیاندا دروست بکەن ، وەناشبێت پیاو ڕێ بە ژنەکەی بدات کە بڕواتە حەمامی بازاڕەوە ( حەمامی گشتی ) ، چونکە ئەو کردارە قەدەغە و حەرامە ، لەو بارەشەوە چەند فەرموودەیەکمان پێگەیشتووە:

**یەکەم :** لە ( جابر ) وە (رضي الله عنه) فەرموویەتی ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت : " **من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يدخل حليلته الحمام، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يدخل الحمام إلا بمئزر، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يجلس على مائدة يدار عليها الخمر**" [أ].

---

[٦] آداب الزفاف ص : (٥٩ ـ ٦١) تحت عنوان : (وجوب اتخاذ الحمام في الدار) .

[أ] أخرجه الحاكم واللفظ له ، والترمذي ، والنسائي بعضه ، وأحمد ، والجرجاني من طرقٍ عن أبي الزبير عن جابر ، وقال الحاكم : "صحيح على شرط مسلم" ووافقه الذهبي ، وقال الترمذي : "حديث حسن" ، وله شواهد كثيرة تراها في " الترغيب والترهيب" .

واتە : هەر کەسێك بڕوای بـە خـوا و بـە ڕۆژی دوای هەیـە بـا ئافرەتەکـەی نەبات بۆ حەمامی گشتی ، وە هەر کەسێك بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوای هەیە لـە پیاوان با نەڕواتە حەمامی گشتی یـەوە ئـیللا بـە ( مئزر ) ەوە نـەبێت ( " مئزر " یش : ئەو پارچە قوماشەیە کە لـە ناوکـەوە تـاکو ئـەژنۆ دادەپۆشـێت ) ، وە هـەر کەسێك بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوای هەیە با لە سەر خوانێـك دانەنیشـێ کـە مـەی لـە سەر دەخورێتەوە .

**دووەم :** لە ( أم الدرداء ) ەوە ـ ڕەزای خوای لە سەر بێت ـ فەرموویەتی : لە حەمام هاتمە دەرێ ، پێغەمبەری خوام پێگەیشت ﷺ و فـەرمووی : " من أين يا أم الدرداء ؟ " واتـە : لـە کوێـوە هـاتووی ( أم الدرداء ) ؟ دەڵێـت : وتم : لـە حەمامـەوە ، ئـەویش فـەرمووی : " والذي نفسي بيده ، ما من امرأة تضع ثيابها في غير بيت أحد من أمهاتها ، إلا وهي هاتكة كل ستر بينها وبين الرحمن "(ب). واتـە : سوێندم بەو کەسەی کە نەفسی منی بەدەستە ، هەر ئافرەتێك جلەکانی لە غەیری ماڵی یـەکێك لـە دایکـەکانی خۆیـدا دابکـەنێت ، ئـەوا هـەموو ئـەو سـترانەی هـەتك کردووە کە لە بەینی خۆی و پەروەردگاریدا هەن

(ب) أخرجه أحمد والدولابي بإسنادين عنها أحدهما صحيح ، وقواهُ المنذري .

**سێیەم :** لە ( أبو المليح ) ەوە (رضي الله عنه) فەرموویەتی : کۆمەڵێك ئافرەتی خەڵکی شام ڕۆشتنە لای دایکە ( عائیشە ) وە - ڕەزای خوای لە سەر بێت - ، پێی فەرموون : ئێوە خەڵکی کوێن ؟ وتیان : خەڵکی شامین ، فەرمووی : لەوانەیە خەڵکی ئەو ناوچەیە بن کە ئافرەتەکانیان دەچنە حەمامەوە ( مەبەستی دایکە ( عائیشە ) حەمامە گشتی یەکانە ) ؟ فەرمووی : بیستوومە لە پێغەمبەری خواوە کە فەرموویەتی : " ما من امرأة تخلع ثيابها في غير بيتها إلا هتكت ما بينها وبين الله تعالى "(ج). واتە : هەر ئافرەتێك جلەکانی لە غەیری ماڵی خۆیدا دابکەنێت ئەوا هەموو ئەو سترانەی هەتك کردووە کە لە بەینی خۆی و پەروەردگار یدا هەن ."

---

(ج) أخرجه أصحاب السنن إلاَّ النسائي ، والدارمي والطيالسي وأحمد ، وقال الحاكم : "صحيح على شرط الشيخين" ووافقه الذهبي فأصاب ، واللفظ لأبي داود .

**پ ١٢٨/ ئایا بەکارهێنانی مومتەلاکاتی حکومەت تا چەند حەلاڵ و حەرامە ، وەك بەکار هێنانی کۆمپیوتەر و تەلەفۆن و ئۆتۆمبیل بۆ مەبەستی خۆت....**

**وەڵام :**

بەکارهێنانی شتی حکومەت بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی ئەگەر ڕێگە پێ نەدراو بێت لە لایەن حکومەتەوە یان زیانی هەبێت بۆ ئەو کەرەستانە ئەوا دروست نیە ، ڕێسای کارپێکراو لەم مەسەلەیەدا حەدیسی ئیمامی (موسلیم)ە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ : (المسلمون عند شروطهم) الحدیث زانایان لەم فەرموودەیە چەندین ڕێسایان دەرهێناوە لەوانە: (المعروف عرفاً کالمشروط شرطاً) ئەگەر باو وا بوو نابێ کەرەستەی حکومەت بەکار بێت ئەوا وەك ئەوە وایە حکومەت مەرجی دانابێت لەسەرت کە نابێ ئەو کەرەستانە بەکاربهێنیت .

**پ ١٢٩/ ئایا بەکارهێنانی مۆسیقا بۆ مەبەستی چاکە حەرامە؟ وەك سامی یوسف کە ئێستا بەدیلی گۆرانی یە خراپەکانی ئەم سەردەمەیە ، چونکە ئەوەندەی گوێی لێ دەگرم دڵم پاراو دەبێ بە یادی خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئیتر نازانم بۆ حەرامە؟**

ئەگەر وابێت ئینتەرنێت و سەتەلایت خراپن خۆ لە سەردەمی پێشودا نین و بیدعەن وە ئایا ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەردەمی خۆی دا دەست بڕینی دزی نەهێشت لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کردبوو بەرامبەر دزی کردن کەوا بێت ئەبێ اجتهاد بە پێی کات و شوێن بگۆڕێت .

زۆربەی مەلاو زاناکان دەڵێن موسیقا گەر بۆ کاری چاکە بەکار بێت حەرام نیە وە ئەگەر حەرام بێت کەواتە ئەو هەموو ڕاگەیاندنە ئیسلامیانە لە کوفرو خەڵوەتدان(لَهْوَ الْحَدِيثِ) خوای گەورە کە فەرموویەتی مەبەست شتێکە کە دین ناشرین بکات و قورئان لە بەرچاو خەڵکی بخات" امام محمدی غەزالی ئەفەرموێت ئەگەر قورئانیش بۆ لەبەرچاوخستنی خەڵك لێ بدەیت هەر حەرامە وە باسکراوە کە جارێکیان گوێی لە شیعرە وەتەنیەکانی ام کلثم گرتووە ؟

وەڵام :

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

حــوکمی گــۆرانی مۆســیقا حــەرامێکی ڕون و ئاشــکرایە و چــەندین جــار بەڵگــەکانمان خســتۆتە ڕوو ئــەنجا کــارو پیشــەی پێغەمبــەران و هــاوەڵان و دۆستانی خوا نەبووە وە بەدیلی گۆرانیش بریتییە لە قورئان و زیکر و زانست و موناجــاتی خــوا (جــلّ جلالــه) ، ســەردەمی زێڕینــی ئیســلامەتی ســەردەمی هاوەڵان کەسانی وەك (سـامی یوسـف)یان نـەبووە گۆرانیـان بـۆ بڵـێ ئەگـەر بهاتبایە کارێکی چاك بوایە و ئیمان بەوە زیادی بکردایە ئەوە چـەندین کـەس خۆی بۆ تەرخان دەکرد و دەبوو بە بەشێك لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، ئـەنجا ئەو بەڕێزەش کە ئەڵێ بە بیستنی دڵم پاراو دەبێ بە یادی خواو پێغەمبـەری خــوا (صــلی الله علیــه وســلم) ئــەڵێم : ئــەوە تــۆ بەکــەمی گــوێ دەگریــت لــە گۆرانییــە ئیســلامیەکان و ســرودەکان ڕۆژ لــە دوای ڕۆژ وات لــێ دێــت ئەگــەر وریای خۆت نەبیت ئەوانە دەبنە بەدیلی قورئان و زیکر و دوعـاکردن وەزیـاتر مەیلت بۆ شیعر و سرود و گۆرانییەکان دەچێت ئەنجا خەیرێکی زۆر لەدەست دەچێت ، ئـەنجا ئـەڵێم ئینتــەرنێت و ســەتەلایت دوو ئـامێری چـاکن و بـواری خزمـەتکردنیان زۆر تێدایـە بەکۆمەڵگـە ئەگـەر بـە چـاکی بـەکار بهێنرێـت وە قیـاس کردنـی بـە ئامێرەکـانی گـۆرانی و مۆسـیقا زۆر دوورن لەیەکـەوە ، وە کەئــەڵێی لەســەردەمی پێشــوودا نــەبووە بــۆ ئــەم برگەیــەت پــێم خۆشــە ڕونکردنەوەیەکت پێشکەش بکەم دەربارەی بیدعە :

**بیدعه جۆری زۆره لەوانه :**

**یەکەم :** بیدعەی دینی .

**دووەم :** بیدعەی دونیایی .

**سێ یەم :** بیدعەی زمانی .

**یەکەم :** بیدعەی دینی هەمووی خراپە و ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێویستی بە داهێنانی ئاین نییە ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً) وە چاك و خراپی نیە بەڵکو هەموو بیدعەیەکی ئاینی گومڕاییە بەبەڵگەی ئەو حەدیسەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت "من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد" واتە : هەرکەس بیدعە لەم دینەی ئێمە بکات و لەدین دا نەبێت ئەوا قەبوڵ ناکرێت (تەماشاکە دەفەرموێت لەم دینەی ئێمەدا) .

**دووەم :** بیدعەی دونیایی : ئەم بەشە تایبەت نییە بەسەردەمێکەوە وە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هانی شوێنکەوتوانی دەدات بۆ بەدیهێنان و نوێکاری و بەدەست هێنانی شتی خزمەتگوزاری بەکەڵك و بەسود ، تەنها مەرج ئەوەیە ئەو شتانە دژ بە ئیسلام نەبن وەکاری ناشەرعیان پێ نەکرێت ئەوکاتەش شتی بەکەڵك و بەسودی پێ بکرێت و شتەحەرامەکانی قەدەغە دەکرێت .

**سێ یەم** : بیدعەی زمانی : وەك ئەوەی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەردەمی خیلافەتی خۆیدا کە جارێکی تر موسڵمانانی لەسەر نوێژی تەراویح کۆکردەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەبەر واجب نەکردنی وازی لێهێنابوو لەسەر هەمان نوێژ و هەمان ژمارەی ڕکاتەکان و بەجەماعەت وەك چۆن لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرا ، بۆیە فەرمووی : (نعمت البدعة هذه) ئەمەش هیچ پەیوەندی بە حەڵاڵ و حەرامەوە نییە لێرەدا دەبێ هەموو لایەك ئەوە بزانن کاتێك شوێنکەوتوانی سەلەف باسی بیدعە دەکەن ئەوە باس و دیاری کردن و تێگەشتن و پۆلێن کردنیانە وە لەسەر ئەو سێ تەوەرە دەڕوات . ئەنجا ئەو قیاسەی کردووتە کە دەڵێیت ئیمامی عومەر دەستبڕینی دزی بەکار نەهێناوە ، بزانە :

یەکەم : ئەمە لە ساڵی برسێتی و لەنەبونیدا بووە ( **عام المجاعة**) .

دووەم : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەکاتی شتی واجب دەفەرموێت "وما أمرتكم به فأتوا منه ماستطعتم" مەبەستم بڕگەی ( **ما استطعتم**) بەڵام لەباسی حەرامدا دەفەرموێت "**وما** نهيتكم عنه فاجتنبوه" دەبینی باسی (**استطاعة**)ی تێدانییە و هەردەبێ نەکرێت ، ئەنجا کە دەڵێی زۆربەی مەلاکان ئەڵێن حەلاڵە :

یەکەم : زۆرینە هەرگیز بەڵگە نەبووە دەبینی زۆربەی خەڵك ڕقی لە ڕاستیە (وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ) ، ئەنجا لەگەڵ ڕێزماندا بۆ مەلاکان بەلاّم فەتوا کاتێك وەردەگیرێت بەڵگەی هەبێت ، زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ وتوویانە لەوانە :

یەکەم : أبو **حنيفة** : دەفەرموێت (لا يحل لأ أن يأخذ بقولنا ما لم يعلم من أين أخذناه) .

دووەم : مالك ئەفەرموێت : (إنما أنا بشر أُخطيء و أُصيب فانظروا في رأيي فكل ماوافق الكتاب والسنة فخذه وكل ما لم يوافق الكتاب والسنة فاتركوه)

سێ یەم : الشافعی : دەفەرموێت (كل ما قلت فكان عن النبي صلى الله عليه وسلم خلاف قولي مما يصح فحديث النبي أولى فلا تقلدوني) .

چوارەم : ئیمامی ئەحمەد ئەفەرموێت : (لا تقلدني ولا تقلد مالكاً ولا الشافعي ولا الأوزاعي ولا الثوري وخذ من حيث أخذوا) .

بۆ زیاتر ئاشنابوون لەم ووتانە بڕوانە پێشەکی کتێبی (صفة صلاة النبي صلى الله عليه وسلم)نوسینی شێخ ئەلبانی .

وە ئەو بڕگەیەی کە بەڕێزێکی تر دەیکات لە ئاوەها پرسیارێکدا کە باس لە ڕاگەیاندنی ئیسلامی دەکات کەگوایە لە کوفرو خەڵوەتدا دەبن ، نا ئێمە بە کوفری نازانین و ڕێزیشمان بۆ هەموو لایەك هەیە کە خزمەتی دروستی ئیسلام بکات ، بەلاّم ڕەنگە ئەوان لە ژێر فشاردا بن و نەتوانن خۆیان ڕاگرن یان بوونی هەندێ کەس کە لەناو قیادەی ئیسلامییەکاندا کە زۆر لای گرنگ نییە حەلاڵ بێت یان حەرام ، چونکە پەروەردەیەکی سیاسی بووە و بەتەواوی لەسەر حەلاڵ و حەرام پەروەردە نەبووەتەوە بە تایبەت لەبەر ململانێی سیاسی و حزبی بۆیە ناچار دەبێ ئەو بۆچونەی خۆی تەعمیم دەکات بەسەر هەموو لایەنگرەکانیدا و لایەنگرانیش لەبەر کەمی زانست و متمانەیان بە قیادەی خۆیان پاساوی بۆ دێننەوە .

وە ئەو بڕگەیەی ئەم بەڕێزە باسی دەکات کە ئەڵێ امام محمد غزالی گوێی لە گۆرانی گرتووە ..

یەکەمجار (محمد الغزالی) کەسێکە لەم سەردەمە ژیاوە نەزانایە و نە ئیمام بەڵکو نوسەرێکی چەواشەکاری دوژمنی مەنهەجی سەلەفی بووە تامردنی ، وە ڕاو بۆچوونی سەیر و ناقۆلاّی هەیە بەتایبەت لە کتێبی (**السنة النبوية**) وە ناوبراو بریتی نیە لە ئیمامی غەزالی زانای بەناوبانگ کە لەسەدەی

شەشەمدا ساڵی (٥٠٥) ی کۆچی مردووە . وە گەورەترین شایەت لەسەر خراپێتی محمد غەزالی سەردەم ئەوەیە کە گوێی دەگرت لە گۆرانییەکانی (**أم کلثوم**) ی میسری کە هەرگیز زانایانی ئیسلام شتی وایان نەکردووە .

**پ ١٣٠/سلاّوی خوای گەورەتان لیّ بیّ بەڕێزان من گەنجێکم سوپاس بۆ خوا لەمناڵیەوە نوێژ ئەکەم و سونەتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە جیّ ئەهێنم وە لەماڵەوە ئینتەرنێتم هەیە دوای ئەوەی کە شتی گرنگی لیّ وەردەگرم کاتەکانی ترم خەریك ئەکەم بە چاتەوە وە هاوڕێی کچیشم زۆرەکە قسە ئەکەین قەت قسەکانمان ناچێتە قاڵبی ناشەرعیەوە وائەزانم قسە لەگەڵ کوڕێکی هاوڕێم ئەکەم حوکمی ئەم کارەم چی یە؟ تێم بگەیەنن خوا پاداشتان بداتەوە.**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس بۆ خوای گەورە کە یارمەتی داویت لەمناڵییەوە نوێژ دەکەیت و سونەتەکان بەجیّ دەهێنیت یەکێك لەو کەسانەی کە لە قیامەتدا لە ژێر سێبەری عەرشی خوا دا دەبن کەسێکە (**شابٌ نشأ في عبادة الله**) واتە :

گەنجێك لە پەرستنی خوا دا گەورە بوبێت ، ئەنجا ئینتەرنێت سودو زیانیشی تێدایە هەوڵبدە تەنها سودی لێ وەربگریت و نزیکی خراپەکانی نەبیتەوە ، چاتکردن ئەگەر پێویست و سنوردار بوو قەیدی ناکات ، بەلاَم ئەگەر بۆ کات بەسەر بردن و بێ هودە بێت ئەوا نەکردنی چاکترە ، بەلاَم چاتکردن لەگەڵ کچاندا بەتەنها و بەبێ زەرورەتێکی شەرعی و بۆ گەنج و چەندین جاریش بەیەکەوە قسە بکرێت تا ببنە هاوڕێی یەکتر و بەردەوام بەیەکەوە قسە بکەن بەڕاستی ئەمە حەرامەو کارێکی ترسناکە ، و ئەو بڕگەی کە دەڵێ (وەك ئەوە وایە لەگەڵ کوڕێکدا قسە بکەم) ئەوە فێڵی شەیتانە دەبێ وازی لێ بهێنیت بۆ تاقی کردنەوەی خۆت تا بزانیت شەیتان کاری تێکردوویت یان نا دەتوانی خۆت تاقی بکەیتەوە ، ئەگەر وازهێنانت زۆر ئاسان بوو ئەوا سوپاس بۆ خوا زۆر کاری تێ نەکردوویت ، بەلاَم ئەگەر وازهێنانت لا قورس بوو ئەوە وریابە تووش بویت وە باجەکەی قورس دەبێت پەنا بەخوا بەلاَم بەهەرحاڵ کارێکی خراپە .

**پ ١٣١/ باوکم زۆر دەخواتەوە لەماڵەوە وە دەبێت من خزمەتی بکەم و پەرداخی مەشروبەکەی دەبێت من بیشۆم ئایا ئەمە حەرام نیە؟ ئەگەر نەیکەم لێم تورە دەبێت چی بکەم؟**

وەڵام :

خزمەتکردنی باوك ودایـك کـارێکی چـاکە و (واجـب)ە لەسـەر کـوڕو کـچ ، و دەبێت منداڵ لەگەڵیاندا بە چاکی مامەڵە بکات ئەگەر ئەوان کافرو (موشریك) یش بوون ، بەڵام نابێت منـداڵ هـیچ کـارێکی حـەرام بکـات یـان لەحەرامـدا گوێڕایەڵییان بکات پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ : (انما الطاعة في المعروف) واتە : گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەدایە . وە دەفەرموێ : (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) نـابێ گوێڕایـەڵی هـیچ کەسـێك بکرێـت لـە سەرپێچی کردنی خوادا .

جا نابێت یارمەتیان بدەیت لە مەشروب خواردنـدا یـان لـە شـۆردنی قـاپ و پەرداخەکانیان وە نابێ بیانکەیت . بەڵام ئەگەر توڕە بـوو تـۆ بـەئارام بـەو تەنانەت لێیشی دایت تۆ دەستی لێ بەرز مەکەرەوە ، بـەڵام بـەجوانی بڵـێ لەبەر خوا نایکەم وە هەوڵبدە کە ئەو تۆ بناسێت کە تـۆ کەسـێکی لـە خـوا دەترسی و یارمەتی نەدانت بۆ ئەو بۆ قازانجی ئەوەو بۆ ئەوەیە ئەو توشـی تاوان و سەرپێچی خودا نەبێت ، و دیسان بۆ خۆتیشە کە ئەگەر حەڵاڵ بوایە ئـەوە منـیش دەمخـوارد ، هـەرکات توانیـت بەئەدەبـەوە لـەم ڕاسـتییەی بگەیەنیت ئەوە إن شاء الله وازت لێ دێنێ و دەستخۆشـیت لـێ دەکـات خـوا یارمەتی هەموو لایەکمان بدات .

پ ١٣٢/ بەرێزەكانم من كاتێك كە كەسێك تورەم دەكات ناو ناتۆرەی لێ دەنێم تائێستا چەند جار ویستومە بەسەر خۆمدا زاڵبم نەم توانیوە ئەگەر چی باش دەزانم كەخودا بەدەقی ئایەت ناو ناتۆرەی حەرام كردوە هەردوای ئەوەی دەیڵێم دەست بەجێ پەشیمان دەبمەوە ئایە من گوناهبار دەبم ؟یانی بەوە فاسق دەبم ؟چی بكەم باشە؟

وەڵام :

تورە بوون سیفەتێكی خراپە و پێویستە مرۆڤی موسوڵمان خۆی بەدوور بگرێت لەو سیفەتەیە ، وە پێویستە كەسایەتی موسوڵمان دیراسە وخوێندنەوەی چاك بكات و لە ئەسڵی سیفەتی تورە بوون تێ بگات كە چەند كوشندەیە و ناشایستەیە بۆ موسوڵمان و نەخۆشی و نوقسانیە لە مرۆڤدا ، ئەوەتە كەسێك هاتە لای پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم فەرمووی : (أوصني فقال لا تغضب فردد مراراً قال لا تغضب) رواه مسلم .ئەو كابرایە داوای ئامۆژگارییەكی بەسودی لە پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم كردووە دەبینی بەردەوام فەرموویەتی (تورە مەبە) ، چونكە تورە بوون مرۆڤ لەباری ئاسایی و هۆش و بیر دەباتە دەرەوە ، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە رۆشنبیری چاكت هەبێت بە تایبەت لەسەر هۆكارەكانی تورە بوون و ئەنجامە

**خراپەکانی بەتایبەت کاتێ کەسێك تورە دەبێ تەماشای بکە چەند خراپ و بێ کەڵکە ئاواش بزانە تۆش وایت ئەما ناوناتۆرە و قسەی خراپ بەخەڵك وتن بێگومان حەرامە و ئینسان پێی فاسق دەبێت ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەفەرموێ :** (سباب المسلم فسوق وقتاله كفر) **رواه مسلم ، وە دەفەرموێ :** (المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده) **رواه مسلم .**

ئەوەشمان لەبیر نەچێت ترسان لە خوا و شەرم کردن لێی وە رێز لە خۆ و خەڵك گرتن باشترین چارەسەرە .

## پ ۱۳۳/ نینۆك درێژکردن حەرامە؟

نینۆك کردن و پاکڕاگرتنی نینۆکەکان یەکێکە لە دروشمەکانی پێغەمبەران و دروشمی موسڵمانان ، وەك لە فەرموودەی أبو هريره دا هاتووە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی : "خمس من الفطرة : الاستحداد والختان وقص الشارب ونتف الإبط وتقليم الأظفار" رواه الجماعة .

واتە : پێنج شت لە فیترەت و ئیمانن :

۱–خۆ قەدەغە کردنی ئەو ژنەی مێردەکەی دەمرێت تاماوەی تەواو بوونی (عدّە) .

۲– خەتەنەکردن .

٣- سمێڵ کردن .

٤- هەڵکەندنی مووی بن باڵ .

٥- نینۆك کردن .

جا درێژ کردنەوەی نینۆك کارێکی پیس و حەرامە و پێچەوانەی ئەو فیترەتەیە کە مرۆڤی لەسەر دروستکراوە و فەرمانی پێ کراوە ، لەوەش خراپتر ئێستا کەسانی خراپ و تاوانبار و عاشق وخنکاو لە ناو دەریای بێ بنی شەیدا بوون و بێهۆشیدا ئەو کارە ئەنجام دەدەن تاوەکو بووەتە هۆی ناسینەوەی ئەو کەسانەی ئەوە ڕەفتاریانە بۆیە ، یەکێك لە نیشانەکانی لەدەستدانی ژیری و هۆش و فام لای کەسانی ئارەزووپەرست و عەودالانی ڕەگەزی بەرامبەر بەبێ شەرعی ئەوەیە نینۆکت درێژ بکەیت ئەگینا کەسی پاك و بەئیمان و ئازاد کە خۆی نەخستبێتە داوی شەیدابوونەوە پێویستی بەو جۆرە کارانە نییە .

**پ ١٣٤/ داواتان لێ دەکەین کە بە ڕوونی پێناسەو حوکمی دڵداری و خۆشەویستیمان بۆ بکەن.**

**وەڵام :**

پێناسەی دڵداری : بریتی یە لە : پەیوەندییەکی مۆڵەت پێ نەدراو لە نێوان هەر دوو ڕەگەزی نێر و مێ دا بەمەبەستی چێژ وەرگرتن لە یەکتر.

جا پێش ئەوەی باسی حوکمی دڵداری یان خۆشەویستی یان ئەوینداری لەشەرعدا بکەین پێویستە ئەوە بزانین مەبەست لەم زاراوانە چین ، تا بتوانین حوکمی شەرعیان بەسەردا بدەین ، چونکە وەك گوتراوە (الحكم على الشيء فرع عن تصوره) دەبێ لە پێشدا ماناو ڕاستی ئەم زاراوانەمان لا ڕوون بێت ، پێشەکی : ئەڵێم ئەم زاراوانە و چەندین زاراوەی پەیوەندی دار بەم بابەتەوە هەریەك دەلالەت لەسەر قۆناغێك یان بەشێك لەم مەسەلەیە دەکات ، جا ئەم کار و ڕەفتارە بەهەر یەکێك لەو زاراوانە ناو بنرێت ئەوە ناو لێنانێکی نادروست و ناتەواوەو واقیع پێچەوانەی ئەوەیە ، چونکە لە مێژووی عاشقاندا کە نێر و مێ حەزیان لەیەکتر کردبێ بەبێ مۆڵەتی شەرع لە قۆناغێك یان بەشێك نەوەستاوە بەڵکو پەلی کێشاوە بۆ یەکتر بینین و ڕۆچوون تیایدا و چێژ وەرگرتن و شەیدا بوونی یەك وە بۆ پێکەوە دانیشتن و گەڕان و کات

بەسـەربردن وە بـۆ ئـەوین یـەکتربوون و بگـرە چـەندین دەسـتبازی حـەرام و ئابڕوبـەر ، ئەمـەش لای هـەموو کەسـێك زانـراوە کـە بـە پەیوەنـدی بـوون ناودەبرێت بۆ نموونـە ئـەو کەسـانەی پـێش ژنهێنانیـان کـە دڵداریان کردبـێ دەبینی زۆر جار لە دوای ژنهێنانیان وازی لێ دێنن ، ئەگەر تەنها خۆشویستن بێ ئەوە کەسی خۆشەویست هەر خۆشەویستە ، بەڵام دڵداری لەگـەڵ ناکـات لەبـەر ئـەوەی ژنـی هێنـاوە کـەوابوو ئـەم دیاردەیـە بریتـی یـە لـەبوونی پەیوەندییەکی ناشەرعی لە نێوان هەردوو ڕەگەز دا ، ئەمەش نـاوێکی گشـتی یە بۆ هەموو ئەو کردارانەی هەردوو لایەنی ئەویندار ئەنجامی ئەدەن واقعی پڕ خـەم و خـەیاڵی ئەوینـدارەکانیش ئـەم ڕاسـتی یـە دەسـەلمێنێ ، جـا ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلام بـۆ پاراسـتنی ڕەوشـت و ئـاین و بەرژەوەنـدی کۆمەڵایـەتی مۆڵەتی نەداوە بەوەی ڕەگەزی نێر و مێ پەیوەندی بەیەکەوە دروست بکـەن تـەنها لـە ڕێگـەی ژنهێنـان و شـوکردنەوە نـەبێ ، ئەمـەش چـەندین سـودو بەرژەوەنـدی بـۆ تـاك و کۆمەڵگـەی تیادایـە ، بـۆ نموونـە ئەگـەر مۆڵـەت بـە خۆشەویستی بدرێ و ڕەها بێت هەردوو ڕەگەز بواریان پێ بدرێت هەریەکەیان هەرکەسێکی خۆشبوێت خۆشی بوێـت و پەیوەنـدی لەگـەڵ بکـات ، لەوانەیـە کەسی وا هەبێت چەند کەسێکی خۆشبوێت و دڵ بدات بە چەند کەسێك ، ئایا چارەسـەر چـی دەبێـت چارەسـەریش نییـە تـەنها ئەوەیـە خۆشەویسـتی

سنووردار بکرێت ئەگەر کەسێ بڵێ ئەی ڕاتان چی یە بەکەسێك گەر حەزی لە کچێك یان ژنێك ڕێگر چیە پەیوەندی لەگەڵدا هەبێت ، ئێمە ئەڵێین ئەگەر پێش یەکتر خۆشویستن و پەیوەندی بونیان گرێبەستێك (عقد) یك نەبێت تا مافیان بەسەریەکەوە دابین و پارێزراو بکات ئەوە کارێکی هەرزانەیە و زیان بەخشە ، و لەوانەیە یەکێکیان یان هەردووکیان ستەم لەویتر یان لەیەکتر بکەن وە بەوەفابوون و ڕاستکردن لەگەڵ یەکدا مسۆگەر ناکرێت ، و لەوانەیە لایەنێك لەو دوانە پەیوەندی لەگەڵ چەند کەسێکی تردا دروست بکات ئەگەر مرۆڤ بۆی ڕەها بکرێت حەزی لە هەرکەس کرد خۆشی بوێ و پەیوەندی لەگەڵ دروستکات جا بۆ ئەوەی کۆمەڵێك نەبنە قوربانی ومافەکانیان بپارێزرێت پێویستە عەقدێك هەبێت ئەم گرێبەستەش بەباشترین شێوە ئیسلام سەلماندوویەتی کەمافی کەسی و ئاینی و کۆمەلآیەتی و ڕەوشتی تیادا پارێزراوە .

کەوا بوو حوکمی خۆشەویستییەك یان دلّدارییەك یان ئەوینێك هەموو ئەو موخالەفاتانە لە خۆ بگرێت وەك چۆن لە واقعدا دەیبینین بێ گومان حەرامە و لاڕێبوونێکی ڕەوشتی گەورە و ترسناکە و کۆمەڵگا دەبێتە قوربانی ئەو هەڵەیە ، چونکە ئەم شتانە لە ئەویندارى دا ڕوودەدات :

**یەکەم : بۆ یەکتر ڕوانین پێش مارە بڕین ئەمەش حەرامە و خوای گەورە دەفەرموێ :** {قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ} سورة النور(٣٠).

**دووەم : بەتەنها لەگەڵ یەکبوون** (الخلوة) **پێغەمبەری خوای صلی اللە علیە وسلم دەفەرموێ :** (لا يخلون رجلٌ بامرأة إلا كان ثالثها الشيطان) ترمذی **ڕیوایەتی کردووە** (٢٨٤/٦) حديث صحيح غريب . **واتە : هەرگیز پیاوێك لە گەڵ ئافرەتێکدا بە تەنها نابن ، ئیللا شەیتان سێیەمیان دەبێت .**

**سێ یەم : دەستبازی و چێژ وەرگرتن لە جەستەی یەکتر** (لأن يطعن في رأس أحدكم بخيط من حديد خير له أن يمس امرأة لا تحل له ) أخرجه الطبراني في الكبير برقم ٤٨٧ و صححه الألباني في الصحيحه برقم ٢٢٦ .

**چوارەم : گوێڕایەڵی نەکردنی قسەی دایك و باوك کە شارەزاترین کەسن بۆ چارەنووسی کچ یان کوڕ پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم دەفەرموێ :** ( إذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه...) .

**وە چەندین زیان و خراپەی تر لەوانە :**

١- تووشبوون بەنەخۆشی (ئەوین) و لەدەستدانی عەزیمەت و زاڵکردنی ئارەزووەکان بەسەر ژیری و شەرعدا ، زانایان ئەوینیان بەنەخۆشی کوشندە داوەتە قەڵەم تەنانەت بەبەشێك لە شیرکیان داناوە .

٢- ڕێگە خۆشکردن بۆ ئەنجامدانی داوێن پیسی لەبەر ئەوەی هۆکارە بۆ زیناکردن وکاری خراپ لە ئاینی ئیسلامدا بەیاسای (سد الذرائع)قەدەغە کراوە .

٣- شکاندنی سنووری ڕەوشتی ئیسلامی و کۆمەڵایەتی و پەرەپێدان بەناپاکی و دڵنیا نەبوون لەیەکتر .

لە کۆتایدا ئەڵێم :

١- پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ : ( الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ ،والإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ) چاکە و شتی حەلاڵ دڵ پێی ئاسودە دەبێ وخراپەش ئەوەیە دڵ پێی ناخۆش بێ .

**٢- ئایا ئەو کەسەی گاڵتە بەڕەوشتی خەڵکی تر دەکات پێی خۆشە کەسانی تر لەگەڵ خوشك و دایکیدا پەیوەندیان هەبێت ، بۆیە داواکارم لەگەنجان بە کوڕ و کچەوە هەموویان شوێنی هەنگاوەکان نەکەون و ساختەی شەیتان**

**کاریان تێ نەکات و شوێنی چارەسەری ئیسلام بکەون کە بریتی یە لە ژنهێنان و مێردکردن .**

**پ١٣٥/ ئایا ڕابواردن لەگەڵ خێزانی خۆتدا لە ڕێگەی کۆمەوە بە کۆندۆمەوە واتە (کیس) دروستە؟**

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

ڕابواردن و جووتبوون لەگەڵ خێزاندا لە پاشەوە دروست نیە و یەکێکە لەتاوانە گەورەکان جا ئەگەر خستنە ژوورەوەی ئەندام بە ڕووتی بێت یان بە کوندومەوە (کیس) چونکە جێگای ڕابواردن لەگەڵ ئافرەتدا دیاری و دەست نیشان کراوە وەك خوای گەورە دەفەرموێ : { فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ } (٢٢٢) سورة البقرة .

**پ ١٣٦/من خۆشحاڵم ودەستخۆشیتان لێ دەکەم ئایا ئەگەر کەسێك بە هەڵە چووبێتە لای خێزانی لە کۆمەوە پاشان پەشیمان بێت ئایا چی بکات خوای گەورە لێی خۆش دەبێت وە ئایا تەڵاقی دەکەوێت؟**

**وەڵام :**

خوای گەورە هەموو لایەکمان خۆشحاڵ بکات ئێمەش هیوای سەرکەوتن بۆ تۆ لە خوای گەورە دەخوازین .

چوونە لای خێزان لە کۆمەوە تاوانێکی گەورەیە و بە کوفری بچووك دانراوە وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ : (من اتى حائضاً أو امرأةً في دبرها فقد كفر بما أنزل على محمد) کەفەرموودەیەکی صحیحە جاپێویستە مرۆڤی موسوڵمان خۆی بپارێزێت وەزاڵ بێت بەسەر ئارەزووەکانیدا و سنوری خوای گەورە نەشکێنێت خوای گەورە دەفەرموێت : { فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ } (٢٢٢) سورة البقرة

واتە : بچنە لای خێزانەکانتان لەو جێگایەی فەرمانتان پێ کراوە . جا ئەگەر کەسێك ئەو کارەی کرد نەیزانی ئەوە کۆمە و جێگای دیاری کراوی شەرعی نییە ، بەڵکو خوای گەورە لێی خۆش بێت ، چونکە هەڵە کردن قەڵەمی لەسەر هەڵگیراوە وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : (ان الله تجاوز عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه) رواه ابن ماجه و صححه الألباني .

واتە : خوای گەورە لێخۆشبووە لە ئوممەتی من لە هەڵە کردن بێ ئەنقەست و لەبیر چوو و زۆر لێ کردن .

وە سەبارەت بەوەی کە تەلاقی بکەوێت هیچ شتێکی لەسەر نەهاتوە و تەلاقی ناکەوێت .

## پ ١٣٧/ وە غسل العار چیە و حوکمی چیە؟

**وەڵام :**

عار وشەیەکی عارەبی یە ناوێکە بۆ هەموو شتێك کە مرۆڤ پێی سووك و عەیبدار بێت لەکاتی نەفامی و پێش ئیسلامدا کچان زیندە بەچاڵ دەکران وەکو قورئان بۆمان تۆمار دەکات : {وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ * بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ} (٨-٩) سورة التكوير

واتە : کاتێك کچی زیندە بەچاڵکراو پرسیاری لێ دەکرێت بە چ گوناهێك بە چ تۆمەتێك کوژرا .

یان ئایەتی : {وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ} (١٧) سورة الزخرف

واتە : کاتێ مژدە بدرێت بە یەکێکیان بەوەی کە کچیان بووە ئەوە ڕوخساری ڕەش هەڵدەگەڕێت و لەدەروندا پیش دەخواتەوە .

ئەمە هەمووی لە پێش ئیسلامدا بەلاّم کاتێ ئیسلام هات ڕێزی زۆری لە ئافرەتان نا و هانی موسڵمانان دەدات بۆ بەخێوکردنی کچان و ئافرەتان ، کەوابوو بە چاوی کەم و عەیبەوە تەماشای ئافرەت کردنی بۆ ماوەیەکی (موروث) کۆمەلاّیەتی ، نەك ئاینی ، چونکە ئاینی ئیسلامی گرنگی یەکی زۆری بە ئافرەتان و کچان داوە جا کۆمەڵگا بۆ نەهێشتنی (عار و عەیب) بە هۆی کچان و ئافرەتانەوە پەنایان بردۆتەوە بەر ئەزیەت و ستەم و کوشتنی ئافرەتان و کچان بە هۆی بوونی پەیوەندی سێکسی یەکێك لەوانە لەگەڵ پیاواندا بەبێ هەبوونی پەیوەندی هاوسەری یان هەر بە گومانی هەبوو ئەو پەیوەندییە ، جا بەڕاستی ئەمە هەر چەندە کارێکی حەرامە کە کچان و ئافرەتان پەیوەندی یان هەبێت لەگەڵ پیاواندا بەبێ پەیوەندی هاوسەرێتی ، بەلاّم ئەگەر کچ یان ژن هەر کەسێکی تر تاوانێك لەو تاوانانە یان گومانی ئەوەی لێ کرا نابێ کەس و کارو بنەماڵە و ئیجرائات بکەن بە کوشتن ، چونکە ئەو حوکمانە حکومەت جێ بە جێیان دەکات ، چونکە ئەگەر خەڵك بۆ خۆی ئەو حوکمانە ئەنجام بدات چەندین کوشتن و ئاشوبی گەورەی لێ دەکەوێتەوە . ئەبێت ئەوەش بزانین شەرەف و ئابڕو کارێکی گران و قورسە دەبێت پارێزگاری و پاسەوانێتی بکەین ، و دوژمنان دەیانەوێت ئێمە ئەوە لە

دەست بدەین بەڵام نابێ خوانەخواستە شتێك لەوانە ڕووی دا ئێمە ستەم بکەین بە ناوی (غسل العار)ە وە .

**پ ١٣٨/ هەندێ کەس لەڕێگەی حیزبێکەوە یاخود کەسێکەوە دامەزراوە لە دائیرەیەك دەوام ناکات و موچەش وەردەگرێت لە حکومەت ئایا ئەو پارەیە حەرامە یان حەڵاڵە؟**

**وەڵام :**

وەرگرتنی موچە لەبەرامبەر کارێکی شەرعی دا ئەگەر کەسی خاوەن موچە مافی ئەو کارەی خۆی بدات ئەوە حەڵاڵە وە پێویستە لە خوا بترسێ و تەنها وەك هۆکارێك ببیبێت ، وە پشت بە خوا ببەستێت ئەنجا مافی ئەوەی لە گەردنیدایە بیدات وە دامەزراندنەکەی تەنها بۆ پارەوەرگرتن و حزبایەتی کردن نەبێت ، چونکە ئەو پارەیە ماڵی موسڵمانانە و ئەمانەتە لە گەردنی کاربەدەستاندایە ، جا پێویستە دەوام بکات بە پێی یاسای کارپێکراوی ئەو دەزگایەی تیایدا دامەزراوە ، ئەگەر نا ئەوە موچەکەی حەارم دەبێت چونکە موچە لە بەرامبەر دەوام کردندا دانراوە .

**پ ١٣٩/ ئایا حوکمی ڕیش تاشین چیە؟وە ئەو فەرمودانە کامانەن کەباسی چۆنیەتی ڕیش هێشتنەوە وکورتکردنەوەی دەکات؟**

**وەڵام :** حوکمی دانانی ڕیش بۆ پیاوان واجبە ، وە ڕیشیش جیاکەرەوەیە لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نەهی کردووە پیاوان خۆیان بشوبهێنن بە ژنان و ژنانیش خۆیان بشوبهێنن بە پیاوان وەك دەفەرموێ : (جزو الشوارب وأرخو اللحى خالفوا المجوس) رواه البخاري ومسلم . وعن ابن عمر قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : (خالفوا المشركين أوفروا اللحى وأصفوا الشوارب –وفي الرواية– أنهكوا الشوارب وأعفوا اللحى) متفق عليه .

واتە : سمێڵتان بگرن ئەوەی کەوتووەتە سەر لێوەکانتان نەك تاشینی سمێڵ وەڕیش بهێڵنەوە و زیادی بکەن پێچەوانەی ئاگر پەرستان بکەن کە ئەوان ڕیشیان دەتاشی و سمێڵیان دەهێشتەوە .

جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بە کردەوەو بە فەرمان داوای لێکردوین ڕیشمان هەبێت وە نابێ دەستکاری بکەین ، وە هەندێ کەس حەدیسێکی هەڵبەستراو دەهێنن کە ئەمە دەقەکەیەتی : (كان يأخذ من لحيته

من عرضها وطولها) رواه الترمذي وفي سنده عمر بن هارون وهو كذاب خبيث فالحديث غير صحيح وقال الألباني موضوع انظر الضعيفة رقم ٢٨٨ .

**ماناکەی ئەوەیە هەڵبەستراوە کەگوایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ڕیشی خۆی گرتبێ لە پانی و درێژی .**

**ئەم حەدیسەدەکەنە بەڵگە بۆ لێگرتنی وە ناوی دەنێن قەڵەمکردن جا تۆ دوای ئەوەی بۆت دەرکەوت ئەو بەڵگەیە هەڵبەستراوە ئەو کاتە کارەکەیان بێ بەڵگەو ناڕەوایە .**

## پ ١٤٠/ ئایا تێکەڵاوی کوڕو کچ حەرامە یان حەڵاڵە؟ .

**وەڵام :**

**تێکەڵاوی کچ و کوڕ زیانێکی زۆری بۆ خودی کچ یان کوڕ هەیە پاشان بۆ شیرازەی کۆمەڵگە بەگشتی وە مەترسی یەکی زۆری هەیە لەسەر ئایین و ڕەوشتی نەوەکان ، لەبەر ئەوەی خوای گەورە مەیل و ئارەزووی بە هێزی لە پیاوان و ئافرەتاندا بەرامبەر یەکتر دروست کردووە بۆ ئەوەی بە ڕێگەی شەرعی سوود لە یەکتر ببینن ، بەڵام تێکەڵاوی کە ڕێگەیەکی شەرعی نییە بۆ سود لەیەکتر وەرگرتن چەندین شتی حەرامی تیادا دروست دەبێ لەوانە وەك نمونە ڕوانین بۆ یەکتر خوای گەورە دەفەرموێ :** {قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ

أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ} (٣٠) سورة النور .

**لێرەشەوە زیان دەست پـێ دەكـات و ناشوەسـتێ جـا بـۆ چارەسـەركردنی یەكجاری دانایانـە خـوای گـەورە تێكـەڵاوی قەدەغـە كـردووە تـەنها ناچـاری نـەبێت خـوای گـەورە دەفـەرموێ :** {وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلاَ تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى} سورة الأحزاب(٣٣) **واتە : لە مـاڵی خۆتـان بمێننـەوە وەك سـەردەمی نـەفامی خۆتـان ڕووت مەكەنـەوە (چـونكە بەڕۆشـتنتان بـۆ دەرەوە پیـاوان تەماحتان تێ دەكەن).**

**پ ١٤١/ من تەمەنم 21 ساڵە بۆ ماوەی 4 ساڵە سەردانی خزمەكانم نەكردووە ، بەڵام ئەوان سەردانم ئەكەن،ئایا حوكمم چیە ؟**

**وەڵام :**

**سەردان و بەسەركردنەوەی خزمان گەیاندنی** (صلة الرحم) **ە و حەقێكی شەرعی خزمانە بەسەر یەكەوە و پچڕاندنی حەرامە و یەكێكە لە تاوانە گەورەكان ، خوای گەورە دەفەرموێ :** {فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ * أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ} (٢٢-٢٣) سورة محمد

واتە : ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لە غەزا پشت هەڵبکەن یاخود دەسەڵاتتان کەوتە دەست تۆوی ئاژاوە و فەساد و تاوان لە زەویدا بچێنن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیبچڕێنن و لە ناوی بەرن .

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ : (لا یدخل الجنة قاطعٌ) قال سفیان في روایته یعني قاطع رحم . متفق علیه .

واتە : ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێ ناچێتە بەهەشتەوە ، ئەمەش بەڕاستی هەڕەشەیەکی زۆر گەورەیە و دەبێ موسوڵمان لە بەرامبەر ئەم مەسەلە گرنگەدا بە پێی ڕێنماییەکانی ئیسلام ڕەفتار بکات کە فەرمان دەکەن بە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی ، بەڵکو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : (إن أبرّ البرِّ أن یصل الرّجل ودّ أبیه) واتە : باشترین چاکە ئەوەیە سەردانی خۆشەویستەکانی باوکت بکەیت جا زوو پەشیمان بینەوە لەم جۆرە تاوانانە خوای گەورە یارمەتی دەری هەموو لایەکمان بێت .

**پ ١٤٢/ بەناوی خوا : پرسیارێکم هەیە کوڕەکەم دەتوانێ کاری ڕۆژنامە فرۆشی بکات ، بەڵام ئەو ڕۆژنامانە هەموو جۆرە ڕێکلامێکی تێدایە تاچەند ئەو کارە حەرامە؟ وە ڕۆژنامەکەش هی مەسیحیە. خوای گەورە خێرتان بنوسێ.**

**وەڵام :**

**خوای گەروە دەفەرموێ :** {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ} (٢) سورة المائدة

**واتە : یارمەتی و هاریکاری یەکتر بدەن لەسەر کاری چاکە و تەقوا ، و یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر تاوان و دوژمنکاری .**

**زانایان لەم بەڵگە و چەندین بەڵگەی تر ئەوەیان بۆمان ڕوونکردۆتەوە یارمەتی دانی تاوان یان تاوانبار حەرامە و هەمان حوکمی ئەوانی هەیە جا ئەو کەسە با کارێکی تر بکات خوای گەورە** إن شاء الله **بۆی قەرەبوو دەکاتەوە ، وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ :** (من ترك شيئاً لله عوضه الله خيراً منه) **واتە : هەرکەسێك شتێك لەبەر خوای گەورە وازی لێبێنێ ئەوە شتێکی چاکتری پێ دەبەخشێت .**

## پ ١٤٣/ ئایا سەیرکردنی فلیمی کەناڵی سەحەر حەرامە؟

**وەڵام :**

سەیرکردنی فلیم بەڕاستی کامیان سوودیان هەیە و زیانیان نەبێت بەتایبەت بوونی ئافرەتان لەو فلیمانەدا هەرچەندە کەناڵی سەحەریش بێت ، چونکە بەڕاستی ئەو فلیمانە جوانی ئافرەتان دەردەخەن بگرە زۆرێك لەو فلیمانە بانگەشەی دڵداری و حەلاڵێتی دروستکردنی پەیوەندی کچان و کوڕان دەکەن ، هەروەها بانگەشە دەکەن بۆ ئەوینداری وە ناوی دەنێن ئەوینی پاك ، ئەگەر بە ووردی سەرنجی فیلمە دۆبلاژکراوەکانی سەحەر بدەین ئەوینداریيەکی قوڵ دەچەسپێنێ لە ناخی لاوەکانماندا تەنانەت ئەوە دروست دەکات هەموو کەسێك لە کوڕان و کچان پێشی هاوسەرگیری دەبێ خۆیان تاقی بکەنەوە بە بوونی پەیوەندی لەگەڵ بەرامبەردا ئەگینا سەرکەوتوو نابن ، بۆیە ئەم کەناڵەش بە شێوازێکی تر زیانی هەیە هەرچەندە فیلمی کۆمەلآیەتی و پەروەردەیی وشتی باشیش باس دەکات ، بەلآم بزانن یان نەزانن وەك ئەوە وایە حەلْوا بەکەسێك بدەیت ژەهری تیا بێت ، ئەنجا موسڵمان زۆر لەوە گەورە ترە فەرهەنگ و ڕۆشنبیری خۆی کورت بکاتەوە لە

کەناڵێکی لەو جۆرە خوای گەورە هیدایەتی هەموو کەناڵەکان بدات بۆ خزمەتکردنی ئاین و ڕەوشت و کۆمەڵگەی موسڵمانان .

**پ ١٤٤/ نەزەر چیە ؟ئەگەر لە بازاڕ خزمێك ببینی چاك و خۆشی و هەواڵ پرسی بکەی سەیری بکەی یان من قوتابیم مامۆستاکەمان حیجاب نیە لە کاتی وانە شەرح کردن مەجبووری سەیریکەی یان سەیر کردنی ئەو دراما تەلەفزیۆنیانە وەکو تەلەفزیۆنی سەحەری ئێرانی کە حیجابی تەواون ئەوانە نەزەرن یان نە ؟**

**وەڵام :** نەزەر بریتی یە لە سەیرکردنی ئافرەتێك کەوا مارە کردنی لێت حەلاڵ بێت ، واتە نامەحرەم بێت وەك ئامۆزا و خاڵۆزا و براژن ...

بەلاَم سەیرکردنی ڕوومەت و دەستی ئەو ئافرەتانەی کە مەحرەمتن وەك دایك و خووشك و میمك و برازا و خووشکە زا ، واتە ئەوانەی کەوا مارەکردنیان لێت حەلاڵ نی یە دروستە .

کەواتە سەیرکردنی ئافرەتی خزم و مامۆستا و هەروەها ئەو ئافرەتانەش کەوا لە تەلەفزیون دەردەچن حەرامە و دروست نی یە ئەگەر چی پۆشتەش (حیجاب) بن چونکە ڕوومەتیان بە دەرەوەیە ، ئاشکراشە جوانی ئافرەت زیاتر لە ڕوومەتیدا دەردەکەوێت

**پ ١٤٥/ سەیر کردنی فلمی ڕووت لە گەڵ خێزانی خۆت دا تاچەند گوناحە؟**

**وەڵام :**

سەیرکردنی فلمی ڕووت خۆی گوناهە و هۆکاریشە بۆ گوناهی گەورە وخراپ تر ، ئەنجا بێ شەرمییەکی گەورەیە لەبەرامبەر خوادا و دوورکەوتنەوەیە لە ڕەحمەتی خوا ، بەڵام لەگەڵ خێزاندا تەماشای فیلمی خراپ سەرەڕای گوناهی بۆ خۆت گوناهی ئەویشت لەسەرە چونکە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی : (كلكم راعٍ وكلكم مسئول عن رعيته) واتە : ئێوە هەمووتان چاودێرن هەموشتان لێپرسراون بەرامبەر ژێردەستەکانتان ، ئەم کارە نەك هەر گوناهە و بەس بەڵکو لەدەستدانی غیرەت و پیاوەتیشە چونکە کەسی ناوبراو بەم کارەی خێزانی ڕادەهێنێت لەسەر کاری خراپ و ئارەزوو و شەهوەت لە خێزانیدا دەجولێنێت وە ئاراستەی دەکات بۆ شتانێکی خراپ.

**پ ١٤٦/ ئایا کوتانی خاڵ حەرامە لەسەر لەش؟**

**وەڵام :**

خاڵ کوتان بۆ پیاوان یان ئافرەتان کارێکی حەرامە و بەدەقی فەرموودە قەدەغە کراوە بەم فەرموودەیە لە (ابن عمر)ە وە خوای لێ ڕازی بێت ئەڵێ

**پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی :** (لعن الله الواصلة والمتوصلة والواشمة والمتوشمة) رواه البخاري ومسلم .

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لە کەسێك قـژی دەسـتکرد بـۆ کەسـێك دروست بکات وە لەو کەسەش بۆی دروست دەکرێت وە لەو کەسەش خاڵ بۆ کەسی تر دەکوتیٚ و ئەوەش بۆی دەکوتریٚ . کەوابوو ئـەم کـارە یەکێکـە لـە تاوانە گەورەکان چونکە لەعنەتی تیادایە .**

**پ ١٤٧/ کوڕ و کچ بەمۆبایل یان بە ئینتەرنێت نامە (chat) بۆ یەکتر بنێرن حەرامە؟ئایا ئەو کردەوەیەوە بەخەڵوەت حساب ئەکرێت؟ بە چ بەڵگەیەك؟.**

**وەڵام :**

**ئەسڵ ئەوەیە لەشەرعدا کچ و کوڕ یان پیاو و ئافرەت بەیەکەوە قسە نەکـەن مەگەر پێویست بێت ، جا قسەکردن بە مۆبایل یان نامە گۆڕینەوە یـان چـات کردن بە ئینتەرنێت بە بیٚ بوونی هۆکارێکی شەرعی وە ڕێگەچارەی تر ببێـت ئەو کاتە حەرامە ، چونکە لەم سنورە ناوەستیٚ و دەبێتە دەرگایەك بۆ شـتی خـراپتر بـەلاٌم ئەگـەر ناچـار بـۆ مەبەسـتێکی شـەرعی بـەکار هێنـرا ئـەوا بـا کەسێکی مەحرەم هەبێت لە نێوانیاندا ئەگەر ئەم مەرجانە نەبێت ئەوکاتە بـە**

خەڵوەت حیساب دەکرێت ، چونکە دەتوانن بە نهێنی هەموو قسەیەك بکەن ئەمەش جۆرێکە لە خەڵوە یان دەتوانین بڵێین خەڵوەی بچووك وە ڕێخۆشکەرە بۆ خەڵوەی گەورە .

لە ئیمامی عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : (لا يَخْلُونَّ رجلٌ بامرأةٍ إلا كان ثالثها الشيطان) رواه الترمذي برقم ٢١٦٥ .

دەبینی خەڵوە قەدەغەیە بەبێ قسەکردن بەبێ کاری خراپ چ جای قسەکردن و پەیوەندی و نامە گۆڕینەوە کاتێ شەریعەتی ئیسلام خەڵوە حەرام دەکات ، چونکە ڕێگەیە بۆ حەرام هەروەها قسەو چاتکردن ئەگەر ناچار نەبوو ڕێگەیە بۆ حەرام وە واقعی خەڵکیش شایەتە کە کەسانێکی زۆر لە گەنجەکانمان بەهۆی چاتی کوڕ و کچەوە زیانیان لێکەوتووە .

**پ ١٤٨/ ئەگەر نامەحرەمێکت بینی خۆشتویست حەرامە؟ ئەگەر حەرامە خۆ خۆشەویستی بەدەست خۆت نیە؟**

**وەڵام :**

خۆشەویستی پیاو بۆ ئافرەت یان بە پێچەوانەوە شتێکی غەریزییە و لە هەموو کەسێکدا هەیە جا مرۆڤ خوای گەورە وا خوڵقاندویەتی شت و کەسی

پاك و جوانی خۆشبوێت جا ئەم خۆشویستنە شتێكی حەڵاڵە و بەڵكو ژیان بە بێ ئەوە بەسەر ناچێت ، بەڵام شەریعەتی ئیسلام هاتووە ئەم خۆشەویستییەی كۆك كردووە وە وای كردووە كە لە شوێنی خۆیدا بەكار بێت ئەویش بەشەرع كردنی ژنهێنان و شوكردن و بەڕەوادانانی ژیانی هاوسەرگیری ، دەتوانین بەشێوەیەكی تر بڵێین خۆشەویستی ڕەها قەدەغەیە و لە جێگەی ئەمە بۆ ڕێك وپێك كردنی كۆمەڵگا و باش بەڕێوەچوونی خۆشەویستی سنووورداری داناوە كە بریتی یە لە خۆشەویستی ژن و پیاو بەڕێگەی شەرعی جا لەباسی بەشی یەكەمدا كە بریتییە لە خۆشویستنی ئافرەتان بەڕێگەی نادرووست و ئارەزوومەندانە و حەزكردن لەكاری خراپە و زیناكردن خوای گەورە زەمی كردووە كە دەفەرموێ : ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ ....﴾ سورة آل عمران(١٤) . واتە : خۆشەویستی و ئارەزووكردنی چێژ وەرگرتن لە ئافرەتان بۆ خەڵكی لە لایەن شەیتانەوە ڕازێنراوەتەوە .

وە لەبەشی دووەمدا كە بریتی یە لە خۆشەویستی پەسەند و بەسوود دەفەرموێ : ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ سورة الروم(٢١) .

واتە : یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارامبگرن لە لایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە بەڕاستی لەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوە و تێدەفکرن .

**پ ١٤٩/ ئایا تاوانی کەسێکی موسوڵمان چیە کە کەوتبێتە کارێکی نێربازی یەوە؟**

**وە ئایا کەسێك ئەو تاوانەی ئەنجامدابێت و پاشان تەوبە بکات و بیەوێت ژن بهێنێت چی بکات بۆ ئەوەی ئارەزووی لە ژن بێت؟ ئایا بەکارهێنانی ماددەکانی زەوق وەکو ڤیاکرا حوکمی جیە؟**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**تاوانی نێربازی جەریمەت وتاوانێکی گەورەیە دژی دروستکردن و فیترەت و ئاین و دونیایە بەڵکو دژی خودی ژیانە ، خوای گەورە تۆڵەی لەنەتەوەی لوط سەند بە توندترین شێوە کە بەردی بەسەردا باراندن لەسزای ئەو کارە پیسەیان وە لە قورئاندا وەك پەندێك تۆماری کردووە کە دەفەرموێ :** {وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ * إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاء بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ} (٨٠-٨١) سورة الأعراف

عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال " من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به" رواه أبوداود والنسائي وابن ماجه وصححه الشيخ الألباني في الإرواء ٢٣٥ و المشكاة ٣٥٧٥ .

ئیسلام کاتێ سزای سەختی وا بۆ ئەو کردەوەیە دائەنێت ، چونکە شوێنەوار و زیانی ترسناکی لەسەر تاك و کۆمەڵگە هەیە لەوانە:

وازهێنان لە ژن ، کاریگەری لەسەر مێشك و دەمار ، تێرنەبوونی ئارەزووی مرۆڤ ، کاریگەری لەسەر دەماخ ، سست بوونی دەمارەکان ، پەیوەندی نێر بازی بەڕەوشتەوە ، پەیوەندی بە تەندروستی یەوە ، گرانەتا و دوسنتاریا و نەخۆشیەکانی زینا .. بۆیە پێویستە موسوڵمان خۆی بەدوور بگرێت لەو تاوانە و هۆکارەکانی ، و ئەگەر یەکێك بەوە تووش بوو پێویستە تەوبە بکات و هەوڵی ئەوە بدات ژنبهێنێت و پەنا بباتە بەر عیبادەت و خواپەرستی و قورئان خوێندن و وە بەکارهێنانی ماددەکانی زەوق ئەگەر مرۆڤ ناچار نەبێت دروست نییە ، بەمەرجێك پاك و بێ زیان بێت .

پ ١٥٠/ لەبازارەکاندا سرکە دەفرۆشن کە هەیە لە سێو دروست دەکرێ وە هەیە لە ترێ جۆرێکی تر هەیە خەڵك بۆ ناو زەلاتە بەکاری دێنن ، وە ئەوەش لە شەراب دروست کراوە ، زۆر کەسی موسوڵمان و نوێژکەر دەڵێن حەرام نیە ، چونکە کحولی تیا نیە وە

ئەگەر تیاشی بێت بۆ تامی چێشت حەرام نیە وە لەبەر ئەوە بەکاری دێنن بەلاّم من لە خۆمەوە ئەمە بەڕاست نازانم ئایا ئێوە دەڵێن چی؟

**وەڵام :**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**هەر خواردنەوەیەك ئەسڵەكەی پاك بێت وەكو سێو و ترێ و گەنم و جۆ ..... هتد . وە زۆری لێ بخورێت بێهۆش نەكات ئەوە كەمیشی حەلاڵە** (ما أسكر كثيره فقليله حرام) **، واتە ئەگەر زۆرەكەی بێهۆش بكات كەمەكەشی دروست نییە ، كەوا بوو سركە بەو مەرجەی زۆری سەرخۆشكەر نەبێت دروستە بەو مەرجەی لە شتە پاكەكان دروست كرابێت .**

**پ ١٥١/ ئایا جیهاد لەم ڕۆژەدا تاوەكو چ ڕادەیەك فەرزە لەسەر موسوڵمانان لە عێراق دا كە ئێستا داگیر كراوی جولەكەیە؟**

**وەڵام :**

گومان لەوەدا نی یە ولاّتی عێراق داگیركراوە و زۆر لە ولاّتانی تری ئیسلام داگیركراوە ، وە جیهاد حوكمی فەرزە لەسەر موسوڵمانان تا ڕۆژی قیامەت (فەرزی كفائی یان فەرزی عەین) ئەمە وەكو حوكمی (نظري) مەبەستم ئەوەیە

جیهاد هەرگیز نابێتە حەرام یان مکروه یان سوننەت یان حەلاڵ بەڵکو هەمیشه (واجب) ه ، بەلاّم هەستان بەم واجبە بە پێی توانایە ، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرمویّ : (وما أمرتكم به فأتوا منه ما استطعتم وما نهيتكم عنه فاجتنبوه) رواه مسلم

جا زانایان فەتوا بدەن یان نا ئەوە بۆ ئەوەیە کە ئایا موسوڵمانان دەتوانن یان ناتوانن و بە زیان دەشکێتەوه ، بۆ فەتوای زانایانی ئەهلی سوننەت لەسەری جیهاد لە عێراق من نەمزانیوە و نەمبیستووە کەسێك لە زانایانی متمانە پێکراوی ئەهلی سوننەت لەم سەردەمەدا فەتوایان دابێت لەسەر کردنی .

**پ ١٥٢/حوکمی ئەو دایك و باوکانە چی یە کە جیاوازی دەکەن لەنێوان منداڵەکانیاندا؟**

**وەڵام :**

دایك یان باوك دەبیّ دادپەروەر بێت و جیاوازی نەکات لە نێوان منداڵەکانیدا ، چونکە ئەو منداڵانە ئەمانەتن لەگەردنی دایك و باوکدا و دڵیان پاکە و گەوهەرێکی گران بەهان و پاك لەهەموو نەقش و خەتێك هەموو شتێك وەردەگرن و هەموو شتێك کاریان تیّ دەکات ، بۆیە لەسەر دایکان و باوکان

پێویستە زۆر بە وریای یەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن پێغەمبەری خوا صلی الله علیم وسلم دەفەرموێ : (إعدلوا بين أولادكم إعدلوا بين أولادكم إعدلوا بين أولادكم) رواه أبوداود والنسائي .

ئیمامی بوخاری فەرموودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە کە ئەڵێ : باوکم شتێکی پێ دام بۆ خۆم دایکم (عمرە)ی کچی (رواحە) وتی : من ڕازی نابم تاوەکو پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نەکەیتە شایەت ئەویش ڕۆشت بۆ لای پێغەبمەری خوا صلی الله علیە وسلم و وتی : من شتێکم بەخشیوە بە کوڕەکەم لە (عمرە) ی کچی (رواحە) جا داوای لێ کردووم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم تۆ بکەم بە شایەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی : (أعطيت سائر ولدك مثل هذا) ئایا بە هەموو منداڵەکان بەقەد ئەوە پێ بەخشیون؟ وتم نەخێر فەرمووی : (فاتقوا الله واعدلوا بين أولادكم) قال فرجع فردّ عطيته . واتە : فەرمووی لە خوا بترسن جیاوازی لە نێوان منالەکانتاندا مەکەن ئەویش گەڕایەوە و شتە بەخشراوەکەی گەڕاندەوە.

جا تەنانەت لە ماچ کردنی منداڵدا پێشینان بە یەکسانی ماچی منداڵەکانیان کردووە چ کچ یان کوڕ .

**إبراهيم النخعي ئەڵێ :** (كان السلف يستحبّون التسوية بين الأولاد حتى في القبلة) **بڕوانە تحفه المودود لاپەڕە** ١٣٩ .

**واتە : پێشینان یەكسانیان لە نێوان منداڵەكاندا بە چاك زانیوە تەنانەت لە ماچكردنیشدا .**

**پ ١٥٣/ ئایا لە چ كاتێكدا دەستپەڕ حەرام نابێ ؟**

**وەڵام :**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**دەست پەڕ یان ئاوی خۆ هێنانەوە بەدەست شتێكە لەگەڵ ڕەوشت و ئەخلاقی موسڵماندا ناگونجێ وە شتێكە سەرزەنشت كراوەو لەشەرعدا حەرامكراوە خوای گەورە دەفەرموێ:** {وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ * إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ * فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ} سورة المؤمنون (٥-٧). **واتە : ئەوانەش سەركەوتوون كە پارێزەری داوێنی خۆیانن جگە لەگەڵ هاوسەران و كەنیزەكە كانیاندا نەبێت كە ئەوە جێگەی لۆمە و سەرزەنشت نییە جا ئەوەی جگە لەو سنوورە دیاری كراوە ڕێگە و ڕێبازی تر بگرێتەبەر ئەو جۆرە كەسانە بە یاخی و لەسنور دەرچوو دەژمێردرێن .**

**كەوابوو تەنها ئەم دوو حاڵەتە دروستە دوای ئەم دووانە نابێ مرۆڤ بەدەستی**

خۆی ئەو شتە بكات ، لە پرسیارەكەدا هاتووە كەی ئەو شتە حەڵاڵ دەبێت زانایان وتویانە كاتێك حەڵاڵە ئەگەر مرۆڤ زانی ئەو شتە نەكات تووشی زینـا دەبێت واتە دڵنیابێت تووشی زینا دەبێت ئەو كاتە دەتوانێت ئەمیان بكـات نەك زیناكە ، لەبەر ڕێسای (**اختيار أهون الشرّين**) واتە لەكاتێكدا دوو خراپە هەبوون كامیان بچووك بوو ئەوەیان هەڵدە بژێرێ ، بەڵام پێویستە موسوڵمان لەخوا بترسێت و شەیتـان و نـەفـس نـەیخـەڵـەتێـنن هـەمـوو جارێـك بـەو ناونیشانەوە ئەو كارە دووبارە نەكاتەوە .

پ ١٥٤/ئایا خەیاڵ كردن بۆ كاری سێكسی حەرامە؟

وەڵام :

بیركردنەوەو یادی شتی چاك و پیرۆز لەشەرعدا فەرمانی پێ كراوە و ئیسلام هانمان دەدات بۆی ، بۆ نموونە خوای گـەورە دەفـەرمـوێ : ﴿أَلاَ بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ سورة الرعد (٢٨).

واتـــە : بـــزانن دلآن بـــەیـــادی خـــوا دڵنیـــا دەبـــن و ئـــۆقرە دەگـــرن .

یان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ : (أكثروا من ذكر هاذم اللذات) واتە: یادی ڕوخێنەری ئارەزووەكان زۆر بكەن.

بەڵام بۆبیركردنەوەی خراپ و كارێك كە بمانبات بە شتێكی خراپ لەشەرعدا قەدەغە كراوە ، تەنانەت ئەگەر ختورەی خـراپیش بێـت بـەمـەرجێـك مـرۆڤ

**هەوڵی ئەنجامدانی ئەو ختورانەی دڵی بکەوێت . جا وەك داخستنی ڕێگای حەرام (سدّ الذريعة) نابێ موسوڵمان خەیاڵی سێکسی بکات ئەگەر بە خەیاڵیدا هات با بەردەوام نەبێت و پەنا بگرێت بە خوای گەورە لەو شتە.**

**پ ١٥٥/ پیاوێك سامان ومالێکی زۆری لەحەلاڵ وحەرام و پێك هێناوە، بەو پارەیە خانووبەرەیەکی دروست کردووە تێیدا نیشتەجێ بووە چەند بەشێکی لەو خانووەش داوە بەکرێ پاشان گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا وەك خۆی دەڵێ . تەوبەی سەرزەنشت کەری کردووە ئێستا چی لەوخانووە بکات؟ ئەوەش بزانن ناوبراو لەولاتێکدا دەژی کەخەڵکی ئەو ولاتە تەنگی شوێنی نیشتە جێبوون دەچێژن، ئایا لەو دەست کەوتی ڕۆژانەی ببەخشێت یان چی بکات، حەرام وحەلاڵ تێکەڵ بوون؟**

وەلام/ پێویستە ماڵی حەرام بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی یان میراتگرانی ئەگەر ئەمەی نەتوانی لەبەر نەناسینەوەیان یان هۆکاری تر وەك ئەم هۆکارە ئەو کاتە دەیبەخشێت بۆ خاوەنی پارەکە بەسەر هەژاراندا لەگەڵ پەشیمان

بوونـــەوە لـــەو کـــارەو داوای لێخـــۆش بـــوون لـــەخودا و دڵ دابەســـتن لەســـەر نەگەڕانەوە بۆ ئەم جۆرە هۆکارانە[٩].

**پ ١٥٦/ ئایا بەڵگـەی حـەرامێتی مـادە بێهـۆش کـەرەکان چـی-یە،ئایا (حەشیش) دروستە یان حەرامە ئەگەر حەرام بێت من کەسێکم بـاوکم لەگـەڵ کەسـێکی تـردا لـەو کـارە شـەریکن لـەدوکانی بازرگـانی (سـەوزە فرۆشـی) ئایـا دروسـتە بـۆ مـن لـەو پـارەی ئـەو حەشـیش فرۆشتنە ببەم وخەرجی خۆمی لێدەر بکەم؟**

وەڵام/ مادە بێهۆشکەرەکان پیسـن خـوای گـەورە هـەموو شـتێکی پیسـی لەسەر بەندەکانی حەرام کردووە تـەنها شـتی پـاکی بـۆ حـەڵاڵ کـردوون وەك خوای گەورە لەسورەتی مائیدەدا دەفەرموێت : ﴿**يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ**﴾ [سورة المائدة : ٤] هەروەها ئایەتی (١٥٧) لـە سـورەتی ئەعراف لە وەسفی پێغەمبەردا (ﷺ) : ﴿**وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ**﴾ هـەروەها بەڵگـەی فـەرمودەی (ئـوم سـەلەمە) کـە (ابـو داود) ریوایەتی دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ): ((نهى عن كل مسكر ومُفَتِّر))*.

---

[٩] بڕوانە کتێبی: (فتاوي اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٣٣٢ ـ ٣٣٣).

زانراویشە مادە بێهۆش کەرەکان لەڕەگەزی (مفترات)ەکانە هەروەها مادە بێهۆشکەرەکان زیانێکی گەورەو خراپیان هەیەو پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: ((لا ضررَ ولا ضرار))[١٢]، فرۆشتن وکڕینی (حەشیش) بەکارهێنانی بۆ خواردن وخواردنەوە ولەدەمنانی (مضغ) حەرامە چونکە بێهۆشکەرەو زیانی زۆری تێدایە بۆ مرۆڤ، لەشەریعەتی ئیسلامدا ئەو شتانەی بێهۆش کەر بن قەدەغە کراون لە صەحیحی موسلیمدا وەلە (سنن) ی أبوداود لە (ابن عمر)ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : ((کل مسکر خمر وکل خمر حرام))، وە لە(ابن عباس) ەوە خوایان لێ ڕازی بێت لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرمویەتی : ((کل مسکر حرام))،

---

* رواه أبو داود: (٣٦٧٩)، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع الصغير: (٦٩٧٧)، أما لفظه: (ومفتر) ضعيف، ضعفه الشيخ الألباني في ضعيف الجامع الصغير: (٦٠٧٧)، وسلسلة الأحاديث الضعيفة: (٤٧٣٢).

[١٢] أخرجه الحاكم (٢/٥٧-٥٨) والبيهقي (٦/٦٩- ٧٠) والدار قطني (٥٢٢، ٣٢١) وابن ماجة (٢/٥٧) وأحمد (٣١٣/١) وابن أبي شيبة وعبدالله بن أحمد في (زوائد المسند) (٥/٣٢٦)) والطبراني في معجم الأوسط والكبير برقم (١١٥٧٦) ورقم (١١٨٠٦) وأبو يعلى ورواه مالك مرسلاً في الموطأ (٢/٢١٨) ورواه أبو داود في سننه بلفظ (من ضارّ ضارّ الله به ومن شاق شق الله عليه) أنظر عون المعبود (١٠/٦٤) الطبعة الثانية المكتبة السلفية بالمدينة النبوية، وصححه الألباني في الصحيحة رقم: (٢٥٠).

**هەروەها دروست نیە لەسودی ئەو کارە بخورێت**[١٣].وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه و سلم

**پ ١٥٧ / جاری واهەیە خراپ لەیەك تێگەشتن وكێشە لەنێوان خوێندكارو مامۆستادا ڕوودەدات بۆماوەیەك بەردەوام دەبێت ، ئایا دروستە مامۆستاكە لەنمرەی ئەوخوێندكارە بشكێنێ و بیخات لەكاتێكدا لای مامۆستایەكی تر بوایە دەرئەچوو؟ وە ئایا مامۆستاكە تاوانبار دەبێت؟.**

وەڵام / دادوەری كردن لەنێوان خەڵكدا نابێت شتی كەسی تێكەڵ ببێ ، چونكە نابێت دوژمنایەتی نێوان كەسی یەكەم و ئەوەی حوكمی بەسەردا دەدرێت كار بكاتە سەر حوكمەكە لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ:

**﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾**(٥).

---

(١٣) **بڕوانە كتێبی:** (فتاوي اللجنة الدائمة): (٢٢ / ١٣٧ ـ ١٣٨) .

(٥) {سورة المائدة:٨}.

واتـــە : ڕق بوونـــەوەتان لەکەســـانێك واتـــان لێ نـــەكات دادوەر نـــەبن لەحوکمەکانتاندا ، بەڵكو دادپـەروەربن ئـەوە نـزیکترە لەتـەقوای خـواوەوە ، لەم دوو ئایەتەدا خوای گـەورە ئـەوەمان بـۆ ڕون دەکاتـەوە کەدروسـت نییـە مرۆڤـ پێچەوانەی ڕاستی وشایەتی حەق بێت لەبەر خزمایەتی یان دوژمنایەتی ، چونکە جاری وا هەیە خزمایـەتی مرۆڤـ والێ دەکـات حـوکمێکی وابـدات بـۆ خزمـی خـۆی کەشایسـتەی نییـە ، یـان دوژمنایـەتی جـاری وا هەیـە مرۆڤـ هەڵدەنێ بۆ ئـەوەی شایسـتەیەتی لـە دوژمنەکـەی بێبـەش بکـات ، کـەوابوو لەسـۆنگەی ئـەوەی لـەم دوو ئایەتـەدا هـاتووە بـۆ مامۆسـتا دروسـت نییـە خوێندکاری خۆی بخات ، لەبەر ئـەوەی دوژمنایەتییـەکی کەسـی لەنێوانیانـدا هەیە تەنانەت ئەگەر دوژمنایەتی ئاینیش بێت پێویستە ئەوەی شایسـتەیەتی بیداتێ .

هەربۆیە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی نارد بـۆ ئـەوەی سەرانە(جزیة) لە جولەکەی خەیبەر بەنیوە وەرگرێت بۆیە پێی وتن (لقد بعثني رسـول الله (ﷺ) وانّـه لأحـبّ النـاس اليّ وانّكـم لأبغـض الىّ مـن أمثـالكم مـن القـردة والخنازير وانّ حبّي ايّاه وبغضي ايّاكم لايمنعني من العدل ، فقالوا بهذا قامت السموات

والأرض)[٦] لەسۆنگەی ئەمەوە پێویستە تەماشای حوکمەکە بکرێت کە ئەدرێت نەك کەسەکە ، بەمە مرۆڤ ئەبێتە دادپەروەر و ئەوەی لەگەردنی دایە ئەنجامی داوە ، چونکە بابڵێین لەنێوان خوێندکار و مامۆستاکەیدا دوژمنایەتییەکی گەورە هەیە ، بەلاَم خوێندکارەکە ئاستی خوێندن و نمرەیەکی وای هێناوە کەهۆی دەرچونێتی ، بۆیە حەلاَل نییە بۆ مامۆستاکە ئەو خوێندکارە مەحروم بکات لەوەی شایەنێتی ، هەروەها حەلاَڵ نییە بۆی لەبەر هاوڕێیەتی یان خزمایەتی یان لەبەر ئەوەی باوکی هاوڕێیەتی یان ..............هتد, لەوەی خۆی بەدەستی هێناوە زیاتری بداتێ . والله الموفق [٧].

---

(٦) جزء من حديث طويل أخرجه الحافظ البيهقي في كتاب (دلائل البيهقي)(٤/٢٢٩-٢٣١) وذكره الحافظ ابن كثير في البداية (٤/٢٠٠) وعزاه أيضاً للبيهقي ، واعلم ان مصالحة النبي ﷺ لليهود ، كانت في السنة الأولى للهجرة عقب وصول النبي ﷺ المدينة بفترة وجيزة انظر (البداية والنهاية)(٣/٢٢٢) امّا آية الجزية نزلت عام غزوة تبوك في السنة التاسعة للهجرة كما بيّنه ابن جرير الطبرى في تفسيره (٦/١٠٩-١١٠) .

(٧) انظر : (فتاوى منار الأسلام )ج٣ ل ٦٩٨.

**پ ١٥٨ / هەندێك لە كارمەندان دەوامەكەیان بە جێ دەهێڵن لە بـەر هەنـدێك لـە بەرژەوەنـدی یـە تایبەتـەكانی خۆیـان لـە كـاتی ئیشـكردنیاندا ، بۆیـە دەبیـنین داوا لـە بەڕێوەبەرەكـەی دەكـات كـە ڕێگـەی پێبـدات ، ئـەوەش زۆربـەی جـار بـە هێنانـەوەی بیـانووی بـێ بنەواو دروست كراو كە زۆربەی جار بەرامبەرەكەیان ڕازی دەكەن یان ڕازی ناكـەن ، جـا ئەگـەر بەڕێوەبەرەكـەی بزانێـت ئـەو بیانووانـەی دروست نـی یە ، ئایا تـاوان بار دەبێت بە ڕێپێدانی بە كارمەندەكە ؟**(٤)

**وەڵام** / نابێـت سـەرۆكی دائیرەكـە ، یـان بەڕێوبەرەكـەی ، یـان ئـەو كەسەی كە لە ئاستیاندا بێت ڕازی بێت لە سـەر شـتێك بیروبـاوەڕی وایـە كـە ڕاسـت نـی یـە ، بـەڵكو پێویسـتە لـە سـەری لێ ی بكۆڵێتـەوە ، جـا ئەگـەر پێویسـتیەك لـە ڕێپێدانەكەیـدا هـەبوو ، زۆر پێویسـت بـوو ، ڕێپێدانەكەشـی زەرەر بە ئیشەكەی نەگەیەنێت ، ئەوا هیچ نكوڵیەكی تێدا نی یە ، بـەڵام ئـەو بیانووانەی ئاشـكرا دەزانرێـت ناڕەوایـە یـان گومـانی ئـەوەی لێ دەكرێـت كـە نـاڕەوا بێـت ، ئـەوا پێویسـتە لـە سـەر سـەرۆكەكەی كـە ڕێگـەی پێنـەدات ،

(٤) فتاوى الشيخ ابن باز رحمه الله ، المجلد التاسع / أسئلة وأجوبة تتعلق بالطب .

چونکه ئەو ڕێگە پێدانە خیانەتە لەو ئەمانەتەی کە لە ژێر دەستیدایە و ئامۆژگاری نەکردنە بۆ ئەو کەسەی کە ئەمینداریێتی پێدراوە یان بۆ موسوڵمانان ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : " كلكم راعٍ وكلكم مسؤل عن رعيته " ، وە لە بەر ئەوەی ئەم کردارە ئەمانەتە ، و خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ [سورة النساء : ٥٨] ، وە لە وەصفی بڕوادارانـدا فەرموویەتی: ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴾ [سورة المؤمنون : ٨] ، وە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ [سورة الأنفال : ٢٧] .

**پ ١٥٩/ لـە دائـیرە زۆر جـار مراجـع شـتێك (خـواردن) لەگـەڵ خۆیان دێنن بە بێ ئەوەی ئێمە داوا بکەین وە ئەگەر نەیشیهێنن ئێمە هەر ئیشـەکەیان بۆ دەکـەین ئایا ئـەم خواردنانـە حەرامـە؟ یـان چـەند کەسـانێك مووچـە لای ئێمـە وەردەگـرن بـڕە پارەیـەك بـە جـێ دەهـێڵن دەڵێن بە نانی نیوەڕۆی بدەن .**

**وەڵام :**

وەرگرتنی شت ئەگەر لەبـەر بەرامبـەرێك بێـت ئـەوە (**رشـوة**)یـە و حەرامـە و نەفرەتی لێکراوە ، ئەگەر ئەوە نەبێت و لە لایەن ئێوەوە بـە مـەرج نـەگیرێت ئەوە (**هدیة**)یە ، بەڵام باشتر وایە ئەمەش وەرنەگیرێت چونکە سەردەکێشـێ بۆ (**رشوة**) خوا پەنامان بدات .

**پ ١٦٠/ ئەگەر ئافرەتێك مێردەکەی ئەنفال بێ هیچ میراتی جێ نەمابێ مناڵیشی نەبێ لەو موچەی لە حکومەت وەری دەگرێت حـەقی دایکی مێردەکەی دەکەوێ؟ خواپاداشتی چاکەتان بداتەوە .**

**وەڵام :**

پارەی موچەی انفال بە مـیرات حیسـاب ناکرێـت بـەڵکو موچـەیە بـۆ خێزانـی (انفال کراو) یان بـۆ منداڵـەکانی دەبڕێتـەوە بەبەڵگـەی ئـەوەی قـانونی ئـەو

موچەیە ئەوەیە ئەگەر ژنەکە مێردی کرد دەبڕرێت یان منداڵەکان گەورە بوون دەبڕرێت ، کەوا بوو بەماڵی کەسی ئەنفال کراو حیساب ناکرێت بەڵکو موچەیەکە لە لایەن حکومەتەوە بۆ ژنی ئەنفال کراو یان بۆ مناڵەکانی یان بۆ کەسێك کە حکومەت دیاری دەکات .

**پ١٦١/ من لە بریتانیام ئایا دزی کردن لە ئینگلیزەکان گوناحە؟**

**وەڵام :**

بەڵێ دزی کردن لە هەموو کەسێك حەرامە ، چونکە دزی هەر دزیە ئەگەر چی لە کافر و بێ باوەڕیش بکرێت ، هەروەها سەرەڕای حەرامێتی دزی کردن لەو کافرانە دەبێت ئێوەی دانیشتو لەو وڵاتانە وەفادار و ئەمین و دەست پاك بن نەك خائین و دز و جەردە کەوا دینەکەتانی پێ لەکەدار بێت و سومعەتی موسڵمانان لەکەدار بکەن .

**پ١٦٢/ سلاو مامۆستای بەڕێز من لەم وڵاتە هەموو کەس خۆی تەئمین دەکات (تأمین حیاة) پارە دەدەین مانگانە بە ئەو بانکە بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکمان لێ بقەومێ ئەوان یارمەتیمان دەدەن بەلام**

**نا زانم بۆ ئەو پارەیە حەرامە؟ من منداڵەکەم ساڵی پار سوتا زۆر شوێنی سەقەت بوو ئەگەر ئەو پارە لەوان وەربگرم بۆ تەجمیلکردنی منداڵەکەم ئەو پارە بە هەمان شێوە حەرامە؟ خوای گەورە یارمەتی دەری هەموو موسڵمانان بێت لەگەڵ ئێوەش .**

**وەڵام :**

مەسەلەی تأمین لە فیقهی ئیسلامی دا بریتی یە لە گرێبەستێك لە نێوان بیمەدار (**مؤمِّن**) لەگەڵ بیمەکراو (**مؤمَّن له**) کە بریتی یە لەوکەسەی بیمە بە قازانجی بەمەرج گیراوە کە بڕێك لە ماڵ یان موچەیەك یا ماڵێکی بەرامبەری پێ دەدرێت لەکاتی ڕوداودا یان لەکاتی ترسدا کە لە گریٚ بەستەکەیاندا ڕونکراوەتەوە بە پێی قیست لایەنی یەکەم دەیدات بە لایەنی دووەم ، ئەنجا ئەوەش بزانە (بیمە) تأمین جۆری زۆرە وەك بیمەی بازرگانی ، کەسێتی ، ژیان ، کۆمەلاّیەتی....هتد .

جا زانایانی سەردەم لە دوای تاوتویٚ کردنی زۆر ئەم کارەیان بە حەرام داناوە ، چونکە سوخواردنی تێدایە و کەم و زۆری تێدایە وە قومار و نەزانینی تێدایە ، جا پێویستە موسوڵمان خۆی لەم کارە بپارێزێت .

**پ١٦٣/ ئـەوەی مامەڵـەی لەگـەڵ جولـد کویسـت کردبێـت بـەڵام نەیزانیبێت حەرامە پاشان کەزانیبێتی حەرامە وازی لـێ هێنا بێت ، ئـەو زێـڕەی کـە بـۆی هاتۆتـەوە چـی لـێ بکـات باشـە؟ خـوا خێرتـان بنوسێ**

**وەڵام :**

ئەو کەسەی بەشداری لە کۆمپانیـای جولـد کویسـت و هاوکارەکـانی کردبێـت بەنەزانینەوە ئەوا تاوانبار نابێـت ، ئـەو شـتەی کـە کڕیویـەتی ئەگـەر بکرێـت بیگەڕێنێتەوە بۆ هەمان کۆمپانیا و پارەکەی خۆی وەربگرێتەوە ئەوا چـاکە ، ئەگەر نەتوانرا ئەو زێڕەی کـە کڕیویـەتی بەئەندازەیـەك پـارە ئەگـەر زیـاتری دەستکەوتووە لە مایەکەی خۆی کە داویەتی بە کۆمپانیاکە ئـەوە دەبێـت لـە ڕێگەی خوادا خەرج بکرێت ، ئەم مەسـەلەیەش زانایـانی ئـەهلی سـوننەت بـە تێرو تەسەلی باسیان کردوە بەڵگەشیان بۆ ئەم بۆچونە ئەم ئایاتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿.... وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ﴾ (٢٧٩) سورة البقرة

لاَ تَظْلِمُونَ / واتە زیاتر لە پارەکەی خۆتان بۆتان دروست نی یە بیبەن .

لاَ تُظْلَمُونَ / واتــە دروســتە مایەكـەی خۆتــان هــەڵگرن نابێـت خۆتــان زیــان لێكەوتوو بكەن .

بۆ زیاتر شارەزابوون لەم باسە بڕواننە تفسیر ابن كثیر ج ١ لاپــەڕە ٣٧٥ – و تفسیر القرطبي ج٣ لاپەڕە ٣٦٥ .

ئەم زیادەش بە پێـی مـافی گشـتی ومـافی تایبـەت دەبێـت و ئـەوەش بزانـە بەخشـینی مافـە گشـتی یـەكان لـە پێشـەوەن وەك پەخشـكردنی زانسـت و هاریكاری لە بانگەوازی خەڵك بۆ لای ڕێگای ڕاست و قوتابخانە و نەخۆشخانە و ...هتد.

**پ١٦٤/ حـوكمی شـەرع چـیە لـە سـەر سـەرمایەگوزاری لەگـەڵ كۆمپانیای بالینوری ئەمریكی كە نوسینگە سەرەكیەكەی لە ویلایەتی فلۆریدایـە و هاوبەشـی (شـراكە) لـە هـەموو جیهانـەوە قـەبوڵ دەكـات , ئایا مامەڵەكانی حەرامە یان دروستە ,ئەوەش هەیە بڕی ٥٠ $ حەقی بەشـداربوون وەردەگرێـت بێجگـە لـەو سـەرمایەی بـۆ سـەرمایەگوزاری پێویستە بدرێت وە دەبێ سەرمایەكەش لـە ١٠٠٠ $ كـەمتر نـەبێ جـا داواكارین لە بەرێزتان حوكمی شەرعیمان بۆ باس بكـەن ، وە ئـەوەش**

**بزانن کە کۆمپانیای ناوبراو بە شێوەیەکی بەردەوام دەبێتە زامنی سەرمایەکە لەکاتی خەساردا .**

**وەڵام :**

کۆمپانیای بالینور وەکو لە سایتەکانەوە زانیاریمان لە سەریان دەست کەوتووە کۆمپانیایەکی دارای یە لە ساڵی ١٩٩٥ ی زاینی لە لایەن دایڤید گاردندوە دامەزراوە پاشان بووە بە گروپێکی جیهانی و تواناکانی لە جیهاندا خستوەتە گەر ، وە لەم دوایەدا لە کوردستانیش دەستی کردووە بە جم و جوڵ وە هەندێ لە لاوەکانمان مامەڵەیان لەگەڵ بازنەکانی ئەم کۆمپانیایەدا کردووە پاشان هەستیان کردووە کە خاڵی نیە لە حەرام بۆیە داوایان لە ئێمە کردووە وەڵام و سەرنجی خۆمانیان پێبدەین ئێمەش ئەم ڕوونکردنەوەو وەڵامەمان داناوە:

لە ڕواڵەتدا ئەم مامەڵەیە وەکو قازانج هاوبەشی (**مضاربة**) دێتە پێش چاو کە لە کتێبە فیقهی یەکاندا پێناسە کراوە بە (پەیمانێکە لە نێوان دوولایەندا دەبەسترێت کە یەکێکیان پارەیەك بدات بەوی تریان بۆ ئەوەی بازرگانی پێوە بکات لەسەر ئەوە قازانجەکەیان بە گوێرەی بڕیاری بەینی خۆیان بەش بکەن) بڕوانە فقه السنه بە کوردی بەرگی ٣ لاپەڕە ٤٥٧ .

وه بۆ مەرجەکانی قازانج هاوبەشی مضاربه لەوانه (ئەبێ ڕێژەی قازانجەکه له نێوان (عامل) و خاوەن پارەکەدا دیاری کرابێت وەك سێ یه ك نیوه چوار یەك)

زانراویشه که مەبەست به دیاری کردنی قازانج ڕێژەیه نەك بڕو ژمارەیەکی دیاری کراو بۆ هەر مانگێك ، جا بەبەراوردی ئەم چەمکه لەگەڵ ئەوەی که کۆمپانیای ناوبراو دەیکات دەبینین ئەو کۆمپانیایەو لاوانەکانمان مامەڵەیان لەگەڵ کردوه کەوتونەته چەند سەرپێچیەکەوه لەوانه:

یەکەم : ئەوەی کۆمپانیای ناوبراو دەیکات بەناوی (**مضاربة**) وه له حەقیقەتدا مضاربة نیه ، چونکه وەك برا گەنجەکانمان پێیان وتین کۆمپانیای ناوبرا له کاتی خەساردا دەبێته زامنی خەسارەکه له کاتێکدا کۆمپانیا لەم گرێبەستەدا تەنها (عامل) ه خەساری ناکەوێته سەر ئەمەش سەرەڕای ئەوەی نیشانەی پرسیاره زوڵمیشه لەسەر کۆمپانیاکه که (عامل)ه لێرەدا ئەگەر ڕاست بێت ، چونکه هەم هەوڵ و هەڵسوڕاندنی دەفەوتێ وه هەم خەساریش دەبژێرێ ئەمەش حەرام و پێچەوانەی گرێبەستی (**مضاربة**) یه .

دووەم : له مضاربەدا قازانج به بڕو ژمارەی جێگیر دیاری ناکرێت بۆ نموونه مانگانه به ١٠٠ دۆلار یان زیاتر یان کەمتر ، بەڵکو به ڕێژه و له قازانجیش

بە تەنها دیاری دیاری دەکرێت بە پێی قازانجی مانگانەو لەسەر ڕێژەی دیاری کراو کە بڕی قازانجیش زیاد و کەم دەکات بە پێی ڕێژی دانراو ، کەوابوو قازانجی مانگانە جێگیر کردن دەبێتە زوڵم لە لایەنێ: لە لایەنەکان چونکە کەسیان نازانن قازانجی مانگانەیان چەند بەردەکەوێت .

سێ یەم : ئەنجا ئەصڵ لە شەریکایەتی یان مضاربة ئەوەیە کە لەگەڵ موسڵمانانداا بکرێت ، هەرچەندە لەگەڵ جگە لە موسوڵمانان دروستە ، بەڵام دەبێت موسوڵمان سەرپەرشتی کڕین و فرۆشتن بکات ، چونکە جگە لەوان ڕەچاوی حەڵاڵ و حەرام و ڕیبا ناکەن وەك أبو بكر الخلال لە کتێبی (أحكام أهل الملل)دا دەفەرموێت : (استقرت الروايات عن أبي عبدالله (الامام أحمد رحمة الله) بكراهة مشاركة أو مضاربة المسلم اليهودي والنصراني إلا أن يكون هو يلي...) لاپەڕە ١٠٩ .

واتە: هەموو ڕیوایەتەکان جێگیرن لە ئیمامی ئەحمەدەوە لەسەر کەراهەتی شەریکایەتی و مضاربەی موسوڵمان لەگەڵ گاور و جولەکە مەگەر موسوڵمان خۆی سەرپەرشتی کارەکان بکات .

وە (الخلال) لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئیمامی ئەحمەدەوە دەفەرموێ: کە لە هەمان سەرچاوە لە لاپەڕە ١٠٦ داهاتووە : (سئل عن الرجل يشارك اليهودي

و النصراني؟قال سيشاركهم ولكن يلي هو البيع و الشراء ذلك أنهم يأكلون الربا وسيحلون ثم قال أبو عبدالله بأنهم قالوا [لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ] آل عمران ٧٥).

**واتە: پرسیاری لێکراوە دەربارەی کەسێك شەریکایەتی گاور و جولەکە بکات دروستە؟ وتویەتی دروستە بەڵام خۆی سەرپەرشتی کڕین و فرۆشتن بکات ، چونکە ئەوان ڕیبا دەخۆن و ماڵی خەڵکی جگە لەخۆیان بە حەڵاڵ دەزانن. پاشان ئیمامی ئەحمەد وتی : چونکە ئەوان وتویانە وەك لە قورئاندا هاتوە ( هەشیانە ئەگەر دینارێکی بەئەمانەت لا دابنێیت بۆت ناگێڕێتەوە مەگەر بەسەریەوە ڕاوەستابیت وە ئەوانە وا دەکەن ، چونکە دەڵێن لەبەرمبەر موسوڵماناندا لێپرسراو نابین ئەگەر فێڵیان لێ بکەین و ماڵیان بخۆین).**

**پێشەوا بدر الدين العينى لە کتێبی عمده القارى شرح صحيح البخارى بەرگی ١٣ لاپەڕە ٨٢ دا دەفەرموێ:** (وأما مشاركة الذمّي مع المسلم في غير المزارعة فعند مالك لا تجوز إلا أن يتصرف الذمي بحضرة المسلم أو يكون المسلم هو الذي يتولى البيع والشراء لان الذمي قد يتجر في الربا والخمر ونحو ذلك مما للا يحل للمسلم...)

**واتە: ئەمما شەریکایەتی ئەهلی زیمە (گاور و جولەکە لە ولأتی ئیسلام دا) لەگەڵ موسوڵماناندا لە جگە لە ئاودێری** (مذارعة) **لای ئیمامی مالك دروست نیە ، مەگەر ئەو کەسە بەئامادەبونی موسوڵمانەکە مامەڵە بکات یان موسوڵمانەکە خۆی هەستێت بە کڕین و فرۆشتن ، چونکە ئەهلی زیمە**

لەوانەیە بازرگانی لە ڕیبا و عەرەق و شتی تردا بکات لەوانەی کە لەشەرعدا دروست نیە.

چوارەم : ئەو بوارانەی کە ئەم کۆمپانیا کاریان تێدا دەکات خاڵێکی جەوهەری یە بۆ دروستێتی یان نادروستێتی هاوبەشی لەگەڵ کردنی ، چونکە ئەم کۆمپانیایە وەك پێمان گەیشتوە لەبوارەکانی بیمە (**تأمين الحياة**) و گۆڕینەوەی دراو کار دەکەن وە شتێکی تر ئەوانەی هەڵدەستن بەهەڵسوڕاندنی سەرمایەکان و سەرمایە گوزاری دەکەن نە بە پێی شەریعەتی ئیسلام دەڕۆن لە ئەصڵدا وە نە شارەزایی فیقهی حەلاڵ و حەرامن ، و بە تایبەتیش لەم سەردەمەدا کە چەندین شت و مەك و بواری جیاجیا دروست بوون لە بازرگانی دا ، بۆیە بیگومان لەبەر ڕەچاونەکردنی ئەم خالأنە دەکەونە حەرامەکانەوە ئەمەش واپێویست دەکات لەسەر موسڵمانان موجازەفەی وا نەکەن.

لە کۆتاییدا دەڵێم قسەکردنە لەسەر ئەم مامەڵەیە هاوشێوەکانی قسە زۆر هەڵدەگرێت بەلاَم بە ئەوەندە کۆتای دێنم بە هیوای ئەوەی لە کاتێکی تردا وردو درێژ تر قسەی لەسەر بکەم .

**پ ١٦٥/ پێم خۆشە پرسیارێکتان ئاڕاستە بکەم و بزانم حوکمی شەرع چیە دەربارەی کڕین وفرۆشتن وبەخێوکردنی ئەو گیاندارانەی بۆ جوانی و ئارەزووشکاندن بەکاردەهێنرێن, بۆنموونە:**

**١- باڵندەی جوانی وەك تووتی و باڵندە ڕەنگاوڕەنگەکان.**

**٢- خشۆکەکان وەك مارو مارمێلکەکان**

**٣- دڕندەکان وەك گورگ و شێرو ڕێوی هتد.**

**ئەمانە بەکاردەهێنرێن لەبەر جوانیان یان لەبەر پێستەکانیان, ئەوەش بزانن ئەمانە گرانبەهان وبەند و ماڵی دەکرێن بازرگانی کردن بەمانە سوودو قازانجێکی باشی تێدایە؟**

وەڵام/ یەکەم: فرۆشتنی باڵندەی جوانی وەك تووتی وباڵندە ڕەنگاو ڕەنگەکان وبولبول لەبەر دەنگیان کارێکی ڕەوایە, چونکە تەماشاکردن وگوێڕاگرتن بۆ دەنگیان کارێکی حەڵاڵە و هیچ دەقێك نەهاتووە لەسەر حرام بوونی فرۆشتن وبەخێوکردنیان بەڵکو بەڵگە هاتووە کە ڕەوایەتی ڕاگیرکردنیان پێ ببەخشێت بەمەرجێك خواردن وخواردنەوەیان پێ بدات وە ئەوەی لەسەری پێویستە بەرانبەریان ئەنجامی بدات, لەو بەڵگانەش:

ئەو فەرمووده‌یەی ئیمامی بوخاری لە حەدیسی ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئەنەس دەفەرموێت: ( كان النبي ﷺ أحسن الناس خلقاً وكان لي أخ يقال له أبوعمير- قال أحسبه فطيماً- وكان إذا جاء قال يا أبا عمير ما فعل النغير؟ ) نغر كان يلعب به ...)

(نغر)[٨] جۆرێکە لەجۆرەکانی باڵندە, ابن الحجر لە کتێبی (فتح الباری) لەمیانەی ژماردنی سوودەکانی ئەم فەرموودەیەدا ئەڵێت: ئەم فەرموودەیە ئەوەش دەگەیەنێ کە حەڵاڵە منداڵ یاری بە باڵندە بکات, باوکان ودایکانیش واز لەمنداڵەکانیان بهێنن یاری بکەن بەو شتانەی حەڵاڵە یاریان پێ بکرێت وە ئەوەشی تێدایە کە حەڵاڵە پارە خەرج بکرێت لەو شتە ڕەوایانەی منداڵان پێی ڕادەبوێرن وخۆیانیان پێوە خەریك دەکەن و ڕاگرتنی باڵندە لەقەفەسدا حەڵاڵە وباڵکردنی باڵندەش حەڵاڵە چونکە ئەوەی (أبو عمير) یان قەفەسی کرابوو یان باڵی کرابوو هەرکام لەو دووانە بێت ئەوی تریش حوکمی یەکەمیان وەردەگرێت, هەروەها لەو بەڵگانە حەدیسەکەی (أبوهريرة) خوا لێی ڕازی بێت ڕیوایەت دەکات کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( دخلت امرأةٌ النار في

[٨] نەغر بێچووە چۆلەکەیە بڕوانە کتاب العين ل ٩٧٤.

هرةٍ حبستها لا هي أطعمتها وسقتها ولا هي تركتها تأكل من خشاش الأرض)[٩]

واتە: ئافرەتێك چووە ناو ئاگری دۆزەخەوە بەهۆی بەندکردنی پشیلەیەك , نەخواردن وخواردنەوەی پێ داو نەهێشتی بۆخۆی لەمارو مێرووی سەر زەوی بخوات.

کەوابوو لەکاتێکدا ڕاگرتنی پشیلە بەو مەرجانە ڕەوا بێ ئەوا ڕاگرتنی باڵندەکان ڕەوایە. هەندێك لەزانایانیش بەخێوکردنی ئەمانەی کەباسمان کردن بە (مکروه) دائەنێن و هەندێکی تریش لە زانایان بە حەرامی دەزانن ئەڵێن: بیستنی دەنگیان وڕابواردن بەبینینیان شتێکی پێویست نیە ومرۆڤ پێویستی پێی نابێت, بەڵکو لەخۆبایی بوون و خۆشگوزەرانی وهەرزەیەتیە, چونکە بەدەنگی گیانداریك دڵشاد دەبێت کە خولیای فڕینە وخەمی دەربازبوون دەخوات[١٠].

دووەم: یەکێك لەمەرجەکانی کڕین وفرۆشتنی دروست ئەوەیە ئەو شتەی مامەڵەی لەسەر دەکرێ سوودوەرگرتن لێی ڕەوابێت بەبێ پێویستی بوون

---

[٩] البخاری في الصحيح ومسلم ٦٢٢/٤ وغيرهم.

[١٠] بڕوانە کتێبی ( الفروع وتصحيحة) المرداوی (٩/٤), (الاتصاف) (٢٧٥/٤).

کەوابوو مار ومارمێلکەکان سوودیان لێ وەرناگیرێت بەڵکو زیان بەخشن کەوابێ کڕین و فرۆشتنیان دروست نیە.

سێ یەم: کڕین وفرۆشتنی گیاندارە دڕندەکان وەك گورگ وشێرو ڕێوی و ئەوانەی کەڵپەیان هەیە دروست نیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردووە، هەروەها لەبەر ئەوەی لەدەستدانی ماڵی تێدایە وپێغەمبەریش ﷺ نەهی کردووە لە فەوتاندن و لەناودانی سامان بەبێ هوودە.[١١]

**پ ١٦٦/ ئایا لەکڕین وفرۆشتندا ڕێژەیەکی دیاری کراو دانراوە بۆ قازانج وەرگرتن یان بێ سنوورە؟ وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەوێ لەگەڵ باسکردنی بەڵگەی شەرعی.**

**وەڵام:** کەسێك ماڵێکی بۆ بازرگانی یان بۆ خۆی کڕی دروستە بیفرۆشێتەوە زیاتر لەبەهاکەی خۆی کەپێی داوە بەحازربێ یان بەقەرز، هیچ سنوورێك نازانین دیاری کرابێت لەوە بەدەر دروست نەبێت، ئەوەندە هەیە سوك

---

[١١] وەڵامی لیژنەی هەمیشەیی بۆ لێکۆلینەوە زانستیەکان وفەتوادان بڕوانە کتێبی فتاوى اللجنة الدائمة ب ١٣ ل ٣٨ فەتوای ژمارە ١٨٨٠٧.

وئاسان کردن لەسەر موسڵمانان پێویستە لەبەر ئەو بەڵگانەی هاندەرن بۆ ئەم مەبەستە, بەڵام ئەگەر شتێك نرخەکەی زانراوو بوو نابێ موسڵمان بیفرۆشێت بەکەسێکی نەزان بەزیاتر لەو نرخە, مەگەر ڕاستی پێ بڵێ, چونکە ئەو جۆرە فێڵێکی تێدایە, موسڵمانیش برای موسڵمانە و نابێ فێڵ وستەم وناپاکی لەگەڵ بکات, بەڵکو دەبێ ئامۆژگاری بکات هەموو کات پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( الدین النصیحة ) (الحدیث) [١٢], هەروەها لە بوخاری وموسلیمدا هاتووە لەجریری کوڕی عبداللە ی یەمانیەوە کەفەرموویەتی: پەیمانم دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر نوێژکردن و زەکات دان و ئامۆژگاری کردنی هەموو موسڵمانێك. هەروەها لە فەتوایەکی تردا ئەڵێن: قازانج وەرگرتن لە کڕین وفرۆشتندا سنووری دیاری کراوی بۆ دانەنراوە بەڵکو بەپێی زۆر وکەمی بوون وداوا لەسەر بوونە (العرض والطلب ) بەڵام بۆ موسڵمان – بازرگان بێت یان کەسێکی ئاسایی – چاکتر ئەوەیە لەکڕین وفرۆشتندا نەرم ونیان وبەخشندە بێت, وەبێ ئاگایی بەرانبەرەکەی نەقۆزێتەوە وفێڵی لێ بکات بەڵکو مافی برایەتی ڕەچاو بکات.[١٣]

---

[١٢] ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە.

[١٣] وەڵامی لیژنەی هەمیشەیی فەتوای ژمارە ٤٥٥٢ لە کتێبی (فتاوى اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ٨٩.

**پ ١٦٧/ ئایا حوکمی (المقانعة) چیە کەلە مزایەدەی ئاشکرادا دەکریٚ؟ مقانعەش بریتیە لەوەی هەندیٚ کەس لە مزایـەدەی حکومیـدا دەیکەن پیٚکدیٚن لەسەر ئەوەی لـەکاتی مزایـەدەدا هاوبـەش بن, پاش مزایەدە جاریٚکی تر هەندیٚکیان ماڵەکە دەفرۆشنەوە بەوانی تریان ئەو بڕە قازانجەش کە دەستیان کەوتووە بەیەکسانی بەسەر هەموویاندا دابەش دەکریٚت....**

**وەڵام:** ئەمە کاریٚکی ناڕەوایە و جائیز نیە چـونکە هاریکـاری کردنـی یـەکترە لەسەر تاوان ودوژمنکاری وە زوڵم کردنـە لـە فرۆشـیار و خـاوەنی ماڵەکـە بـۆ بەرژەوەندی ئەوانەی پیٚکهاتوون لەسەر کڕینی, یـان جـاری وا هەیـە لـەکاتی مزایەدەدا کەسانیٚك هەر بەئاماژە کەسانیٚکی تر قایل وبـیٚ دەنـگ دەکـەن بـۆ ئەوەی بەنرخیٚکی کەم شتەکەیان دەستبکەویٚت, ئەڵیٚن بیٚ دەنـگ بـەو نیـازم کردووە ئەگەر من کڕیم ئەوە تۆش بەشداربیت ئەم مامەڵەیـەش دروسـت نیـە چـونکە زیـان وفیٚڵـی تیٚدایـە لەفرۆشـیارو دەبیٚتـە مایـەی بردنـی ماڵەکـەی بەنرخیٚکی کەم. [١٤]

---

[١٤] وەڵامی لیژنەی هەمیشەیی , فەتوای ژمارە ١٩٦٣٧ لە کتیٚبی ((فتاوی اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ١١٥.

**پ١٦٨/ لەمیانەی کڕین وفرۆشتندا پێشەکی (عربون) دەدرێت بۆ دامەزراندنی مامەڵەکە کەبریتیە لەبڕێك پارەی کەم ئەم پێشەکیە ماڵە فرۆشراوەکە دەبەستێتەوە ئایا حوکمی ئەم جۆرە مامەڵەیە چیە؟ زۆر لە فرۆشیارەکان لەکاتی تەواونەکردنی بەهای شتە فرۆشراوەکە لەلایەن کڕیارەوە یان پەشیمان بوونەوەی کڕیار ئەو پێشەکیە بۆ خۆیان دەبەن ئایا ئەمەش حوکمی چیە؟**

وەڵام: کڕین وفرۆشتنی عربون کە بریتیە لەوەی کڕیار بڕێك پارە وەك پێشەکییەك کەکەمترە لەبەهای فرۆشراوەکە کە دوای بڕاندنەوەی مامەڵە بۆ زامنکردنی فرۆشراوەکە بۆ خۆی بدات بە فرۆشیار یان وەکیلی فرۆشیار بۆ ئەوەی جگە لەو کەسی تر نەیبات, هەروەها ئەگەر خۆی قایل بوو ماڵەکەی برد ئەوا ئەوەی لای ماوە ئەبێ بیدات ئەگەر هاتوو نەیبردوو پەشیمان بوو ئەوا دروستە فرۆشیار ماڵی خۆی بباتەوە و ئەو پێشەکیەش بۆ خۆی ببات, کڕین وفرۆشتنی جۆری پێشەکی دان دروستە ئەگەر کات بۆ تەسلیم کردنەوەی ئەو بڕە پارەیەی ماوەتەوە دابنێت یان نا, دروستە فرۆشیار دوای دامەزراندنی عەقدی کڕین وفرۆشتن و دوای وەرگرتنی فرۆشراوەکە داوای حەقی خۆی بکات, ئەمانەی خوارەوە بەڵگەی دروستێتی ئەم جۆرە کڕین

وفرۆشـتنەی تێدایـە: ئـیش پێکردنـی ئیمـامی عومـەر ڕەزای خـوای لیٚ بێـت, ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: ئەم کڕین وفرۆشـتنە هیچـی تێـدا نیـە, لـە ابـن عمرەوە دەگێڕنەوە کەبە حەڵاڵی داناوە, سعیدی کـوڕی مسـیب وابـن سـیرین ووتویانـە هیچـی تێـدا نیـە ئەگـەر کڕیـار پێـی نـاخۆش بـوو بەتـەنها ماڵەکـە بگێڕێتەوە بەڵکو شتێکی لەگەڵدا بگێڕێتەوە, ئەو فەرموودەیەش کە ریوایـەت دەکرێـت لەپێغەمبـەرەوە ﷺ کـە فەرموویـەتی: ( **نهـی عـن بیـع العربـون**) ئـەوە فەرموودەیـەکی لاوازە وئیمـامی ئەحمـەد وجگـە لـەویش بـە لاوازیـان داناوە, کەوابوو نابێتە بەڵگە.[١٥]

## پ ١٦٩/ حوکمی مامەڵەی ئەو کەسە چیە ئەم شتەم لیٚ بکڕە ئەگەر زەرەرت کرد ئەوا بۆتی دەبژێرم؟

وەڵام: ئەگەر کڕیار بەمەرجی گرت کـە خەسـار نابـژێریٚ یـان ئەگـەر شـتەکە نەفرۆشرا ئەوا دەیگێڕێتەوە یان فرۆشیار بەمەرجی گرت و ووتی ئەم شتەم لیٚ بکرە ئەگەر هاتوو خسارت کرد ئەوا من بۆتی قەرەبوو دەکەمەوە, لەم کاتەدا تەنها مەرجەکە بەتاڵە وحسابی بۆ نـاکریٚ بـەڵام کـڕین وفرۆشـتنەکە دروسـتە

[١٥] وەڵامی لیژنەی هەمیشەیی, فتوای ژمارە ١٩٦٣٧ کتێبی (فتاوی اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ١٣٣.

ودامەزراوە, پێغەمبەری خواﷺ دەفـەرموێت : ( **كل شرطٍ ليس في كتاب الله فهو باطلٌ وإن كان مائة شرط** )[١٦], چونكە دامەزراندنی عەقدەكە ئـەوە دەگەیەنێ وپێویست دەكات فرۆشراوەكە – دوای تەسلیم كردنی – ببێتە هی كڕیارڕ و ئەویش ببێـتە خاوەنی ماف لەڕەفتاردا, ئەنجا سوود وزیـانیش تـەنها لەسەر خۆیەتی و بۆ خۆی دەبێت, **هەروەها** لەبەر زیانی چاوەڕوانكراو بەهۆی كەمتەرخــەمی كردنــی كڕیــار لەبازاڕگــەرمی (**تـرويج**) كــردن بــۆ ماڵەكــەی وەبەخەسار فرۆشـتنی, **هـەروەها** لەبـەر ئـەوەی قسـەی فرۆشـیار كـە ئـەڵێ: ئەگەر ئەم ماڵەیەم خساری كرد ئەوا بۆتی دەبژێرم چونكە هاندان وفریـودانی تێدایە لەو لایەنەوە كـە ماڵەكـەی لـەپێش چـاو وا لێ دەكـات كـەبازاڕی هەیـە وخەسار ناكات و ئەو پارەیە دەهێنێ.[١٧]

**پ١٧٠/ ڕای بـەڕێزتان چـیە لـەوەی هەنـدێ بازرگـان دەیكـەن كەلەگـەڵ كڕیـاردا پێكـدێن لەســەر ئـەوەی كڕیـار بـۆی هەیـە شـتە كڕراوەكە بگێڕێتەوە بەڵام بۆی نیە پارەكەی بباتەوە بـەڵكو بۆی هەیـە**

---

[١٦] متفق عليه

[١٧] **كتێبی فتاوی اللجنة الدائمة فتوای ژمارە** ١٩٦٣٧ ب ١٣ ل ١٩٨.

**شتی تر هەڵگرێ, لەکاتێکدا هیچ شتێکی بەدڵ نەبوو فرۆشیار پارەکە لای خۆی دەهێڵێتەوە تا ئەو کاتەی کڕیار شتی تر دەبات؟**

وەڵام: مەرجی ویستن یان نەویستن بۆ کاتێکی زانراو دروستە, کڕیار بۆی هەیە لەو ماوە دیاری کراوەدا ئەو شتەیە رەتکاتەوە, و پارەکەی خۆیشی لە فرۆشیار وەربگرێتەوە, بەڵام مەرجی نەبردنەوەی پارەو بردنی شتی تر لەجێگەی ئەو شتە گەڕاوە ئەوە مەرجێکی نادروستە ودروست نیە کاری پێ بکرێ لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ( **كل شرطٍ ليس في كتاب الله فهو باطلٌ وإن كان مائة شرط** )[١٨].

**پ١٧١/ ئایا دروستە گیاندار (حیوان) بە کێشانە بفرۆشرێت؟**

بەڵێ دروستە, هەروەها کڕین وفرۆشتنی بە بینین دروستە بە ئیجماع, ئەو ئامێرانەش کەلەسکیدایە کار ناکاتە سەر ئەو حوکمەی باسمان کرد, هەروەها خواردنیشی دروستە, چونکە دروستە بفرۆشرێت چونکە حوکمی ئەو

[١٨] بڕوانە کتێبی فتاوى اللجنة الدائمة فتوای ژمارە ١٩٨٤٠ ب ١٣ ل١٩٩.

وەردەگرێـت کـەوابوو فرۆشـتنی گیانـدار بـەو ئامێرانەشـەوە کەلەسـکیدایە بەکێشانە دروستە.[19]

**پ۱۷۲/ لای بەڕێزتان زانراوو ئاشکرایە جۆرێك لە جۆرەکانی مامەڵەی بازرگانی لەنێوان خەڵك و بەتایبەت بازرگانەکان بریتیە لە کڕین وفرۆشتنی دراوی جیاواز یەکتر بە یەکتر, بۆ نموونە: دۆلار بە ریالْ و دۆلار بە دینار وبەپێچەوانەوە هتد, هەروەها بۆ هەر جۆرە دراوێك دوو نرخ هەیە (کڕین وفرۆشتن)..... بۆیە پێمان خۆشە ئەم پرسیارانە لەبەڕێزتان بکەین:**

**أ) ئایا ئەم جۆرە مامەڵەیە دروستە؟ وەبەکڕین وفرۆشتن ناودەبرێت؟**

**ب) ئەگەر دروستە بەڵگە چیە لەسەر جیاکردنەوەی لەو شتانەی ڕیبایان تێدایە کە دروست نیە لەکاتی گۆڕینەوەدا زیادیان لەسەر وەربگیرێت؟**

---

[19] بروانة كتيبى فتاوى اللجنة الدائمة فتواى ذمارة ۳۲۲۹ ب ۱۳ ل ۲۸۹.

وەڵام: ئەم شێوە مامەڵەیە کرین وفرۆشتنە لە دوو شتدا کە ریبای تێدایە ئەمەش حەڵاڵە بەمەرجێك دەست بەدەست بکرێت واتە قەرزی تێدا نەبێت بابە زیاد وکەم بفرۆشرێت چونکە هەردوو شتەکە لەرەگەزدا لەیەك جیان بەبەڵگەی ئەو حەدیسەی پێغەمبەر ﷺ کەفەرموویەتی: ( لا تبيعوا الذهب بالذهب إلا مثلا بمثل ولا تُشفوا [20] بعضها على بعض ولاتبيعوا الورق بالورق إلا مثلا بمثل ولا تشفوا بعضها على بعض ولا تبيعوا منها غائباً بناجز[21]).

پارەی کاغەزیش لەجێی هەردوو دراو ئاڵتون و زیوە, ئەو پارانەی لە پرسیارەکەدا باسکراون جیاوازن لەرەگەزدا کەوابوو دروستە بەیەکتر بەزیادو کەم بفرۆشرێت بەمەرجێك قەرزی تیانەبێ, چونکە هەموو دراوێکی کاغەز بۆخۆی رەگەزەکەی تایبەتە بەپێی ئەو وڵاتەی دروستی دەکات چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەبە قەرز فرۆشتنی ئەو جۆرانەی ریبایان تێدایە لەگەڵ یەکتردا ئەم مامەڵەیەش پێی دەوترێ (صرف) [22] کە جۆرێکە لە جۆرەکانی کرین وفرۆشتن.

---

[20] واتە بەزیاد وکەم

[21] نائامادە بە حازر

[22] واتە فرۆشتنی دراو بە دراو.

ب) هەروەها ئەو شتانەی ریبایان تێدایە وەك گەنم وجۆ و خورما ومێوژ ئەگەر لـە رەگـەزدا یـەك بـوون دروسـتە بەیـەكتر بگۆردرێنـەوە بەهـەردوو مـەرجی چـونیەك وئامـادە ( التماثـل والتقـابض) ئەگـەر لـە رەگەزیشـدا جیـاوازبوون دروستە بەزیاد وكەم بگۆردرێنەوە بەمەرجێ قەرزی تێدا نـەبێت, زیـاد وكـەم وەرگرتن دروست نیە ئەگەر هەردوو رەگەز یەك بوون بەحازربێ یـان بەقـەرز, وەرگرتن وبەقەرزدانی ئەو شتانەی ریبایان تێدایە دروسـت نیـە چ لەرەگـەزدا یەك بن یان جیاواز, هەروەها ئەگەر تەنها یەك لەوانـەش بەقـەرز بـێ, مەگـەر یەك لەو شتانە نەقد بێـت و ئـەوی تـر نەقـد (دراو) نـەبێت ئـەو كاتـە بەقـەرز دروستەوەكو (سەلەم وبیع الاجل).

**پ ١٧٣/ ئــەو كەســانەی دووكانــدارن هەركاتــەی بــە نرخێــك دراو دەفرۆشــن بەتایبــەت لای ئێمــە بــەیانیان دۆلار بــەرز دەبێتــەوە یــان دادەبەزێت یان شەوان ئایا ئەم فرۆشیارە هیچ تاوانێكی لەسەرە؟**

وەڵام: جیاوازی نرخی دۆلار لەكاتێكەوە بۆ كـاتێكی تـر بـەپێی گـۆڕانی دراو لەبازاڕدا هیچ تاوانێكی تێدا نیە.[٢٣]

---

[٢٣] بروانە كتیبی فتاوى اللجنة الدائمة فتوای ژمارە ٣٠٣٧ ب ١٣ ل ٤٣٩.

**پ ١٧٤/ ئێمە بڕكەیەك (مەڕ) مان هەیە ئەو پاشماوەو پشقلەی لێیان بەجێ دەمێنێ كۆی دەكەینەوەو قەڵابەستەی دەكەین, وەلەبەر ئەوەی كێڵگەكەمان نیە سوود لەم پەینە وەربگرین, پرسیار لەبەڕێزتان دەكەین ئایا دروستە بیفرۆشین؟ ئایا پارەكەی حەڵاڵە بیخۆین؟**

وەڵام: فرۆشتنی پەینی پاك دروستەو هیچی تێدا نیە وەك پەینی مەڕو مانگاو ووشتر, هەر گیاندارێك گۆشتی بخورێت پاشماوەكەی پاكە فرۆشتنیشی حەڵاڵەو خواردنی پارەكەشی دروستە وحەڵاڵە وهیچ تاوانێكی تێدا نیە, ئەوەی كەوا گومان وكێشەی تێدایە ئەو پەینەیە كەوا پیسە یان پیس كراوە, بەڵام پەینی پاك بەكارهێنانی دروستەو فرۆشتنی وپارەكەیشی حەڵاڵە.[٢٤]

**پ ١٧٥/ هەندێ بازرگان شتومەك دەكڕن ونایبینن ووەری ناگرن تەنها پارەكەی دەدات و وەصلێكی لێ وەردەگرێ ودەیخاتە كۆگای ئەو بازرگانەی لای كڕیویەتی وئەمیش دەیفرۆشێتەوە بەكەسانێكی**

---

[٢٤] **بروانە كتێبی** فتاوى اللجنة الدائمة **فتوای ژمارە** ١٨٦٤١ ب ١٣ ل ٤٦٢.

**ترو ماڵەکەش هەرلە کۆگای بازرگانی یەکەمدایە ئایا ئەم جۆرە کارە حوکمی شەرعی چییە؟**

وەڵام: بۆ کڕیار دروست نیە ئەو شتومەکە بفرۆشێت تا لای فرۆشیار بێت و نەیهێنێتە لای خۆی یان بازاڕ لەبەر ئەو فەرموود صحیحانەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ سەلماون لەوانە: (لا يحل سلف ولا بيع ولا بيع ما ليس عنك )[٢٥] هەروەها ئەم فەرموودەیەی کە بەحکیمی کوڕی حزام دەفەرموێ : (لا تبع ما ليس عنك )[٢٦], هەروەها لەزەیدی کوڕی سابتەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ : ( نهى أن تباع السلع حيث تبتاع حتى يحوز التجار اى رحالهم)[٢٧] , هەروەهائەوەشی دەیکڕێت دروست نیە بیفرۆشێت تاوەکو نەیگوێزێتەوە بۆ ماڵی خۆی یان جێگایەکی تر لەبازاڕ لەبەر ئەو فەرموودانەی کە باسکران و ئەوانەشی باسنەکراون ئەو مانایە دەگەیەنن.[٢٨]

---

[٢٥] اخرجة الإمام أحمد وأهل السنن بإسناد صحيح.

[٢٦] أخرجه الخمسة إلا أباداود بإسنادٍ جيدة.

[٢٧] رواه أحمد وأبو داود وصححه ابن حبان والحاكم.

[٢٨] وەڵامی شێخ ابن باز بڕوانە فتاوى البيوع ل ٣٢.

**پ١٧٦/ ئــەوەی ئــەمڕۆ لای زەڕەنگــەر بــاوە ئەوەیــە ئــاڵتونی بەکارهێنراو وەردەگرن غەرامی بە (٣٠) ریاڵ و ئاڵتونی تازەشی پێ دەفرۆشێت غەرامی بە (٤٠) ریاڵ , ئایا حوکمی شەرعی ئەم جۆرە مامەڵەیە چیە؟**

وەڵام: دروست نیە ئاڵتونی خراپ بەچاك بگۆڕدرێتەوە وسەری لەسەر وەربگیرێت, بەڵگەش ئەو حەدیسەیە کە بوخاری وموسلیم و کەسانی تر ڕیوایەتیان کردووە لەبەسەرهاتی بیلال کە هەندێ خورمای تازەی هێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەویش پێی فەرموو ئەمەت لەکوێ هێنا؟ بیلال وتی: خۆمان خورمای خراپمان هەبوو دوو صاعی ئەوەی خۆمانم گۆڕیەوە بەیەك صاعی ئەم خورمایە بۆ ئەوەی بیدەم بە تۆ , پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (أُوَّه, لا تفعل, عين الربا عين الربا )پێغەمبەر ڕوونی کردەوە ئەو شتەی گۆڕینەوەی بەرانبەر واجبە بەبێ زیاد گۆڕینەوەی لەبەر چاکی و خراپی ریبایەو دروست نیە , بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەرەوشتی باوی خۆی فێری کردوو خستیە سەر ڕێگەیەکی حەڵاڵ و هانی دا خراپەکە بفرۆشێت بەچەند درهەمێك وپاشان خورمای تازەی لێ بکڕێت, بۆیە لەبەر ئەم بەڵگەیە ئەڵێین ئەگەر ئافرەتێك ئاڵتونی خراپی هەبوو یان ئاڵتونێك باو نەبێ ئەوا لەبازاڕ دەیفرۆشێت و

وئـەنجا پارەکـەی وەردەگـرێ و ئـاڵتونی چـاکی پـێ دەکرِێـت, ئـەو رێگەیـە دەگرێتە بەر کە پێغەمبەر بۆی روون کردوینەتەوە.[29]

**پ١٧٧/ حـوکمی شـەرع چـیە لەکەسـێکدا کـە ئاڵتونەکـەی دەدات بەکارگـەی ئـاڵتون بـۆ ئـەوەی بـۆی دروسـت بکـات زۆرجـار لـەکاتی تواندنەوەی ئاڵتوندا لەکارگەکاندا, ئاڵتونی کەسێك دەگۆڕێتەوە بەهی کەسـێکی تـر, بـەڵام کاتێـك وەری دەگرێـت بەهـەمان کـێش وەری دەگرێـت کـە داویـەتی, ئایـا کرێـی دروسـتکردن مەرجـە لـەکاتی وەرگرتنـەوەی ئاڵتونەکـەی یەکسـەر بیـدات یـان مـەرج نیـە ودروسـتە بەقەرز لەسەری حسا بکرێت؟**

وەڵام: لەسەر کارگەی دروستکردنی ئاڵتون پێویستە ئاڵتونی خەڵکی تێکـەڵ بەیەکتر نەکات و شتی هەرکەس بەجیا دابنێت ئەگەر عەیارەکان جیاوازبوون, بـەڵام ئەگـەر عـەیارەکان یـەك بـوون ئـەوا دروسـتەو هـیچ زیـانێکی تێدانیـە, پێویست نیە یەکسەر کرێی پێ بدات چونکە ئەمـە کرێیـە لەسـەر کـار ئەگـەر

---

[29] وەڵامی شێخ ابن عثیمین / فتاوی البیوع ل ٧٤.

لەکاتی وەرگرتنیماڵەکەی کرێی تەسلیم کرد ئەوا باشەو ئەگەر دوای خست ئەوا دروستە.[30]

## پ١٧٨/ کاغەزە بازرگانی یەکان (سەك .. سەنەد .. کومبیالا) و حوکمی کڕین و فرۆشتنیان

**وەڵام :**

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ، وَنَسْتَعِيْنُهُ ، وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ .

خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَن جَاءهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَىَ فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ [سورة البقرة : (٢٧٥)] .

واتە : خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و سووی حەرام کردووە ، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا ئەوەی دەست

---

[30] وەڵامی شێخ ابن عثیمین / فتاوی البیوع ل ٨٠.

کەوتووە بۆ خۆی کاری لێپرسینەوەشی دەکەوێتە لای خوا ، بەڵام ئەوەی دەست بکاتەوە بە سوو خۆریی ئا ئەوانە جێنیشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تێدا دەبەنە سەر .

وە دەفەرموێ : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٢٧٨) فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ (٢٧٩)﴾ [سورة البقرة] .

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پارێزکار و خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن خۆ ئەگەر وا نەکەن ئەوە جەنگ لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) ڕابگەیەنن ، خۆ ئەگەر تەوبە بکەن و لە سوو خۆری واز بهێنن ئەوە تەنها سەرمایەکانتان بۆ هەیە وەریگرنەوە نە ستەم دەکەن لە قەرزارەکان نە ستەمتان لێدەکرێت .

وە جابری کوڕی عەبدوڵا فەرموویەتی : ((لعن رسول الله ﷺ آكل الربا وموكله وكاتبه وشاهديه ، وقال : هم سواء)) رواه مسلم .

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی کردووە لە سوو خۆر و سوودەر و نوسەرەکەی و هەردوو شایەتەکەشی ، فەرموویەتی : ئەوانە هەموویان لە تاواندا وەك یەکن .

دوای ئەوە : (شیك) یان (سەك) یەکێکە لە جۆرەکانی کاغـەزی بازرگـانی (الأوراق التجارية) کە بریتین لە چەند بەڵگەنامەیـەك کـە پابەنـدبونیان تێدایـە بە دانی بڕێك پارە کە بە پێی باو لە دوای کاتێکی کەم مافی دانەوەی هەیە .

## جۆرەکانی کاغەزی بازرگانی

یەکـەم : (کۆمبیـالا) : بریتیـە لـە فـەرمانێکی نووسـراو بـە پـێی چـەند بارودۆخێکی تایبەت ـ کە یاسا دیاریکردووە ـ کەسێك کە بە ڕاکێشەر حیساب دەکرێت ئاراستەی دەکـات بـۆ کەسـێکی تـر کـە بـەلێبراو نـاو دەبرێـت داوای ئەوەی لێدەکات کـە بڕێـك پـارەی دیـاریکراو لـە بـەروارێکی دیـاریکراودا یـان شیاوی دیاریکردن بێت بـدات بـە کەسـی سـێیەم (کەسـی کـەڵك وەرگرتـوو / مستفید) یان بە هەڵگری ئەو بەڵگەنامەیە (حاملهِ) .

دووەم : (سەنەد) : بریتیە لە پابەند بوون بە دانی بڕێك پارەی دیاریکراو لە بەروارێکی دیاریکراودا یان شیاوی دیاریکردن بێـت بـۆ بەرژەوەنـدی کـەڵك وەرگر (مستفید) یان هەڵگر (حامل)ی سەنەد .

سێیەم : (شیك) یان (سەك) : فەرمانێکە بە نوسین ئەو کەسـەی پـارەی لە بانك داناوە (ئەو کەسـە چ تـاك بێـت یـان کۆمپانیـا یـان حکومـەت) واژوی دەکات و فەرمان بەو بانکە دەکات کە بڕێکی دیاریکراو لـە کـاتی داوا کردنـدا

بدات بە کەسی سێیەم (مستفید) یان بە خودی خاوەن پارەکە یان فەرمانی یان هەڵگر (حامل)ی ئەو (شیك) سەکە .

جا ئەم کاغەزە بازرگانیانە بە دەستەواژەی مامەڵەی سەردەم حیساب دەکرێن ، وە مافی سامانی و نەقدی و قەرزی لە لابوون جێگیر دەکەن ، وە چەندین تایبەتمەنییان هەیە لەوانە :

١ ـ ئەم کاغەزە بازرگانیانە بەڵگەنامەی قەرزن بە شێوازێکی کورت و پوخت نوسراوەتەوە .

٢ ـ فەرمان بە دانەوەی تێدا ڕەهایە و نەبەستراوە بە هیچ مەرجێکەوە .

٣ ـ بابەتیان بڕێکە لە پارە کە پێویستە بدرێت ، ئێستا بێت یان دواتر .

٤ ـ دەتوانرێت بە ئاسانی جێگۆڕکێ و گواستنەوەی لە نێو خەڵکدا پێبکرێت .

## حوکمی دروست کردنی ئەم کاغەزانە و مامەڵە پێکردنیان

بە کورتی حوکمی دروست کردنی ئەو کاغەزانە ئەگەر سووی لە سەر بێت یان قازانجێکی بە مەرجگیراوی تێدا بێت ئەوا زۆربەی زانایان و توێژەرەوایان ئەسڵەن بە حەرامیان داناوە دروست بکرێن[1].

جا مەگەر ئەوانەی تێدا نەبێت ئەو کاتە دەتوانین بڵێین :

پێشەکی دەبێ بزانین ئەم کاغەزانە لە حەقیقەتدا تەنها بریتین لە چەند پەڕە کاغەزێك چەند ژمارە و شتێکیان لە سەر نوسراوە ، کۆمەڵە مافێکی سامانی و قەرز دەنوێنن و جێگیر دەکەن ، جا حوکمی هەریەك لەمانە نازانرێت تاوەکو ئامانج لە دروستکردنیان نەزانرێت .

سەنەد : ئامانج لە دروستکردنی بەڵگەنامەیەکە قەرزێکی دواخراو جێگیر دەکات ، جا جێگیر کردن و پشت ئەستور کردنی قەرز داخوازییەکی شەرعیە و ئیسلام بانگەوازی بۆ کردووە ، بەڵام وەك وتمان بانکی سوو خۆر (سوو / ریبا) وەردەگرێ لە سەر ئەم جۆرە بەڵگەنامانە ، هەرچەندە

---

[1] بڕوانە ئەم سەرچاوانە : (في الشركات ، شركة المساهمة ، فقه الزكاة ، حكم ودائع البنوك ، الربا والمعاملات المصرفية ، الإسلام ومشكلاتنا الحضارية ، المعاملات المالية المعاصرة ، أسواق الأوراق المالية والمصارف الإسلامية ، بنوك تجارية بدون ربا ، الأعمال المصرفية والإسلام) ... هتد .

دروستکردنی سەنەد لە خودی خۆیدا حەرام نییە و مەکروهیش نییە بەڵکو لە شەرعی ئیسلامدا خوازراوە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت .

٢ ـ کومبیالا : ئەگەر بە وردی دیراسەی کومبیالا بکەین وەك لە پێشەوە پێناسەمان کرد دەبینی شێوازێکە لە شێوازەکانی عەقدی حەواڵە کە شەرعزانان بە درێژی حوکمەکانیان ڕونکردووەتەوە ، کە بە کورتی پێناسەکەی بریتیە لە (نقل الدَّين من ذِمَّةٍ إلى ذِمَّة)[٢].

واتە : گواستنەوەی قەرز لە گەردنی کەسێکەوە بۆ گەردنی کەسێکی تر.

وە بزانە لە حەواڵەدا سێ لایەن هەیە :

یەکەم : قەرزار . دووم : قەرزدەر .

سێیەم : ئەو کەسەی قەرزەکە لە جیاتی قەرزار دەداتەوە .

ئاینی ئیسلامی پیرۆز ڕێگەی بە گواستنەوەی قەرز داوە ، چونکە خەڵکی پێویستیان پێی دەبێت ، بەڵگەش لە سەر ئەم کارە سوننەت و یەکدەنگی زانایانە ، کەوابوو ئەگەر حەواڵەکە مەرجەکانی تێدا بوو وە (کومبیالا) بە

---

[٢] مغني المحتاج للشربيني ، نهاية المحتاج للرملي .

شێوازێكی شەرعی نوسرایەوە ئەوا دروستە و كاری پێیدەكرێت .

(شیك : سەك) : وە لە پێشەوە پێناسەمان كرد فەرمانێكە بە بانك كە بڕێكی دیاریكراو پارە بدات بە كەسی سێیەم یان بە خودی خاوەن پارەكە یان هەڵگری (شیك)ەكە .

جا ئەگەر بە وردی دیراسەی ناوەڕۆكی ئەم پێناسەیە و سەرجەم پێناسەكانی تری (شیك) بكەین كە لە كتێبە ئابوری و بازرگانییەكاندا تۆماركراوە دەبینین شیك بریتییە لە حەواڵە و گواستنەوەی قەرز یان كردن بە وەكیلی بانك لە جیاتی خاوەنی پارەكە ، جا لە ڕووی نوسینی شیك و بەكارهێنانی بۆ ئەو مەبەستانەی بۆی نوسراوە هیچ ڕێگرێك نییە لە شەرعدا و ئەمیش دەچێتە ژێر ئەحكامی حەواڵە یان وەكالەوە .

هەروەها ئەگەر فەرمانەكە لە لایەن خاوەنی پارەكەوە بوو بۆ خودی خۆی نەك كەسی سێیەم ئەوە پێی دەگوترێت گێڕانەوە (استرجاع) و ئەحكامی سپاردە (الودیعة) لە خۆ دەگرێت .

دوای ئەو پێشەكییانە ئەو كاغەزانەی بۆ ماددەی (١٤٠) نوسراون بریتین لە جۆری سێیەم واتە (شیك)ن ، جا دوای لێكۆڵینەوەی نوسراوی

سەر ئەو جۆرە کاغەزانە و دیراسـەی شـیك لـە لایـەن زانایـانی پسـپۆڕەوە[٣] دەرکەوتووە شیك یان حوکمی حەواڵە یان وەکالە یان سپاردە (وديعة) لە خۆ دەگرێت .

جا (شیك)ی تایبەت بە ماددەی (١٤٠) بێگومان سـپاردە (وديعة) نییـە چونکە لایەنی سێیەمی تێدایە کەوابوو حەواڵەیە یان وەکالە ، هـەر کـام لـەم دووانە بێت حوکمی بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت :

## حوکمی کڕین و فرۆشتنی کاغەزە بازرگانییەکان

بنیات لە سەر ئەوەی هەموو ئەو کاغەزانە بە هەموو جۆرەکانیانەوە ئەوە دەگەیەنن و نوێنەرایەتی ئەوە دەکەن کە خاوەنیان (واتە : ئەو کەسەی بۆی نوسراوە) قەرزی لای دەرهێنەری ئەو کاغەزانەیـە (شـیك) یـان (سـەنەد) یـان (کومبیالا) ، ئەمە لە لایەك و لـە لایـەکی تریشـەوە گۆڕینـەوەی دراو (العملة) بریتییە لە ئاڵوگۆڕی پارە بە پارە بە مەرجی دەست بە دەست بوون ، جا لە کاتێکدا ئەو کاغەزانە دارو نین و نوێنەرایەتی قەرزێك دەکەن کـەوابوو یـەکێك لە مەرجـەکانی ئـاڵوگۆڕی دراو (العملة) لـەو مامەڵەیـەدا نوقسـانە بۆیـە بـاتڵ

---

[٣] بڕوانە کتـێبی : (الخدمات المصرفية) و (موسوعة القضايا الفقهية) و (الأسهم والسندات وأحكامها) و (قضايا فقهية معاصرة في المال والاقتصاد) وە چەندین کتێبی تر .

دەبێت ، بەڵام جگە لە زێڕ و زیـو و دراو مامەڵـەی تـری پێـدەکرێت ، چـونکە (شت و مەك / السلعة) جگە لە زێڕ و زیو بە قەرز دەفرۆشرێت .

ابن رجب لە کتێبی (القواعد)دا ئەڵێ : (بيع الصكاك قبل قبضها وهي الديون الثابتة على الناس وتُسمَّى صِكاكاً لأنَّها تُكتَبُ في صِكاك وهي ما يُكتب فيهِ من الرَّقِّ ونحوهِ ، فيُباع ما في الصَّك فإن كان الدَّينُ نقداً وبِيعَ بنقدٍ لَمْ يـجزْ بلا خِلاف لأنَّهُ صرفٌ بنسيئةٍ)(٤).

واتە : فرۆشتنی (سەك) پێش وەرگرتنی لە کاتێکدا قەرزێکە سەلمێنراوە

لە سەر دەرهێنەری ، وە پــێی دەگوترێـت (صِكاك) چـونکە لــە (صِكاك)دا دەنوسرێت کە بریتییە لەو شتانەی تێیدا دەنوسرێت وەك پێست و شـتی تـر* .

جـا ئـەوەی تێیدایـە دەفرۆشـرێتەوە ئەگـەر قەرزەکـە دراو (نقـد) بـوو وە فرۆشرا بە دراو (نقد) دروست نییە بەبێ جیاوازی زانایان چونکە ئاڵوگۆڕە بـە قەرز .

لەم قسانەی (ابن رجب) ئەوەمان دەسدەکەوێت کە :

---

(٤) القواعد : (١ / ٣٩٦) نقلاً عن كتاب الأسهم والسندات وأحكامها ص : (٣١٦) .

* ئێستا لە کاغەزدا دەنوسرێت .

**یەکەم : ئەوەی لەو کاغەزانەدا دەنوسرێتەوە قەرزن .**

**دووەم : گۆڕینەوە دراو بە دراو** (بَيْعُ نقدٍ بنقدٍ) **ئەبێ دەست بە دەست بێ.**

**وە پرسیار کراوە لە شێخ** (محمد بن صالح العثيمين) **ڕەحمەتی خوای لـێبێت** : (ما حكم التعامل بالشيكات في بيع الذهب إذا كانت مستحقة وقت البيع حيث إنَّ بعض أصحاب الذهب يتعامل بالشيكات خشية على نفسهِ ودراهمهِ أنْ تُسرق منه؟

فأجاب : لا يجوز التعامل بالشيكات في بيع الذهب أو الفضة ، وذلك لأنَّ الشيكات ليست قبضاً ، وإنَّما هي وثيقة حوالةٍ فقط بدليل أنَّ الذي أخذ الشيك لو ضاعَ منه لَرجع على الذي أعطاهُ إيَّاهُ ، ولو كان قبضاً لَمْ يرجع عليهِ ، وبيانُ ذلك أنَّ الرجلَ لو اشترى ذهباً بدراهم واستلم البائع الدراهم فضاعت منه لَمْ يرجع على المشتري ، ولو أنهُ أخذ من المشتري بالثمن ، وهذا دليلٌ على أنَّ الشيك ليس بقبضٍ ، وإذا لَمْ يكن قبضاً لم يصح البيع ، لأنَّ النبي ﷺ أمر ببيع الذهب بالفضة أنْ يكون يداً بيدٍ إلاَّ إذا كان الشيكُ مصدَّقاً من قبل البنك واتصل البائع بالبنك وقال : ابقِ الدراهم عندك وديعةً لي فهذا قد يُرخص فيه)(٥).

---

(٥) فتاوى البيوع في الإسلام ص : (٧٧) .

واتە : حوکمی مامەڵە کردن بە چەکی دراو لـە فرۆشـتنی زێـڕدا چـیـیە ؟ ئەگەر ئەو چـەکە مـافی وەرگـرتنی هـەبێت لـە کـاتی ئـەو فرۆشـتنەدا چـونکە هەندێ لە زەڕەنگەرەکان کار بە چەکی دراو دەکـەن ، لـە خـۆی و پارەکـەی دەترسێ کە لـێی بدزرێت ؟

ئەویش وەڵامی داوەتەوە :

دروست نییە لە فرۆشتنی زێڕ یـان زیـودا مامەڵـە بـە چـەکی دراو بکرێـت چونکە چەکی دراو حیسابی وەرگێراوی بۆ ناکرێت ، بەڵکو تەنها بەڵگەنامـەی حەواڵەیە و بەس ، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو کەسەی ئـەو چـەکەیە وەردەگرێـت ئەگەر لـێی ونببێت دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئـەو کەسـەی پێیـداوە ، جـا ئەگـەر شتێکی وەرگیراو بێت ناگەڕێتەوە بۆ سەری ، ڕونکردنەوەشی ئەوەیـە ئەگـەر پیاو زێڕی کڕی بە چەند دیرهەمێك و فرۆشیارەکە ئەو دیرهەمانەی وەرگرت و دوای ئەوە لـێی ونبوو ناگەڕێتەوە بۆ سەر کەسی کڕیـار ، ئەمـە بەڵگەیـە لـە سەر ئەوەی (شیك) وەرگیراو نییە ، جـا ئەگـەر وەرگـیراو و لەدەسـتدا نـەبوو ئـەوە ئـەو فرۆشـتنە دروسـت نییـە ، چـونکە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی کردووە فرۆشتنی زێڕ بە زیو ئەبێ دەست بە دەست بێ ، مەگەر ئەو چەکەیە پەسەند و قەبوڵکراوبێت لە لایەن بانکەوە ئەنجا فرۆشیاری زێڕەکە پەیوەندی

بکات بە بانکەوە و بڵێت ئەو دیرهەمانەی لەو چەکەدا هاتووە وەك (سپاردە / وديعة) لای خۆت بهێڵەوە ، ئەمە لەوانەیە روخسەتی پێبدرێت .

دەبینی ئەم زانایەش کە کەسایەتیەکی ناسراو و یەکێك بوو لە پێشەوایان لەم سەردەمەدا ئەڵێ : ئەم چەکە تەنها بەڵگەنامەی حەواڵەیە .

وە پرسیار کراوە لـە شـێخ (ابن باز و عبد الرزاق عفيفي و عبد الله غديان) ڕەحمەتی خوایـان لـێبێت : (هل بيع الشيكات أو الكومبيالات حلال ولو كان بالخسارة أي أقل من الثمن المكتوب ؟

الجواب / بيع الشيكات على الكيفية المذكورة لا يجوز لما فيهِ من ربا النسأ وربا الفضل)[٦].

واتە : ئایا فرۆشتنی شیك و کومبیالا دروستە ئەگەر بێت و بە زەرەر بیفرۆشێت واتە : بەکەمتر لەو بەهایەی کە تۆمار کراوە لە چەکەکەدا ؟

وەڵام : فرۆشتنی شیك بەو شێوەیەی لە پرسارەکەدا هاتووە دروست نییە لەبەر ئەوەی هەر دوو جۆری سووی دواخستن و زیادەی تێدایە .

---

[٦] فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء : (١٣ / ٣٣٣) .

**وە لە وەڵامی پرسـیارێکی تـردا زانایـان** (ابن باز ، عبد العزيز آل الشيخ ، عبد الله غديان ، صالح الفوزان ، بكر أبو زيد) **دەفـەرموون** : (لا يـجوز بيع وشراء سندات النقود الـحالة والـمؤجلة بأقل مِمَّا فيها أو أكثر مِمَّا فيها لأنَّ ذلك يُعتبر من صريح الـربا ، وقـد اجتمـع في هـذه الـمعاملة ربا الفضـل وربا النسـيئة وكلاهمـا مُحـرَّم بالنص)[٧].

**وە پرسـیار کـراوە لـە زانـای گـەورە و فەرمووده‌ناسـی سـەردەم شـێخ ئـەلبانی ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت:** (هـل يـجوز بيع الصك إلى إنسانٍ آخر غير صاحب الصك؟

**لە وەڵامدا فـەرمووی :** طبعاً هذا لا يـجوز إطلاقاً لأنَّ هـذا ربا ، لا يـجوز أنْ يُبـاع السـند الـذي قيمتـهُ ألـف بتسعمائة مثلاً لأنَّ هـذا شراء النقـد بأقـل مـن قيمتـهِ ، وهذا هو عينُ الرِّبا ، ولكـن الـذي يـجوز : يـجوز لصاحب الـحق (مالك الصك) أنْ يتنازل عن حقهِ عند الـمدين ، أمَّا بطريق البيع والشراء بأقل فهذا لا يـجوز ...)[٨].

**بە کورتی واتە : کڕین و فرۆشتنی چەك دروست نییە چونکە ریبایە .**

---

[٧] فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء : (١٣ / ٣٣٥) .

[٨] أشرطة سلسلة الهُدى والنور ، الشريط رقم : (٢٦١ / ٥) .

**وە پرسیار کراوە لە شێخ** (صالح الفوزان) **خوا بیپارێزێت :** (أردت شراء عملة أجنبية أو ذهب وحسبت القيمة بالدولار ودفعت السعر بالريال السعودي ثم أعطاني البنك مقابل العملة شيكًا بالعملة التي اتفقت على شرائها مع البنك، هل هذا جائز أم لا ؟

**لە وەڵامدا فەرمووی :** بيع العملة بالعملة يسمى صرفًا ، إن اتحد الجنس بين العملتين اشترط الحلول والتقابض في المجلس والتساوي في المقدار، وإن اختلف الجنس بين العملتين جاز التفاضل ووجب التقابض في المجلس بأن يسلم العملة ويستلم العملة لا بديلة عنها في المجلس ، والشيك لا يعتبر قبضًا وإنما هو سند فقط، لو ضاع أو تلف رجع على من أعطاه إياه يطالب بحقه ولو كان قبضًا ما ساغ له الرجوع لأنه قبض حقه ، والحل الصحيح أن يقبضه العملة البديلة ويحولها إلى البلد الذي يريد)[٩].

**کەواتە کڕین و فرۆشتنی چەکی ماددەی (١٤٠) بە پارە چ بە دۆلار بێت یان بە دینار بە کەمتر یان بە زیاتر یان بە بەرامبەر بێت حەرامە و بەڵکو سوو خواردنی تێدایە پەنا بە خوا لە ڕزقی حەرام !**

**لە کۆتاییدا داوام وایە لە موسڵمانان ئەوانەی ئاڵوگۆڕی دراو دەکەن (الصيارفة) وەك چارەسەرێك بۆ خۆ لادان لەم کارە حەرامە بۆ خۆیان و**

---

[٩] المنتقى من فتاوى الشيخ الفوزان الفتوى رقم : (٣١٦) .

موسڵمانانیش ئەگەر لە توانایندا هەیە بە بەرامبەرێکی (مەشروع و مەعروف و مەعقول) ئەو چەکانە وەرگرن بە بێ کرێن ئەنجا بۆیان بگۆڕنەوە لە بانك پاشان لە حەقی ئەم کارە کرێ (عمولە) لە خاوەنی ئەو چەکانە وەرگرن (إنْ شاء الله) رزگارمان دەبێت لەو کارە حەرامە .

وصلى الله على محمد وعلى آلهِ وصحبهِ وسلَّم أجمعين .

# سەرچاوەکان

بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە ڕاستەخۆ سوودم لەم سەرچاوانەوە وەرگرتووە:

١ - فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء .

٢ - فتاوى البيوع في الإسلام .

٣ - الأسهم والسندات وأحكامها .

٤ - الخدمات المصرفية وموقف الشريعة الإسلامية منها للدكتور صلاح الدين عنزي .

٥ - بحوث فقهية في قضايا اقتصادية معاصرة لمجموعة من الدكاترة الباحثين.

٦ - قضايا فقهية معاصرة في المال والاقتصاد للدكتور نزير حماد .

**پ ١٧٨/ پرسـيار كـرا لـە شـێخی ئيسـلام ( ابــن تيميــة ) . ڕەحمـەتی خـوای لـیٚ بێـت . دەربارەی مانـای وتـەی ئـەو كەسـەی كـە دەڵێـت ( حب الدنيا رأس كُلِّ خطيئـة ) ئايا ئـەم تـاوان باری يـە لـە ڕووی سەرپێچـی كردنـی فەرمانـەكانی خوايـە ، يـان لـە ڕووی كۆكردنـەوەی ماڵی دونيايە؟**

**وەڵام** / لە وەڵامدا دەفەرمێت : (ئەم ووتەيە لە پێغەمبـەرەوە ﷺ نەسـەلمێنراوە ، بـەڵكو وا بـاوە كـە (**جنـدب**)ی كـوڕی (**عبـدالله البجلـي**) ﵁ هـاوەڵی پێغەمبـەر ﷺ وتبێتـی، وە وتـراوە كـە پێغەمبـەر (**عيسى**) ﷺ وتبێتی .

ئەوەيش بزانە كەسێك كە لەم وتەيە زۆر ڕۆدەچێت و زيـادڕەوی تێـدا دەكات ، خۆ بە فەيلەسوف زانەكان و هەندێك لـە سۆفی يەكانـە كـە لەسـەر ڕێڕەوی ئەوان دەڕۆن .

بەڵام حوكمی ئيسلام لە سەر ئەم مەسەلەيە ئەوەيە : ئەو خۆشەويستی يـەی دونيا كە مرۆڤی لە سەر سزا بدرێت ئەوەيە كە ببێتە هۆكـار و هـەڵنانی مـرۆڤ بۆ تاوان كردن ، ئەمەيش وا پێويست دەكات مـرۆڤ زوڵـم و درۆ و خراپـەكاری

بکات ، بێگومان پێداگری مرۆڤ لە سەر ماڵی دونیا و پلە و پایە مرۆڤ دووچاری تاوان دەکات ، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە بوخاری و موسلیمدا فەرموویەتی : ﴿إياكم والشح فإن الشح أهلك من كان قبلكم ، أمرهم بالبخل فبخلوا ، وأمرهم بالظلم فظلموا،وأمرهم بالقطيعة فقطعوا﴾[١].

واتە : وریای حەزکردن و پێداگری نادروست بن لە ماڵی دونیا ، چونکە پێداگری و خۆشەویستی دونیا ئوممەتانی پێش ئێوەی لە ناو بردووە ، فەرمانی پێکردن بە پیسکەیی و دەست قوچاوی ئەوانیش کردیان ، و فەرمانی پێکردن بە زوڵم و ستەم ئەوانیش کردیان، و فەرمانی پێکردن بە بڕینی پەیوەندی خزمایەتی ئەوانیش بڕییان .

(کعب )ی کوڕی (مالك) رضي الله عنه

لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی :﴿ ما ذئبان جائعان أرسلا في غنم بأفسد لها من حرص المرء على المال والشرف لدينه﴾[٢].

---

[١]- (صحيح سنن أبي داود) رقم : (١٦٩٨) و(صحيح الجامع الصغير) رقم : (٢٦٧٨) .

[٢]- (صحيح سنن الترمذي) رقم : (٢٣٧٦) .

واتە : پێداگری مرۆڤ لە سەر ماڵی دونیا و پلەو پایە لە دونیادا خراپترە بۆ لە ناوبردنی دینی مرۆڤ ، لە دوو گورگی برسی بکەونە ناو بڕکەیەك مەڕ و بزنی بێ شوان کە چۆن لە ناوی دەبەن ، کەوابوو پێداگری مرۆڤ لە سەر ماڵ و پلەو پایەی دونیا دیانەتی مرۆڤ لە ناو دەبات ، بەلاّم خۆشەویستی یەك کە تەنها لە دڵدا هەبێت، بەڵام ئەوەی خوا فەرمانی پێکردووە بیکات و ئەوەیشی کە نەهی لێکردووە نەیکات ، و لە خوا بترسێ و نەفسی خۆی قەدەغە بکات لە ئارەزووە خراپەکانی نەفس ، ئەوکاتە خوای پەروەردگار سزای نادات ، بەمەرجێك نەیکاتە کردەوە ، پاشان کۆکردنەوەی ماڵی دونیا بە مەرجێك پێویستی و مافەکانی خوای تێدا ئەنجام بدات ، وە بە حەرام پەیدای نەکردبێت لە سەری سزا نادرێت . بەڵام دەرکردن و بەخشینی ماڵی زیادە و وەستان لە ئاستی پێویست ( ماڵێك بەشی ژیان بە سەر بردن بکات ) باشتر و سەلامەتتر و ئاسانترە بۆ دڵی ئادەمیزاد و کۆکارە بۆ ئاواتەکانی موسوڵمان و بە سوودترە بۆی لە دونیا و قیامەتدا ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت : ﴿ من أصبح والدنيا أكبر همه شتت الله عليه شمله

وجعل فقره بين عينيه ولم يأته من الدنيا إلا ما كتب له ، ومن أصبح والآخرة أكبر همه جعل الله غناه في قلبه وجمع عليه ضيعته وأتته الدنيا وهي راغمة ﴾[٣] .

**واتە : هەرکەسێك ڕۆژبکاتەوە و زیاتر دونیا جێگەی گرنگی پێدانی بێت ، خوای گەورە کارەکانی پەرش و بەڵاو دەکات و مۆرکی هەژاری لە نێو چاوانی دادەنێت ، دونیایشی دەست ناکەوێت ئەو ئەندازەیە نەبێت کە بۆی نووسراوە ، وەهەرکەسێکیش ڕۆژبکاتەوە و زیاتر قیامەت جێگەی گرنگی پێدانی بێت ، خوای گەورە دڵی دەوڵەمەند دەکات و کارەکانی بۆ ئاسان دەکات و دونیاش بە ملکەچی دێتە بەر دەستی))[٤].**

## پ ١٧٩/ پرسیار کراوە لە ئیمامی ئەحمەد . ڕەحمەتی خوای لێبێت . دەربارەی کەسێك شەریکی گاور و جولەکە بکات لە کڕین و فرۆشتندا ؟

**وەڵام / لە وەڵامدا دەفەرمێت : شەریکیان دەکات بەمەرجێك خۆی سەرپەرشتی کڕین وفرۆشتن بکات ، چونکە ئەوان ڕیبا دەخۆن ، وماڵی خەڵك**

---

[٣]- ورد هذا الحديث بلفظٍ قريب من هذا في (صحيح سنن الترمذي) رقم : (٢٤٦٥) و(صحيح الترغيب والترهيب) رقم : (٣١٦٨) .

[٤]- **بڕوانە** : (مجموع الفتاوى): (١١ / ١٠٧ ـ ١٠٨).

بۆ خۆیان بە حەلاڵ دەزانن ، ئیمام ئەحمەد فەرمووی : چونکە ئەوان ووتویانە : ﴿لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ﴾ [آل عمران : ٧٥] ، واتە : ئەهلی کیتاب وتیان هیچ تاوانمان لە سەر نی یە ئەگەرماڵی جگە لە خۆمان پێ سپێردرا بیخۆین و نەیگێڕینەوە .

لە ڕیوایەتێکی تردا ئیمام دەربارەی شەریکی گاورو جولەکە دەفەرموێت : (بەچاکی نازانم و پێم باش نییە ، بە مەرجێك نەبێت موسڵمان خۆی هەستێت بە کڕین و فرۆشتنەکە.

( ئەبو بەکر الخلال ) دەفەرمێت:

هەموو ڕیوایەتەکان لە ئیمامی ئەحمەدەوە کۆك و جێگیرن لە سەر کەراهەتی شەریکی و جامبازی (**مضاربة**)ی گاور و جولەکە تەنها بەمەرجێك نەبێ موسوڵمان خۆی هەستێت بە کڕین و فرۆشتن ، هەروەها لە کتێبی (المغني / ابن قدامة)دا [٥] هاتووە دەفەرمێت ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی : ( موسڵمان دەتوانێت شەریکی گاور و جولەکە بکات بە مەرجێك پارەو

---

[٥]- (المغني لابن قدامة) : (٥ / ٣) .

سامانەکەی نەداتە دەستیانەوە ، خۆی هەستێت بە کڕین و فرۆشتن ، چونکە ئەوان سوو ( ڕیبا ) دەخۆن و بەکاری دەهێنن.

وەپێشەوایان (**الحسن**) و (**الثوري**) هەمان بۆچونیان هەیە ، و ئیمامی شافیعی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت) شەریکیان بە هەموو جۆرێك بە مەکروه دەزانێت ، چونکە ڕیوایەت کراوە لە ( ابن عەباس )ەوە ﴿رضي الله عنه﴾ کە فەرموویەتی: (أكرهُ أنْ يشارك المسلم اليهودي ...)[٦].

**پ١٨٠ / پرسیار کراوە لە شێخی ئیسلام ( ابن تيمية ) ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت . کەسێك شتێك لە کەلوپەل وشت وەك ( سلعة ) بە پارەی حەڵاڵی خۆی دەکڕێت ، بەڵام نازانێت سەرچاوەی ئەو کەل و پەلە، حەڵاڵە یان حەرامە ؟ پاشان دەردەکەوێت کەحەرامە ، ئایا تاوانبار دەبێت یان نا ؟**

**لە وەڵامدا دەفەرمێت :** هەر کات کڕیار باوەڕی وابوو کە بە ڕواڵەت کەل و پەلی دەستی فرۆشیار هی خۆیەتی و کڕی ،تاوانبار نابێت با لە حەقیقەتدا فرۆشیار دزیبێتی کە ئەم نایزانێت ، کڕیار هیچ تاوانێکی لە سەر

---

[٦]- بڕوانە : "أحكام أهل الملل" للخلال : لاپەڕە : (١٠٦) .

نـی یـە و لـە دونیـا و قیامەتـدا هـیچ سـزایەکی لـە سـەر نـی یـە ، بـژاردن و قەرەبووکردنەوەی لەسەر ئەو کەسەیە کە فێڵی لێ کردوە و پیّ ی فرۆشتوە ، ئینجا ئەگەر خاوەنی ڕاستەقینەی پەیدا بوو کەلوپەلەکەی بۆ دەگێڕدرێتـەوە و کڕیاریش پارەکەی خۆی وەردەگریّ لە فرۆشیار ، فرۆشیاری ستەم کاریش سـزا دەدرێـت، کـەوابوو هـەر کەسـێك لـە زانایـان لـەم حوکمـەدا جیـاوازی خسـتبێتە نێـوان کەسـێك بزانێـت و شـت بکڕێـت وکەسـێك نـەزانێت ئـەوە پێکاوێتی ، وەهەر کەسێکیش لە زانایان ئەم جیاوازی یەی نەکردبێت ئەوا بە هەڵەدا چووە ، والله أعلم)[٧] .

**پ ١٨١ / پرسیار کرا لە شێخی ئسلام ( ابن تيمية ) . ڕەحمەتی خوای لێبێت . دەربارەی کەسێك شت ومەك دانێت بۆ فرۆشتن و بە زیاد لە نرخی باو (معتاد ) بیفرۆشێت، هەندێ جار کڕیار نرخی ئەو شتە نازانێت ئایا ڕەفتارەکەی دروستە یا نا ؟**

**وەڵام /** لە وەڵامـدا دەفـەرمێت : ئەگـەر هـاتوو کڕیـار نـەزان بـوو بـە نرخی ئەو شتە دروست نی یـە بـۆ فرۆشـیار دەسـتی ببڕێـت و لـە نرخـی بـاو

---

[٧]- بڕوانە : (مجموع الفتاوى) : (٢٩ / ٢٩٣) .

زیاتری لیّ بسێنێت، بەڵکو ( **واجب** )ە لە سەری بە نرخی بازاڕ یان نزیك لەو نرخە پیّ ی بفرۆشێت،وە ئەگەر فیلّی لێکرد و دەستی بڕی و زۆری لیّ سەند ، کڕیار دەتوانێت ئەو مامەڵەیە هەڵوەشێنێتەوە یان بەردەوامی بکات ، لە حەدیسدا ڕیوایەت کراوە (غبن المسترسل ربا)[٨] ، واتە : دەستبڕینی نەزان بە نرخی شت ڕیبایە ، وە سەلمێنراوە لە کتێبە صەحیحەکاندا کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ :

﴿نهى عن تلقي الجلب حتى يهبط به السوق﴾ [٩] ، واتە: نەهی کردووە لە بە پیرەوە چوونی شتی هێنراو تا دادەبەزێتە بازاڕ ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ مافی هەڵبژاردنی داوەتە فرۆشیار کە هاتە بازاڕ بەردەوام بێت لە فرۆشتنەکەی یان پەشیمان بێتەوە ، چونکە فرۆشیار پێش ئەوەی بێتە بازاڕ لەوانەیە نەزان بێت بە نرخی کەلوپەلەکەی بۆیە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەهی کردووە کە کڕیار دەچێتە دەرەوەی شار شت لە فرۆشیار بکڕیت لەبەر ئەوەی فێلّ و خەڵەتاندن و درۆی تێدا دەکرێت و مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ سەلماندووە کاتێك

---

[٨]- ضعفه العلامة الألباني في "سلسلة الأحاديث الضعيفة رقم : (٦٦٨) ، وقال باطل ، وضعفه في : (ضعيف الجامع) رقم : (٣٩٠٨) .

[٩]- (صحيح سنن أبي داود) رقم : (٣٤٣٧) ، و(صحيح الجامع الصغير) رقم : (٦٩٤٥) .

حەقیقەتی بۆ ئاشکرا بوو ، کەوا بوو هەموو کەسێك نەزان بوو بە نرخی شتومەك دروست نی یە فێڵی لێ بکرێت و درۆی لە گەڵدا بکرێت ، وەك کەسێك شتومەك دابنێت و نرخێکی زۆری لەسەر دابنێت کە ئەونرخە باو نەبێت بۆ ئەوەی کڕیار نرخێکی لەوە کەمتری پێ بدات، بەڵکو دەبێت بە نرخی بازاڕ پێی بفرۆشێت ، والله أعلم)[١٠].

**وَآخِرُ دَعْوَانا أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**

**پ ١٨٢/ ئەگەر هاوڕێیەکم هەبوو کارو کاسبیەکەی حیلەو فێڵ بوو لەکاتێکدا منیش هەردەبوو سەردانی بکەم ،بۆنمونە کەسێکی بەڕەحم بوو ئایا تاوانم ناگات نانی بخۆم؟**

وەڵام / ئەگەر خودی ئەو خواردنەی پێشکەشی دەکات بەحەرام بەدەستی هێنا بوو یانماڵەکەی هەموو بەحەرام بەدەست هێنابوو ئەوا دروست نی یە ئەو خواردنە بخۆیت، بەڵام ئەگەر ماڵەکەی تێکەڵ بوو لەحەرام وحەڵاڵ

---

[١٠]- بڕوانە : (مجموع الفتاوى) : (٢٩ / ٣٥٩) .

ئەوكاتە دروستە خواردنی بخۆیت لەسەر ڕای دروست وپەسەند كراوی زانایان) [1].

**پ١٨٣/ أ- خاوەنی كۆمپانیایەك پرسیار دەكات وئەڵێت: كۆمپیانیەكەمان بەنیازە دەزگایەكی ئۆتۆماتیكی سەر بڕین بكڕێت لەبری بەكار هێنانی چەند كەسێك ، چونكە ژمارەی سەربڕاوەكان ئێجگار زۆرن ئایا دروستە؟**

وەڵام/ بەڵێ دروستە دەزگای ئۆتۆماتیكی بكڕن بۆ سەربڕینی ئەو حەیوانانەی گۆشتیان دەخورێت .

**پ ١٨٤/ ب- ئایا ناوی خوا هێنان (بسم الله الله أكبر) تەنها لەكاتی هەڵكردنی دەزگاكە دروستە؟ لەكاتێكا ناوی خوا هێنان بۆ سەر بڕین تەنها یەك جار لەكاتی هەڵكردنی دەزگاكە دەكرێت؟**

وەڵام/ تەنها یەك جار ناوی خوا هێنان (بسم الله الله أكبر) بۆ سەر برین دروستە بۆ كەسێ دەزگاكە هەڵكات كەبیەوێت بەو هەڵكردنەی كۆمەڵێك سەر

---

[1] بڕوانە كتێبی: (فتاوى اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٣٣٣).

ببڕێت بەمەرجێك دەبێ ئەو کەسە موسوڵمان بێت یان ئەهلی کیتاب بێت (گاور یان جولەکە)[٨].

**پ١٨٥/ سیستەمی سەربڕین لەوڵاتی میسر زۆر جار بەو شێوەیەیە (قەسابەکە حەیوانەکان دەنێرێت بۆ کەوڵ گەو شوێنی سەربڕینی ئاژەڵەکان) ئەو قەسابەو ئەوانەی کاروباری کەوڵ گە بەڕێوە دەبەن هەڵدەستن بەسەربڕینی حەیوانەکان وناردنی بەپاك کراوی بۆ قەسابەکانی تر بۆ فرۆشتن، ئێمە نازانین ئەوانەی کەهەڵدەستن بەسەربڕینی ئایا ناوی خوا دێنن (بسم الله ألله أكبر) دەکەن یان نا؟ هەروەها نازانین ئەوانە نوێژ دەکەن یان نوێژ ناکەن؟ یان جوێن بەئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەدەن یان نا؟ ئایا لەسەر من واجبە کوڵیان لێبگرم و هەواڵیان بزانم بۆئەوەی بزانم ناوی خوا دێنن یان نوێژ دەکەن یان واجب نیە ئەوەش دەخەمەوە یادی بەڕێزتان لەم ڕۆژگارە ئەوە زۆر بووە کەسێك نوێژ دەکات بەڵام ئەگەر توڕە بوون زۆری بۆ هێنا کوفر دەکات؟**

---

[٨] بڕوانە کتێبی: (فتاوى اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٤٦٢ - ٤٦٣).

وەڵام/ بنچینەی کارپێکراو بۆ سەربڕاوی موسوڵمان ئەوەیە کەدروستە بخورێت تاکو شتێك جێگیر دەبێت کەحەرامی بکات وەك کافر بوونەوە یان نەهێنانی ناوی خوا (بسم الله الله أكبر) بەئەنقەست هەروەها شتانی وەك ئەمانە[١٠].

---

[١٠] **بڕوانە کتێبی:** (فتاوي اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٣٦٨) .

## پ١٨٦/ حوکمی خواردنەوەی تایگەر چی یە؟

**وەڵام :**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**هەر شتێك خواردنەوەی زۆری مرۆڤ بێ هۆش بکات ئەوا خواردنەوەی کەم و زۆری حەرام دەبێت ، چونکە بێهۆشکەر (خمر) ە ، ئەوەش زانراوە لای هەموو کەسێك (خمر) دروست نییە و قەدەغە کراوە لە شەریعەتی ئیسلامدا ، بەڵگەش ئەوەیە** (ما اسكر كثيره فقليله حرام) **وە (كلُّ مسكر خمر وكل خمر حرام) جا هەر شتێك ئەسڵەکەی پاك بێت وەك گەنم و جۆ و ترێ ...هتد ، وە نەگاتە ترشان (خمر) کە مرۆڤ بێهۆش بکات ئەگەر زۆری لێبخوات ئەوا حەڵاڵە کەوا بوو مەرج ئەوەیە بێهۆش نەکات وە سەرچاوەکەی پاك بێت .**

**ئەوەش بزانە لیژنەی هەمیشەیی بۆ توێژینەوەی زانستیەکان و فەتوادان بە حەڵاڵیان زانیوە بڕوانە فەتوای ژمارە (٦٨٠٥) کتێبی** (فتاوى اللجنة الدائمة)**بەرگی ٢٢ لاپەڕەی ١٤٨ .**

**تێبینی :**

١- هەندێ جار دەنوسرێت ئەندازەی (لە سەدا ٢ تا لەسەدا ٩) مادەی کحولی تیادایە بۆ ئەمەش زانایان لەهەمان فەتوادا ئەڵێن : ئەگەر ئەمەش زۆری لێ بخوێت سەرخۆش بکات ئەوا کەم و زۆری حەرام دەبێت .

٢- بۆ ئەو کەسانەی پرسیاری (تایگر) یان کردووە دەبێت بزانین ئەسڵی چییە پاکە یان نا ئەگەر ئەو مەرجانەی تیادا بوو ئەوە حەڵاڵە.

٣- ئەم حوکمە بۆ هەموو خواردنەوەیەکە کە سەرخۆش نەکات بەهەر ناوێکەوە بێت .

**پ ١٨٧/ باوکم عەرەق زۆر دەخواتەوە و قوماریش دەکات چۆن بتوانم پێی تەرك بکەم ، چونکە زەرەری لەمن زۆرداوە ئێستا کوڕێك هاتۆتە خوازبێنیم نازانێ باوکم بەو شێوەیەیە ئەگەر بزانێ نامخوازێ وە من و دایکم نوێژ دەکەین و فەرمانەکانی خوا جێ بە جێ دەکەین .**

**وەڵام :**

عەرەق خواردنەوە و قورمار کردن دوو تاوانی گەورەن لەتاوانە گەورەکان لە ئیسلامدا وموسڵمانان هەموویان حوکمیان دەزانن ، بەڵام واجب لەسەر تۆ و دایکت ئەوەیە نەسیحەتی باوکت بکەن و دەستی بگرن لەو کارەی و پێویستە هەڵوێستتان هەبێت ، بەڵام بە دانایی یەوە بۆ مەسەلەی خوازبێنی تۆ ئەو

کەسە باشتر وایە بزانێت بۆ ئەوەی تۆ لەتاوان و ترسی تووشبوونت بەتاوانی عەرەق و قومار بپارێزێت وە بەشکو ببێتە دەرگایەك بۆ چاکبوونی باوکت .

**پ١٨٨/ باوکم لاڵەو قوربانیشمان بۆ سەردەبڕێت، ئایا لەبری ئەو ناوی خوا لەسەر قوربانیەکە بێنم؟**

وەڵام/ کەسی لاڵ ناوی خوا لەسەر قوربانی دێنێت بەپێی توانا ومەبەستی لەدڵدا لەگەڵ ئاماژەدا هەر ئەوەندەش بەسە ناشبێت وتەواویش نی‌یە کەسی تر لەبری ئەو ناوی خوا بێنێت[٣].

**پ١٨٩/ ئایا دروستە کەسێك لەشی گران بێت مریشك سەرببڕێت، ئایا دەست لەخەنە گرتن بۆ پیاوان و ئافرەتان دەسنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە؟**

وەڵام :

أ ـ کەسی لەشگران دروستە مریشك وئاژەڵی تر کەگۆشتیان دەخورێت سەرببڕێت وە إن شاء الله هیچی تێدا نی‌یە.

---

[٣] بڕوانە کتێبی: (فتاوى اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٣٧٢).

ب ـ دەستنوێژی کەسێك کەدەستی گرتبێت لەخەنە دروستە پیاو بێت یان ئافرەت(٤).

**پ١٩٠/ ئایا دروستە ئافرەتان حەیوان سەربڕن یان سەربڕاوی ئافرەتان خواردنی دروست نیە؟**

وەڵام/ بنچینەکانی کارپێکراو لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەوەیە کەپیاوان و ئافرەتان هاوبەشن وەك یەك وان مەگەر بەڵگە شتێك تایبەت بکات بەیەکێکیانەوە، سەر بڕینیش لەو حوکمانەیە کەتێیدا هاوبەشن، ئێمە هیچ بەڵگەیەك نازانین هەبێت وەسەربڕین تایبەت بکات بەپیاوانەوە، ئەو بەڵگە گشتیانەش کەبەڵگەن لەسەر دروستێتی سەربڕینی پیاوان و ئافرەتان دەگرێتەوە(٥).

---

(٤) **بڕوانە کتێبی:** (فتاوى اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٣١٥).

(٥) **بڕوانە کتێبی:** (فتاوى اللجنة الدائمة): (٢٢ / ٣٧٥).

**پ ۱۹۱/ كەسێك پرسیار دەكات وئەڵێ: ئێمە لەئەمریكا دەخوێنین، ئایا دروستە بۆئێمە لەو گۆشتەی ئەوان بخۆین كەئەوان لەو وڵاتەدا دەیخۆن؟**

وەڵام/ بۆ موسوڵمان دروستە سەربڕاوی ئەهلی كیتاب بخوات كەبریتین لە گاورو جولەكە ئەگەر سەربڕاوەكە لەوانە بوو كەلە شەریعەتی ئیسلامدا خواردنی بۆ ئێمە حەڵاڵ كراوە وەك: وشتر ومەڕو بزن ومریشك و ئەوانەی بەبەڵگەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلُّ لَّهُمْ﴾ [المائدة: ٥] .

خوای گەورە سەربڕاوی ئەمانی بۆ حەڵاڵ كردووین لەناو خەڵكانی تردا ، چونكە ئەمان سەربڕاو بۆ غەیری خوا بەحەرام دەزانن مەبەستمان بە (**الطعام**) لەم ئایەتەدا بریتییە لە سەربڕاوەكان ، ئەگەر بتوانن نەیخۆن ئەوە باشترە بۆتان پارێزراو ترە بۆ دینەكەتان وەهەر كەس خۆی لەشتی گومان لێكراو بپارێزێ ئەوە ئاین و سومعەتی خۆی پاراستووە، خوای گەورە دەفەرموێت: [وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ] [ الطلاق: ٢-٣] .

بەڵام كەسانی تر جگە لەئەهلی كیتاب وەك ئاگرپەرستەكان و بت پەرستەكان وشیوعیەكان وئەوانەی هیچ ئاینێكیان نییە ئەوە بۆ موسوڵمان دروست نییە

لەسەربڕاوەکانیان بخوات ، چونکە خـوای گـەورە کاتـێ خـواردنی سـەربڕاوی ئەهلی کیتابی بەحەڵاڵ داناوە ئەوە بەڵگەیە جگـە لـەوان کەسـانی تـر لـەکافران لەسەر حوکمی گشتی قەدەغـەو حـەرامێتی دەمێننـەوە. بڕوانـە کتـێبی: (فتـاوي اللجنـة الدائمة): (٢٢ / ٤١١ - ٤١٢) .

**پ ١٩٢/ من قسەم نیە لەگەڵ کەسێکی نزیکی خۆم وەختەتای من نیە ئایا من گوناهبار دەبم یان نا وەچی بکەم باشە؟**

**وەڵام :**

قسەنەکردن لەگەڵ موسڵماندا ئەگەر خزمیش نەبێت تاوانە و پێویستە موسڵمانان پشت لە یەك نەکەن و یەکتر نەتۆرێنن ، بەلاَم ئەگەر کێشەیەك هەبوو یان ڕویدا لە نێوانیانداو بووە هۆی جیابوونەوەو قسەنەکردنیان بەیەکەوە ئەوە تەنها تا سێ ڕۆژ دروستە لەسەر ئەو حاڵە بمێننەوە وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەفەرموێ : (لا يحل للمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاثٍ) دوای ئەم سێ ڕۆژەیە ئەوەیان هەوڵی ئاشتبوونەوەو سەلامکردن لەوی تریان بدات ئەوە پاداشتی هەیە لای خوای گەورە ، بەلاَم ئەگەر درێژەی کێشتا و بەردەوام بوون لەسەری ئەوە دەبێتە تاوانێکی گەورە و لە سوننەتی پێغەمبەری خوا دا صلی الله علیە وسلم زۆر بەگەورە باسکراوە وەك ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ : (من هجر أخاه سنة كان كسفك دمه) صحيح الجامع الصغير . واتە : هەرکەس پشت لە برایەکی هەڵکا و قسەی لەگەڵ نەکات ساڵێك ئەوە وەك ئەوە وایە خوێنی ڕشتبێت .

جا خوای گەورە ڕەحم و بەزەیی خۆی بەستوە بە چاكبوونی نێوانی ئێمەی موسڵمانەوە وەك دەفەرموێ : [إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ] واتە : ئیمانداران برای یەكن جا پێویستە نێوان برایەتی خۆتان چاك بكەن و لە خوا بترسن تا خوای گەورە ڕەحمتان پێ بكات .

## پ ١٩٣/ ئایا درۆی مەصڵەحەت هەیە ؟

**وەڵام :**

موسڵمان ڕاستگۆیە هەمیشە درۆ ناكات بەڵكو هەر تاوانێك بكات نابێت درۆ بكات بەتایبەتی ئەگەر درۆ كردن لەبەر خودی خۆی بێت ، چونكە خوای گەورە فەرمان بە موسڵمانان دەكات بەڕاستگۆیەتی : {وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ} بەڵام ئەگەر درۆ كردن بۆ اصلاح بوو لە نێوان دووكەس دا بوو ڕێگەی پێ دراوە وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەفەرموێ : (ليس الكذّاب الذي يصلح بين الناس فينمي خيراً أو يقول خيراً) متفق عليه . مرۆڤ مەبەستی چاكسازی و اصلاح بێت لە نێوان خەڵكدا و بڵێت فلانەكەس بە باشی تۆی باس كردووە و دوعای خێرت بۆ دەكات ئەوە دروستە با واش نەبێت جا ئەم درۆیە پێی دەوترێت درۆی اصلاح نەك مەصلەحەت بەمانای

ئینسان بۆ مەصلەحەتی خۆی درۆ بکات وەکو خەڵکی نەزان تەفسیری دەکەن .

**پ ١٩٤/ ئایا تا چ ڕادەیەك دروستە پێش مردنی خۆت قوماش بۆ کاتی کفن کردن بکڕی؟**

**وەڵام :**

کفن کڕین پێش مردن هیچ بەڵگەیەك نیە قەدەغەی بکات بۆیە دروستە بەمەرجێك هیچ جۆرە بیروباوەڕێکی لەسەر بنیات نەنرێت واتە تەنها حەلاڵە

**پ ١٩٥/بەڕێزتان ئامارەتان پێداوە کە بۆینباخ دروست نییە بەلاّم لە قوتابخانە بە زۆر پێمان دەبەستن گوناهبار دەبین؟**

**وەڵام :**

بۆینباخ لە مل کردن کاری موسڵمان نیە ئامۆژگاری هەموو لایەك دەکەم بەکاری نەهێنن ، ئەنجا شتێکی بێ سوودە ، بەلاّم ئەگەر بە زۆر بە خوێندکارەکان کرا لەوانەیە تاوانبار نەبن هەرچەندە وا چاکترە نەیبەستن و داوا لە مامۆستایان و لێپرسراوانی پەروەردە بکەن ئەو شتەیە هەڵگرن لەسەر خوێندکاران .

**پ ١٩٦/ســلاّوی خــوای گــەورەتان لــێ بێــت بــەڕێزان مــن پرسـیارەکەم ئەمەیـە : ئایـا هـیچ دوعایـەك هەیـە بـۆ منـداڵ بـوون وە کامەیە و چۆن دەکرێت؟ خوا جەزاتان بداتەوە .**

**وەڵام :**

**دوعـای تایبـەت بـۆ منـداڵ بـوون تـا ئێسـتا هـیچ دوعایـەکم نـەبینیوە کـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هانمان بدات بۆ کردنی ، بـەڵام دروسـتە هەر دوعایەکی بە زبانی خۆت و بەوەی کە خۆت پێـی دڵخـۆش بیـت بیکـەیت ئەگـەر هـەر دەتـەوێت چـاو لـە پێغەمبـەران و پێشـینانی خـۆت بکـەیت کـە چاکتریش ئەمەیانـە ئـەوە دوعاکـەی (زکریـا) بکـە لـە سـورەتی ال عمـران دا دەفەرموێ :** { رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ} (٣٨) سورة آل عمران

**واتە : پەروەردگار نەوەی چـاك و پـاكم پـێ ببەخشـە بەڕاسـتی تـۆ بیسـەری دوعاو نزایت .**

**وە لە سـورەتی** الأنبياء **دەفـەرموێ :** { رَبِّ لاَ تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ } (٨٩) سورة الأنبياء

واتـه : پـەروەردگار مـن بەتـەنها مەهێڵـەرەوە (نەوەیـەکی چـاك و پـاکم پـێ ببەخشـه) تـۆش چـاکترین زاتێکـی لـه پـاش مـن و هـەموو مردووەیـەك دەمێنیتەوە .

**پ ۱۹۷/ ئـەو خاڵانـەی کـە لەسـەر لـەشمان بەنـەزانی کـوتراوە سوتاندنی دروستە؟**

**وەڵام :**

خاڵ مەعلومە کـە حەرامـە وە پێویسـتە موسـوڵمان خۆیانیـان لـێ بپـارێزن ، بەڵام ئەگەر بە نەزانی بێـت ئـەوە تـاوان نیـە و لادانـی کـارێکی چـاکە ئەگـەر بتوانرێـت ئەگـەر نـەتوانرا ئـەوە واجـب نیـە ، بـەڵام بـە سـوتاندنی یـان نەشتەرگەری ئەگەر زیانی نەبێت دروستە إن شاء الله .

**پ ۱۹۸/ مامۆسـتای بـەڕێز ئـەکرێت پـارە قـەرز بکـەم بـۆ حـەج پاشـان قەرزەکـە بدەمـەوە والحمـد لله کـریێ وەردەگـرم هـەموو مـانگێگ توانای قەرزدانەوەم هەیە. زۆر سوپاس خوا لێتان ڕازی بێت .**

**وەڵام :**

حەج کردن چەندین مەرجی هەیە لەوانە موسڵمانێتی ، پێگەشتن (بلوغ) ژیری ، ئازادی ، توانا . هەرکەس ئەم مەرجانەی تیادا نەهاتبێتە دی حەجکردنی لەسەر واجب نەبووە . بۆ مەرجی توانا بوون ئەبێت کەسی ناوبراو لەش ساغ بێت وە ڕێگەی ڕۆشتنەکەی ئاسایش بێت لە نەفس وماڵی نەترسێ وە خۆراك و وەسیلەی ڕۆشتنی هەبێت ئەگەر لە مەککەوە دوور بوو بۆ ئەم مەبەستانە ئەگەر قەرزار بوو ئەوە حەجی لەسەر واجب نیە بەلاَم ئایا دروستە قەرز بکات و بچێت؟ بۆ ئەم مەسەلەیە ئەگەر توانای قەرزدانەوەی هەبێت دروستە ، بەلاَم چاکتر (أفضل) ئەوەیە نەیکات چونکە دانەوەی قەرز لە پێشترە تاوەکو حەجکردن ، و ئەگەر توانای دانەوەی نەبێت یان دوای بخات ئەوە نابێ بیکات .

## پ ١٩٩/ ئایا ناوی شاخ و کێو بۆ منداڵ دروستە ؟

**وەڵام :**

ناولێنان لە منداڵەکان بەناوی چاك و مانادار و حەلاَڵ واجبی باوك و دایکانە و مافی منداڵەکانمانە بەسەرمانەوە ، بۆیە پێویستە ناوی باشیان بۆ هەڵبژێرین و ناونانیان بە شاخ و کێو ئەگەر ماناکەی خراپ نەبوو دروستە و هیچ ڕێگرێك نیە .

**پ ٢٠٠/ قورئان کەدابنرێ لەماڵدا نەخوێنرێ حوکمی چیە؟ چونکە لاپەڕەکانی کۆنە .**

**وەڵام :**

موسڵمان پێویستە هەمیشە قورئان بخوێنێ و گرنگی زۆر بە قورئان و تەفسیر و ئەحکامەکانی بدات ، چونکە قورئان بەرنامەی ژیانی مرۆڤی تێدایە و خەیرێکی گەورەش لەخوێندنەوەکەیدا هەیە هەموو پیتێك دە چاکە بۆ ئینسان دەنوسرێت کە هیچ قسە و گوفتارێك ئەم پاداشتەی تیادا نیە ، بەڵام ئەگەر قورئان هەر نوسخەیەکی کۆن بوو یان دڕاو نەتوانرا کەڵکی لێ وەربگیرێت وا چاکترە بە ئەدەبەوە بسوتێنرێت بە مەبەستی ئەوەی نەکەوێتە ژێر دەست و پێ و بەکەم دانەنرێت ، زانایان بۆ ئەم مەسەلانە کاری ئیمامی عوسمان دەکەنە بەڵگە کاتێ قورئانی کۆکردەوە وە باقی نوسخەکانی تری سوتاند .

**پ ٢٠١/ کاتێـك قورئـان دەخوێنیـت لـە ئایەتێکـدا سـوجدەی تێدایە ئایا چ زیکرێك لە سوجدەکەدا بخوێنی؟**

**وەڵام :**

**سوژدەی قورئان خوێنـدن دەتوانیـت هـەر پاڕانەوەیـەك بخوێنیـت کـە خـۆت حـەزت لێیـەتی و دەیزانـی ئەگـەر ئەوفەرمووودەیەشـت زانیـی کـە عائیشـە ڕیوایەتی کردووە ئەوە باشترە کە ئـەڵێ :** (كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول في سجود القرآن : سجد وجهي للذي خلقه وشق سمعه وبصره بحوله وقوته فتبارك الله أحسن الخالقين) رواه الخمسة إلا ابن ماجه وزيادة (فتبارك الله أحسن الخالقين) رواه الحاكم . **هەنـدێ لـە زانایـان وتوویانـە وا چـاکترە** (سبحان ربي الأعلى) **بخوێنرێت**

**پ ٢٠٢/ ئایا لەبەرکردنی پانتۆڵ حەرامە ؟**

**وەڵام :**

**پانتۆڵ جلوبەرگی موسڵمانان نییـە و چـەندین خراپـەی تیادایـە وەك ئـەوەی گۆڕینـەوەی جلوبـەرگی شـەرعی بـەو جلـە و دەرخسـتنی لـەش و لاری ئـەو کەسانەی لەبەری دەکەن ئەم حوکمە بۆ پیاو ئەوەندە هەیە ئەگەر پان و پۆڕ بێـت هەنـدێ لـە زانایـانی ئـەم سـەردەمە فـەتوای دروسـتیان داوە ، بـەڵام**

ئامۆژگاریم ئەوە یە ئەگەر پێویست نەبێت لەبەر نەکرێت ، بەلاَم بۆ ژنان دروست نیە بە هیچ شێوەیك چونکە لاسایی کردنەوەی پیاوانی تیادایە و زیاتر جوانی ئافرەتان دەردەخات وە دەبێتە هۆکاری فیتنە و بیٚ ڕەوشتی و نەهێشتنی شەرم و حیشمەتی ئافرەتانی موسڵمانان ، بۆیە پێویستە ڕێگە نەدرێت بە ئافرەتان کەمتەرخەمی تیادا بکەن .

## پ ٢٠٣/ ئایا لە چ کاتێکدا دوعاکردن لەشەودا گیرا دەبێت؟

**وەڵام :**

پاڕانەوە و داواکردن لە هەمووکاتێکدا چاکە و لای خوای گەورە پیرۆزە و بە عیبادەت حیساب دەکرێت ، بەلاَم یەکێك لەو کاتانەی دوعای تیادا قەبولٚ دەکرێت وەك هۆکارێك بریتی یە لە سیٚ یەکی کۆتایی شەو واتە لە مەغریبەوە تاوەکو فەجر بەشەو حیساب دەکرێت ، ئەگەر ئەم کاتە بکەی بە سیٚ بەشەوە بەشی کۆتایی کاتێکی چاکە بۆ وەرگرتنی داواکارییەکان چونکە بە دەقی فەرموودە ئەوکاتەخوای گەورە دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و بانگ لە بەندەکانی دەکات کە چیان پێویستە بیان داتیٚ یان کیٚ تەوبە دەکات با وەرگرێت لێیان ... بەهەر حالٚ ئەو کاتە کاتێکی پیرۆزە بۆ ئەوەی موسڵمان داواکانی لە خوای گەورە داوا بکات .

**پ ٢٠٤/ من زۆر ئەترسم بەتایبەت شەوان هەموو کات ترسی مردنم هەیە و هەمیشە قەبر لە پێش چاومدا یە تکایە یارمەتیم بدەن**

**وەڵام :**

ترسان لە خوا یان لەمردن و سزای گۆڕ شتێکی باشە پێویستە موسوڵمان هەمیشە ئەم ترسەی هەبێت بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی کردەوەی چاك بكات و سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورە نەکات ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەمیشە دەیفەرموو (أكثروا ذكر هاذم اللذات) واتە زۆر یادی ڕوخێنەری ئارەزووەکان بکەن ، قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەم ڕاستی یە دەسەلمێنێت ، بەلاَم ئەوەندە هەیە پێویستە موسوڵمان زیادەڕەوی و کەم ڕەوی لەم مەسەلەیە دا نەکات ئەوەندە ڕۆنەچێت تا هیوای بە میهرەبانی خوا نەمێنێت وە ئەوەندەش بێ ئاگا نەبێت سەرپێچی خوا بکات ، جاری واش هەیە شەیتانەکان ختورەی خراپ دەخەنە ناو دڵی ئادەمیزادەوە و بێ هیوای دەکەن ، پێویستە موسڵمان ئاگادار بێت ئەو ترسە لەخوا و قەبرو سزا ترسێکی ئاسایی یە یان شەیتان ئەوەی دروستکردووە بۆ مەبەستی بێ هیواکردن و قورسکردنی موسڵمانێتی ئەو کەسەیە بۆیە پێویستە موسڵمان وریا بێت ئەگەر ئەم جۆرە

بـوو ئـەوا پێویسـتە موسـڵمان بەقسـەی شـەیتان نـەکات وە لـەم حاڵەتـەدا پێویسـتە ئـەو ئایـەت و فەرموودانـە بخوێنێتـەوە کـە باسـی بەخشـین و لێبوردەیی و ڕەحمی خوای گەورە دەکەن . والله أعلم .

**پ ٢٠٥/ئایە بانگدان بە کۆمپیوتەر لە مزگەوتەکاندا جائیزە ؟؟؟ کە مەبەست لێی یەکخستنی بانگەکانی ناوشار و نەهێشتنی بیدعەیە ,چونکە جاران کێشـەی ئـەوەمان هـەبوو کـە شـکات دەکرا لـە هەندێ مزگەوت کە فاتیحانادات لە دوای بانگ یـان صـەلاوات نادەن . خـوای گەورە پاداشتان بداتەوە**

**وەڵام :**

**بانگدان عیبادەتێکی بـەرز و بـەڕێزە و چـەندین فـەرمودە هـاتوون لـە باسـی فەزڵ و چاکە و گەورەیی ئەو عیبادەتە وەك حەدیسی أبو هریـرە کـە ئـەڵێ :**

"أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال : لو يعلم الناس ما في الاذان والصف الأول ثم لم يجدوا إلا أن يستهموا عليه لاستهموا ولو يعلمون ما في التهجيد لاستبقوا إليه ولو يعلمون مافي العتمة والصبح لاتوهما ولو حبواً" رواه البخاري .

**واتـە : ئەگـەر خـەڵکی بیانزانیایـە کـە بـانگ و ڕیـزی یەکـەمی نوێـژ چـەند پاراستنی تیایە ئەنجا چار نەبوایە بۆ دەستکەوتنی ئەو خێرە تەنها بە پشـك**

خستن (قرعه) نەبێت ئەوە دەیانکرد ، و ئەگەر بیانزانیایە زوو ڕۆشتن بۆ نوێژی نیوەڕۆ چەند خێر و پاداشتی تیایە ئەوە پێشبڕکێیان دەکرد وە ئەگەر بیانزانیایە نوێژی عیشا و بەیانی چەندێك پاداشتیان هەیە ئەوە بە گاگۆڵکێ بۆیان دەڕۆشتن ، جا دانانی بانگ بەو ئامێرانە دەبێتە هۆکاری لەناودانی ئەو پاداشتەی دانراوە بۆ موسڵمانان کە ئەو حەدیسانە هانیان دەدات بۆی ئەنجا بانگ دانی هەموو موسڵمانان لەیەك کاتدا شتێکی واجب و پێویست نییە ، کە ئەگەر نەکرا موسوڵمان پێی تاوانباربن ، بەڵکو مەسەلەکە فراوانە و ئەوەندەش قورس نییە لەسەر موسڵمانان لەوانەش هۆکار بۆ ئەم بیرۆکەیە ئەو خشتانەبن کە کاتی نوێژەکانیان تیادا نووسراوە کە زۆربەیان وە زۆر کاتیشیان بۆ نوێژەکان هەڵەیە ، ئەنجا پێشەوایانی مزگەوتەکان دەتوانن بانگ دوابخەن بەمەرجێ موخالەفەی سوننەتی تیادا نەبێت وە لە بەر بەرژەوەندییەکی شەرعی بێت وەك ئەوەی لە ماڵی خوادا لەڕەمەزاندا نیوۆژی عیشا دوو سەعات دوای مەغریب بانگی بۆ دەدرێت .

پ٢٠٦+٢٠٧/ من وەکو خوێندکاریکی کۆلێجی پزیشکی دوو پرسیارم هەیە .

أ-ئایا تشریح(شیتەڵ) کردنی جەنازە بۆ مەبەستی پزیشکی( **طبی** ) حەرامە یان نا ؟ لە کاتێکدا تۆ بۆ بواری زانست بەکاری دێنیت, ئەگەر نا ئەوە لەوانەیە شوێنی ئەندامەکان نەناسیتەوە لەکاتی نەشتەرگەری )عملیاتدا؟ وە لە داهاتودا سستت و کەمتەرخەم و کەم زان دەبیت لە کارەکەتدا.

ب-وە بوونی چەند دەرسێکمان لە خەستەخانە ، ئەمە وادەکات (عەورەتی) پیاو یان (ئافرەت) ببینین لەکاتی فحص دا ئایا هیچی تێدایە؟ حەرامە یان نە؟ تکایە بە بەڵگەوە وەڵامم بدەنەوە.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

أ/ زانستی شیکاری (علم التشریح) بەردی بناغەیە بۆ زانیاریو زیرەکی پزیشك وەڕێگەی بەدەست هێنانی ئەو زانیاریانەیە بە عەمەلی یان بیر و بە قسە ، و پزیشك ناتوانێ پێویستی بە بەشی کردەیی (عملی) نەبێت لە کاتێکدا (شیتەڵکاری) بناغەیەکی گرنگە بۆ دیاری کردن و دۆزینەوەی نەخۆشییەکان وە پێویست و بەسوودە بۆ دۆزینەوەی هۆکاری مردن کە

بەهۆی دەست درێژییەوە بووە یان نا یان بۆ گواستنەوەو جێگۆڕکێی ئەندامەکانی مرۆڤ ئەصل و پشت پێ بەستراوە .

جا کاری شیتەڵکاری سێ هۆکاری سەرەکی هەیە :

یەکەم : شیتەڵکردنی جەستەی مردوو بۆ دۆزینەوەی جۆری تاوان و تاوانباران .

دووەم : شیتەڵکردنی بۆ دۆزینەوەی جۆری نەخۆشیەکە .

سێیەم : شیتەڵکردنی بۆ فێربوون و فێرکردن .

حوکمی یەکەم : هەرکاتێ تاوانەکە یان تاوانبار نادیار و نەزانراو بوو ئەوە بۆ پاراستنی حوکمی شەرعی لەبەر نەچوونی بەهەڵەدا وە بۆ پاراستنی مافی مردووەکە کە پاش خۆی بۆ میراتگرانی دەمێنێتەوە وە بۆ چەندین هۆکاری شەرعی تر ئەوە حوکمی ئەم بەشەیە دروست و حەڵاڵ دەردەچێ وە ئەمەش بەڵگەی ئەم ڕێسایانەی کە شەرعزانان وتویانە :

(ارتكاب أخف الضررين) (الضرورات تبيح المحظورات) .

ئەمەش بە چەند مەرجێك :

١ : بۆ ئەو تاوانەی کە کەسەکە پێی مردووە کەسێك تۆمەتبار کرابێت .

٢- شیتەڵکارییەکە بگاتە ئەنجام بۆ دۆزینەوەی تاوانبارەکە .

٣- پێویستی بوون بە شیتەڵکردن بۆ نموونە ئەگەر بەڵگەی تر نەبوو بۆ دۆزینەوەی تاوانباران تەنها ئەم ڕێگایە نەبێت .

٤- پێویستە ئەو پزیشکەی ئەم کارە دەکات کارامە و لێزان بێت .

٥- ئەو کەسەی شیتەڵی بۆ دەکرێت دەبێ مردبێ .

٦- مۆڵەت لە لایەن دادوەرەوە .

حوکمی دووەم : واتە بۆ دۆزینەوەی نەخۆشییەکان

دەستەی گەورە زانایانی وڵاتی سعودیە بڕیارێکیان دەرکردووە بۆ ئەم سێ بەشەی کە لەپێشەوە باسمانکرد لەبەرواری ١٣٩٦/٨/٢٠ کۆچی ژمارە (٤٧) کە ئەمە کورتەکەیەتی : (يجوز تشريح جثة الآدمي لاجل التحقيق من دعوى جنائية أو أمراض وبائية لما في ذلك من المصالح الكثيرة ويكتفى بشتريح جثث أموات غير معصومين لاجل التعلم والتعليم حفظاً لكرامة المسلم الميت).

کەوابوو حوکمی سێیەم : بۆ فێربوون و فێرکردن نەکرێت باشترە وەك لە فەتوای ئەو گەورە زانایانە دەردەکەوێت .

**ب/ سەبارەت بە پرسیاری دووەم** : بینینی عەورەت بۆ کاری پزیشکی تەنها بۆ کاتێکە ئەگەر پێویست بێت ئەگینا نابێ بەتایبەت لە پیاوە بۆ ئافرەتان یان بە پێچەوانەوە پێویستە بۆ ئافرەت پزیشکی ئافرەت هەبێت وە بۆ پیاوانیش پزیشکی پیاو هەبێت لەبەر پاراستنی دین و ڕەوشتی کەسەکان ، ئەگەر نەبوو ئەوکاتە دروستە لەگەڵ ئەم مەرجانە :

یەکەم : بینین و تەماشاکردن دەبێ (محرم) هەبێت یان ئافرەتێکی متمانە پێکراو هەبێت لەبەر ترسی خەڵوەت بوون کە لە شەرعدا نەهی لێکراوە .

**دووەم : نابێ ئەو پزیشکە تەماشای هیچ شوێنێکی تر بکات تەنها دەم و چاو هەردوو دەستەکانی نەبێت وە تەنها ئەو جێگایەی کە پێویستە چارەسەر بکرێت وە پێویستە لەسەر پزیشکەکان جەستەی ئەو نەخۆشە داپۆشن تەنها شوێنی مەبەست نەبێت .**

**سێ یەم : ئەگەر پزیشك توانی تەنها بە تەماشا کردن چارەسەر بکات ئەوە بە دەست دروست نییە ، و پێویستە لە خوا بترسێت و چاو و دەستی لە حەرام بپارێزێت .**

چوارەم : پێویستە لەسەر ئافرەتان ئەگەر پێویستیان بە چارەسەر بوو ئەوە ئەگەر پزیشکی ئافرەت نەبوو پزیشکی موسوڵمانی متمانە پێکراو هەڵبژێرن .

**پ٢٠٨/ من وا گوێ بیست بومە کە تەنیا خەتمی قورئان بۆ دایك و باوك و داپیر و باپیر دروستە ، ئایا ئەمە ڕاستە تکایە زۆرترین ڕوونکردنەوە.**

**وەڵام :**

**بۆ دایك و باوك و داپیر و باپیر هەر کردەوەیەکی چاك بکرێت لە کوڕ و کچەوە دروستە و کارێکی شەرعی یەو بەشی ئەوانیشی تێدایە خوای گەورە دەفەرموێ :** {وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ } سورة الطور(٢١) .

**واتە : ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە و نـەوەکانیانیش بـە ئیمانـەوە شـوێنیان کـەوتوون ئەوانـە لـە بەهەشـتدا پێـك شـاد دەکەینـەوە لـە کردەوەکانیـان سوودمەندیان دەکەین وە نەبێت لە کردەوەی نەوەکان هیچ کەم بکەینەوە. زانایان ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کردەوەکانی نەوەکان باوکان و دایکان پێـی سـودمەند دەبـن وەڵامـیش بـۆ ئایەتی :** {وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى} سورة النجم(٣٩) **.زانایـان وتویانـە :کوڕ و کچ ونەوەکان لە کۆشش و هەوڵی مرۆڤن و جودا نین .**

بـەڵام خـەتمی قورئـان بـۆ دایـك و بـاوك وەکـو کردەوەیـەکی سـەربەخۆ و پێشکەش کردنی بەدایك و باوك نـەم بیسـتوە سـەلەف کردبێتیـان وا باشـترە ئێمە شوێنی ئەوان بکەوین ابـن مسـعود دەفـەرموێ : (عليكم بالعتيق اتبعوا ولا تتبعوا فقد كفيتم) .

**پ ٢٠٩/مەرجەکانی قـەبوڵ بـوونی دوعـا چـی یـە؟ ئەگـەر داوای شتێك لەخوا بکەم قەبوڵ دەبێت؟**

**وەڵام :**

گومان لەوەدا نییە کە خوای گەورە وەعدی داوە وەڵامی ئەو کەسانە بداتەوە کـە داوای لـێ دەکـەن وەك دەفـەرموێ : { ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ} (٦٠) سورة غافر

یان سەلمانی فارسی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : "إن الله حَيِيّ كريم يستحي من عبده إذا رفع يديه اليه أن يردّهما صِفراً" رواه أبوداود والترمذي .

واتە : خوای گەرەو خاوەنی شەرمە و بەڕێزە شەرم دەكات ئەگەر بەندەیەك دەستی پاڕانەوەی بۆ لا بەرز بكاتەوە و بەبەتاڵی بگێڕێتەوە . بەڵام خۆ نەبێ هەموو پاڕانەوەیەك وەربگیرێت ، كەوا بوو پێویستە ئەوە بزانیت ئەم مەسەلەیە چەندین مەرج و ڕێگری هەیە ، ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ : جاری وا هەیە پاڕانەوە قەبوڵ ناكرێت و دوا دەكەوێت یان بە هۆی لاوازی خودی پاڕانەوەكە ، بۆ نموونە پاڕانەوەیەك بێت دژایەتی و دوژمنكاری كەسی تری تیادا بێت یان بە هۆی لاوازی دڵی ئەو كەسەی پاڕانەوەكە دەكات...ز یان بە هۆی ڕێگرێك وەك خواردنی حەرام و تاوان و دڵ ڕەشبوونەوە وەبێ ئاگابوون لە خوای گەورە و حەز و ئارەزوو زاڵبن بەسەریدا ، لەو بەڵگانەی لەم مەسەلەدا هاتوون :

١- فەرموودەی أبو هريره لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم : "أدعوا الله وأنتم موقنون بالإجابة واعلموا أن الله لا يقبل دعاءً من قلب لاه"رواه الترمذي برقم ٣٤٧٩ و حسنه الألباني في صحيح الجامع رقم ٢٤٥ .

واتە : داوا لە خوای گەورە بکەن و دڵنیاش بن بەوەی کە خوای گەورە وەڵامتان دەداتەوە وە ئەوەش بزانن خوای گەورە پاڕانەوەی کەسێك وەرناگرێت بەدڵێکی بێ ئاگاوە بیکات .

٢- فەرموودەی أبو هريره لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم کە فەرموویەتی : "....ثم ذكر الرجل يطيل السفر أشعث أغبر يمدُّ يديه إلى السماء يارب يارب ومطعمهُ حرام و مشربه حرام وملبسه حرام وغذي بالحرام فأنى يستجاب لذلك" رواه مسلم .

واتە : دەستەکانی بەرزدەکاتەوە بۆ ئاسمان دەڵێ ئەی خوایە ئەی خوایە لە کاتێکدا خواردنەکەی حەرامە و خواردنەوەکەی حەرامە و جلوبەرگی حەرامە و بە حەرام گۆش کراوە ئەی چۆن وەڵام ئەدرێتەوە و پاڕانەوەکەی قەبوڵ دەکرێت .

٣- فەرموودەی أبو هريره ئەڵێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : "يستجاب لأحدكم مالم يعجل يقول دعوتُ فلم يستجب لي" رواه البخاري ومسلم .

واتە : هەرکامتان داوا لە خوای گەورە بکەن وەڵام دەدرێنەوە بەمەرجێ پەلە نەکات و بڵێت داوام لە خوا کردو وەڵامی پاڕانەوەکەم نەدرایەوە .

٤- فەرموودەی أبو هريرە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم : "لا يزال يستجاب للعبد مالم يدعُ باثم أو قطيعة رحم...." الحديث رواه مسلم .

واتە : بەردەوام وەڵامی بەندە دەدرێتەوە بەمەرجێ داوای تاوان و پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی نەکات .

ئەمە و چەندین مەرج و ئادابی زۆر هەن ئەمانە دیارترینیان بوون .

**پ ٢١٠/ ئەمەوێت بزانم بۆ دوعاکانم قبوڵ نابێت زۆر بەڕاستی ئەیکەم بە هە موو شەرت وشروتەکانیشیەوە ئەیکەم**

**وەڵام :**

دوعا کردن ئەگەر مەرجەکانی تەواو بێت قەبوڵ دەبێت ئەگەر ئەوەی دەتەوێ یان شتێکی وەك ئەوە یان پاداشت لە ڕۆژی قیامەت بەهەر حاڵ هیچ دوعایەك لای خوای گەورە بە فیڕۆ ناچێت ، وە خوای گەورە دانا و لێزانە کە چی دەکات بۆ بەندەکانی ئەوەش هەیە یەکێك لە هۆکارەکانی قەبوڵ نەکردنی دوعا ئەوەیە بڵێت دوعام کرد و قەبوڵ نەکرا بە دەقی فەرموودەی صحیح کە لە (سنن) دا هاتووە .

**پ٢١١/ ئایا لەسەر قەبران مردوو ئاگای لێیە کە قورئانی بۆ ئەخوێنن؟**

**وەڵام :**

قورئان خوێندن لەسەر قەبران کارێکی خراپە و هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە کە هیچ کەس لە هاوەڵان و پێشەوایان کردبێتیان سەرەڕای ئەوەی بەڵگەش نەهاتووە کەوابوو بیدعەیە و دەبێ موسوڵمان خۆی لێ بپارێزێ ، بۆ مەسەلەی ئایا مردووەکان ئاگایان لێیەتی ؟ نەخێر مرۆڤ کە مرد لەم دونیایە پەیوەندی دەپچڕێ بەڵگەش بۆ نەبیستنیان ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ : { وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ} (٢٢) سورة فاطر

واتە : تۆ ناتوانیت دەنگی خۆت بگەیەنی بە مردووکان ئەمە ئەگەر بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وا بێت بێ گومان بۆ کەسانی تر وەك خوێنەرانی سەر گۆڕستانەکان ناتوانن بیگەیەنن کە زۆربەیان ئەو خوێندنەیان بۆ پارە و پول و سامانی دونیایە خوا پەنامان بدات .

**پ٢١٢/ ئایا مامۆستا گیان ئەگەر کەسێك پارە یان هەرشتێك بدۆزێتـەوەو دەسـتکاری نـەکات و هـەر داینـاوە ئـەوا چـی لـیٚ بکـات باشە؟**

**وەڵام :**

دۆزینەوەی شت و مەك ئەمانەتە لە گەردنی ئەو کەسەی دەیدۆزێتـەوە دەبـیٚ هەوڵ بـدات بـۆ دۆزینـەوەی خاوەنەکـەی بەڕاگەیانـدنی دۆزینـەوەی ، ئەگـەر خاوەنەکەی پەیدا بـوو ئـەوا چاکەو وە دەیباتـەوە ئەگـەر نـەبوو دەبـیٚ ئـەو دۆزراوەیە تا ساڵێك بپارێزێت پاشان بیکات بە خێر بۆ خاوەنەکـەی یـان چـی لـیٚ دەکـەیت بیکـە ، بـەڵام کـە خاوەنەکـەی هاتـەوە وداوای کـرد دەبـیٚ بیدەیتەوە ، زانایان پێکهاتوون لەسەر هەڵگرتنی دۆزراوە کـە دروسـتە بـەڵام ئایـا سـوننەتە یـان پێویسـتە؟ جـا ئەگـەر ئـەو کەسـەی پـارە یـان شـت دەدۆزێتەوە ئەگەر ناپاك (فاسق) بوو ئەوە قەدەغە دەکریٚ لە هەڵگرتنـەوەی ئـەو شـتانە و ئەگـەر هـەڵیگرت لێـی وەردەگیرێتـەوە بـەڵام ئەگـەر لـە خـۆی دڵنیابوو کە خیانەتی لیٚ ناکات ئەوە قەیدی ناکات هەڵیبگرێتەوە .

**پ ٢١٣/ سەرەتا دەست خۆشیتان لیٚ دەکەم بۆ ئەو سایتە جوانە خوا پاداشتتان بداتەوە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانمان : پرسیارێکم هەیە : من وەك کچێك چ دوعایەك بکەم بە شێوەیەکی دینی بۆ ئەوەی شوو بکەم؟**

**وەڵام :**

ئێمەش زۆرسوپاسی جەنابت ئەکەین بۆ تەماشاکردن و خوێندنەوەی بابەتەکانی سایتی بەهەشت و هیوام وایە سودی هەبوبێت بۆ خزمەتکردنی موسوڵمانان ، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەی بەڕێزت تا ئەم کاتە من هیچ دوعایەکی تایبەت نازانم یان بیرم ناکەوێتەوە بۆ ژن مارەکردن یان شوکردن ، بەڵام دروستە ئەو دوعایە بکەیت بەهەر دوعایەکی گشتی بەهەر زمانێك کە خۆت دەیزانیت وە هەرکەس داواش لە خوا بکات خوای گەورە کارەکانی بۆ ئاسان دەکات ، و موسڵمانی ڕاستەقینە هەموو شتەکانی تەنها لە خوا داوا دەکات وەك سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەر ئەوە ڕامان دەهێنێت (إذا سألت فاسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله) وە ئەگەر نیازت هەبوو بۆ هەر شتێك یان داوای هەر چاکەیەك نوێژی (إستخارە)ی بۆ بکە و پشت بە خوای گەورە ببەستە و ڕاوێژ بەکەسی لە خۆت شارەزا ترو

ئەزموندار تر بکە هەر کەس استخارە بکات تووشی زیان نـابیٚ وە هـەر کـەس ڕاویٚژ بکات پەشیمان نابیٚ .

**پ ٢١٤/ (اللهم صلی علی محمد وعلی آله محمد بعدد ما في علم الله الصلاة دائمه بدوام ملك الله) ماموٚستا ئایا ئەمە جائیزە؟**

سـلاٚوات دان لەسـەر پیٚغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) لـه سـوننەتی پیٚغەمبـەردا بـەم شـیٚوەیە هـاتووە (اللهم صَلِّ علی محمد وعلی آل محمد كما صلّيت علی ابراهيم وعلی آل ابراهيم إنك حميد مجيد اللهم بارك علی محمد وعلی آل محمد كما باركت علی ابراهيم وعلی آل ابراهيم إنك حميد مجيد) رواه البخاري مع الفتح ٦/٤٠٨

ئەمەش دوای ئەوە بوو هاوەڵاٚن خوایان لیٚ ڕازی بـیٚ داوایـان لـە پیٚغەمبـەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرد کە چوٚنیٚتی سەلاٚوات دانیان فیٚربکـات ئـەویش ئەمـەی فیٚرکـردن ئـەوەش بزانـە پیٚغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی : (خیر الهدی هدی محمد) باشـترین ڕیٚنمـایی و ڕیٚبـاز ڕیٚنمـایی و ڕیٚگەی (محمد)ە (صـلی الله علیـه وسـلم) جـا پیٚویسـتە ئیٚمـە هـەر کـەس لـە خوٚمانەوە شتیٚك زیاد نەکەین لە عیبادەت و پەرستشەکانماندا .

**پ ٢١٥/ ئەگەر کەسێك لە ئاودەست بێت و سەلامی لێ بکرێ دەتوانێ لە دڵی خۆیدا جوابی سەلام بداتەوە؟ یان ئەگەر گوێی لە بانگ بوو ئەتوانێ وەڵامی بانگەکە بداتەوە؟**

**وەڵام :**

سەلامکردن و گەیشتن بەیەك چەندین ئادابی جوانی هەیە موسوڵمانان پێویستە بۆ ئەو مەبەستە ڕەچاوی ئادابەکانی سەلامکردن بکەن ، یەکێك لەوانە لەکاتی ئاودەستبوندا سەلام نەکەن چونکە بە (اتفاق)ی زانایان ئەو کەسەی سەلام دەکات مافی وەڵام دانەوەی نی یە بەڵکو وتویانە : (مەکروهە) سەلام بکات لە کەسێك لەسەر ئاودەست بێت بەبەڵگەی فەرموودەی (جابر) ی کوڕی (عبدالله) ئەڵێ : کابرایەك بە لای پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم تێپەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم میزی دەکرد ئەو کابرایە سەلامی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی وت : ئەگەر منت بینی بەم شێوەیە سەلامم لێ مەکە ئەگەر سەلام بکەیت وەڵامت نادەمەوە. رواه ابن ماجة برقم ٣٥٣ وقال الألباني صحيح بڕوانە الصحيحة ١٩٧ .

وە حەدیسی (ابن عمر) ئەڵێ : کابرایەك سەلامی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم میزی دەکرد

وەلاّمی سەلامەکەی نەدایەوە : (أن رجلاً سلّم على النبي وهو يبول فلم يرد عليه) رواه مسلم وأبوداود والترمذي وابن ماجه والنسائي .

وە ئەدەب وایە لەکاتی لەسەر ئاودەستبوندا زمانی خۆی بگرێت لە هەموو قسەکردنێك زیکر بێت یان هەر قسەیەکی ئاسایی وەلاّمی سەلامی کەس نەداتەوە وەلاّمی بانگ نەداتەوە لەبەر فەرموودەی (مهاجر) ی کوڕی (قنفذ) کە سەلامی کردووە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتێکدا دەستنوێژی گرتووە وەلاّمی نەداوەتەوە تاوەکو لە دەستنوێژەکەی بووەتەوە و فەرموویەتی : (إنه لم يمنعني أن أردّ عليك إلاّ أنّي كرهت أن أذكر الله إلا على طهارة)رواه أبوداود والنسائي وابن ماجه و صححه الألباني في صحيحه برقم ٨٣٤ .

واتە : هیچ شتێك قەدەغەی نەکردم لە وەلاّمدانەوەت تەنها ئەوە بوو پێم ناخۆش بوو زیکری خوا بکەم بە بێ دەستنوێژی .

دەبینی ئەمە لەکاتی دەستنوێژدا بووە وای بە چاك زانیوە بە دەستنوێژەوە بێت بێ گومان لەسەر ئاودەست بوون لە پێشترە .

جـا پێویســت ناکـات هیچـیان لــە دڵــەوە وەڵامبداتــەوە ، چـونکە هــیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە ئەگەر دروست بوایە لە پێغەمبـەرەوە صـلى الله عليـه وسلم بۆمان نەقڵ دەکرا .

**پ ٢١٦/ ئایا تـا چ ڕادەیـەك تجمیـل کـردن حەرامـە هـی هـەر شوێنێك بێت**

**وەڵام :**

جوانکاری ناوێکی گشتی یە بۆ ئەوەی بزانین حوکمی دروستە یـان نـا دەبـێ بگەڕێینەوە بۆ بەڵگەکانی شەرع ، جا ئەو شوێنانەی کە فـەرموودەی لەسـەر حەرامێتی هاتبێ وەك باریك کردنەوەی ئەبرۆکان ئەوە دروست نییە ئەوەشی بەڵگـەی گشـتی و تایبـەتی لەسـەر نـەهاتبێ ئـەوە دروسـتە بەمـەرجێ ئـەو مادانەی ئافرەتان بەکاریان دەهێنن زیانی بۆ لەشیان تیادا نەبێت پاشان ئەو خۆجوانکردنە دەبێ بۆ مێرد بێت و بۆ دەرەوە نەبێت .

**پ ٢١٧/ ئایا تا چەند خەوتن لەسەر سك حەرامە وە ئەگەر حەرامە بۆچی حەرام كراوە ؟ وە من زۆر لەمێژە وا دەنووم ناتوانم بەشێوەیەكی تر بنووم ئایا چ بكەم باشە گوناهبار دەبم ؟ زۆر سوپاستان دەكەم خوا جەزاتان بداتەوە**

**وەڵام :**

**خەوتن لەسەر سك نەهی لیٚ كراوە ڕواڵەتی دەقەكانیش ئەوە دەگەیەنن ئەو جۆرە خەوتنە حەرام بێت ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : وەك ڕیوایەت كراوە لەقیس ی كوڕی** طخفة الغفاري **لە باوكییەوە ئەڵیٚ : پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەرمدا هات من لە مزگەوتدا لەسەر سكم خەوتبوم بە پێی خەبەری كردمەوە و فەرمووی :** "ما لك ولهذا النوم هذه نومة يكرها الله أو يبغضها الله" صحيح ابن ماجه للشيخ الألباني برقم ٣٠٠٠ ج ٢

**وە لە** (أبو ذر) **ە وە ئەڵیٚ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەلامدا تێپەڕی من لەسەر سكم خەوتبووم بە پێی خەبەری كردمەوە و فەرمووی** : (يا جندب انما هذه ضِجعة أهل النار) صحيح سنن ابن ماجه برقم ٣٠٠١ .

كەوا بوو پێویستە موسڵمان ئەو كارە نەكات وە نابێت خۆی بدات بەدەستی (نەفس)یەوە وە پێویستە یەكسەر ئەو كارە واز لیٚ بهێنیت چونكە گوناهە .

**پ ٢١٨/ من لە ئەورپا دەژیم لە شوێنێك ئیش دەکەم گۆشتی بەرازی تێدایە ئایا ئیشکردن لەو شوێنەدا حەلاڵە یان نا؟بەبەڵگەوە بۆم ڕوونبکەنەوە ؟**

**وەڵام :**

زانراوە لەشەرعدا وە لای هەموو موسوڵمانانیش گۆشتی بەراز حەرامە چ خواردنی وە چ فرۆشتنی ، جا کارکردن لەو شوێنەدا کە حەرامی تیادا دەخورێت یان دەفرۆشرێت وە تۆش پێشکەشی دەکەی یان قاپەکان دەشۆیت یان هەرجۆرە هاریکارییەت دەکەیت لەسەر ئەو حەرامە ، بەڵگەی حەرامێتی ئەو کارەی تۆ ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێ : { وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ } سورة المائدة(٢) . واتە : یارمەتی و هاریکار یەکتر بکەن لە چاکە و ترسی خوادا وە یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر تاوانکردن و دوژمنایەتی .

ئەمەش قاعیدەیەکی گەورەی کارپێکراوە لەشەرعدا وەك قەدەغەکردنی فرۆشتنی تریێ بەکەسێك بیکات بە ئارەق وە فرۆشتنی چەك و تەقەمەنی لەکاتی شەڕ و شۆڕ لە نێوان موسوڵماناندا وە نەدورانـدنی جلوبەرگی ستەمکار هەموو ئەمانە لەبەر بەشدار نەبوونە لەتاوانی بکەرەکانیدا .

**٢١٩/ هەندێك لە خەڵكی پشت دەبەستن بە كتێبە فیكری و ڕۆشنبیرییەكانەوە و هەندێكی لێ دەخوێننەوە ، پاشان خۆیان لێ دەگۆڕێ و خۆیان بە زاناو بانگەوازكار لەقەڵەم ئەدەن، لەكاتێكدا لە زانستی شەرعیدا لاوازەن و هیچ لەكتێبە شەرعییەكانیان نەخوێندووە ، كەوابوو ڕێنمایی بەڕێزتان چییە بۆ ئەم جۆرە كەسانە ؟**

**وەڵام :**

بسم الله الرحمن الرحيم

زانستی شەرعی بریتی یە لەوەی خوای گەورەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم (فەرموویانە ، نەك فلان و فیسار ووتیان، پاشان ووتەی زانایان دێت كە فەرموودەی خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ خەڵكی ڕوون دەكەنەوە ، زانایان خوای گەورە لەناو بەندەكانیدا لەدوای پێغەمبەران كردوونی بەجێنشین، وەك دەفەرموێت: ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِماً بِالْقِسْطِ﴾ (آل عمران:١٨).

زانستی ڕاستەقینە بریتییە لەزانست بەخواو بەدینی خوا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ (فاطر:٢٨)

ئەمانەش بریتین لە پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان، چاوڕۆشن و خاوەن ئیمان و شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت، زانایانی موسوڵمان جێنشینی پێغەمبەرانن و تەنها ئەوانن خوای گەورە بەخەڵك دەناسێنن و ئاینەکەی ڕۆشن دەکەنەوە ، قوتابی عیلم نابێتە زانا و خاوەن زانستی شەرعی مەگەر بەتێفکران و فێربوونی قورئان و حەدیس و وەرگرتنی زانستی شەرعی لە زانایانی ئەهلی سوننەت، کەوابوو ڕێگەی فێربوونی زانستی شەرعی بەوەدەبێت قوتابی عیلم: دەست بکات بەچاکەکاری و تێفکران و بیرکردنەوە و سوود وەرگرتن، وە دەبێت وەك کەسێکی سوودمەند موتاڵەعە بکات و بخوێنێتەوە ، ئەبێت لەهەموو کاتێکیدا داخوازی عیلم بێت، بەردەوام ئەوەی لای ئاڵۆزە بیری لێ بکاتەوە، لێی وردبێتەوە و لەکتێبە پشت پێبەستراوەکانی تەفسیر وەك تەفسیری (ابن كثير) و (البغوي)، جگە لەمانەش تەفسیری پشت پێبەستراوەی تر، وەبایەخ بدات بەکتێبەکانی حەدیس، وەزانستی شەرعی لە زانایان ئەهلی سوننەت و جەماعەت وەرگرێت ئەوانەی چاوساغ و چاوڕۆشنن، نەك زانایانی کەلام و بیدعەت، وەنەك لە نەزان و نەفامەکان، ئەو زانستەی لە قورئان و سوننەتدا نەبێت پێی ناوترێت زانست، بەڵکو بەنەفامی ناو دەبرێت، با لە دونیادا سودبەخشیش بێت، بەڵکو

مەبەست ئەو زانستەیە لەڕۆژی دواییدا سودبەخش بێت، وە مرۆڤ لە نەزانی و نەفامی دەرکاو بە هۆیەوە لە ئاینەکەی شارەزا و چاوڕۆشن ببێت، وە ئەوەی خوای گەورە لە سەری واجب کردووە و ئەوەشی کەحەرامی کردووە بزانێت، ئائەمەیە زانستی شەرعی (وەڵامی شێخ ابن باز).

**پ ٢٢٠/ ئایا چەند کتێبێکی دیاری کراو هەیە شێخ (ابن باز) ئامۆژگاری پێ بکات بۆ ئەوانەی کە حەز دەکەن کار بکەن لە بواری بانگەواز کردن بۆ لای خوا ؟**

**وەڵام** / گەورەترین و بەڕێزترین کتێب کە ئامۆژگاری پێ بکەم بریتییە لەکتێبەکەی خوا (واتە : قورئانی پیرۆز) کە بە هیچ شێوازێك قسەی بێ ماناو بەتاڵی تێدا نییە ، جا ئامۆژگاری هەموو بانگەوازکارێك بۆ لای خوا و هەموو فەرمانکارێك بە چاکە و قەدەغەکارێك لە خراپە و مامۆستا و فێرکار و ڕێنمایکارێك دەکەم چ نێر بێت یان مێ : ئامۆژگاری هەموو ئەمانە دەکەم بە گرنگی دان بە کتێبەکەی خوا و وورد بوونەوە لێ و زۆر خوێندنەوەی ، چونکە قورئان بنەمای هەموو خێر و چاکەیەکە و فێرکارە و ڕێنمایی کارە بۆ خێر و چاکە وەك خوای گەورە و بە دەسەڵات فەرموویەتی : ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ

يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ [سورة الإسراء : ٩] واتە : ئەم قورئانە ڕێنمای کارە بۆ ئەوەی ڕێك و ڕاستە ، وە قورئان ڕێنمای کارە بە ڕێنمای خوا بۆ ڕێگای ڕاست .. بۆ ڕێگای هۆشمەندی .

جا پێویستە لە سەر ئەوانەی کە بانگەواز و فەرمان بە چاکە دەکەن و مامۆستا و فێرکارن کە هەوڵ بدەن و خۆ ماندوو بکەن لە خوێندنەوەی و تێفکرین و تێڕوانینی ماناکانی ، ئەوان بەمە گەورەترین سوود دەبینن و بەمە ڕادێن لە سەر بانگەواز و فێر کردن بە کۆمەکی کردنی خوای گەورە .

ئەنجا ئامۆژگاری دەکەم بە سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوەی کە تیایدا هاتووە لە زانست و ڕێنمایی ، وە ئامۆژگاری بانگەوازکار بۆ لای خوا و فەرمانکار بە چاکە و قەدەغەکار لە خراپە و مامۆستا و فێرکار دەکەم چ نێر بێت یان مێ : بە کتێبەکانی فەرموودە و ئەوەی کە زانایان لەم بوارەدا نووسیویانە تا سوود مەند بێت لێیان ، وە گرنگترین و صەحیحترین کتێبی فەرموودە بریتی یە لە : (صحيح البخاري وصحيح مسلم) جا با زۆر بگەڕێتەوە بۆ ئەم دووانە و سوودیان لێ ببینێت ، وە باقی تری کتێبە فەرموودەی یەکان وەك : (سنن الترمذي وأبي داود

والنسائي وابن ماجه) و (مسند الإمام أحمد) و (موطأ الإمام مالك) و (سنن الدارمي) و جگە لەمانەش لە کتێبە فەرموودەی یە ناسراوەکان .

هەروەها وەصێت دەکەم بە گەڕانەوە بۆ لای کتێبی زانایان و ئەهلی عیلمی سوود بەخش وەك : (المنتقى لابن تيمية) و (رياض الصالحين) و (بلوغ المرام) و (عمدة الأحكام) و (جامع العلم وفضله لابن عبد البر) و (جامع العلوم والحكم لابن رجب) و (زاد المعاد في هدي خير العباد للعلامة ابن القيم) و (إعلام الموقعين) و (طريق الهجرتين) و (الطرق الحكمية) کە هەموو ئەمانەش هی (ابن القيم)ـن ، وە ئەو لە هەموو ئەم کتێبانەدا زۆر شتی لە بارەی بانگەواز و فەرمان بە چاکە و قەدەغەکردن لە خراپەی باس کردووە .

بۆیە دەبێت موسوڵمان سوودیان لێببینێت ، چونکە ئەم کتێبانە گەورە و بە نرخن و لە لایەن جۆرە پێشەوا و زانایانێکەوە نووسراوە کە پایە دارن لەم ڕێگایەدا و لە گەڵ بیروباوەڕێکی چاك و تاقیکردنەوەیەکی زۆردا .

هەروەها ئەو نووسراوانەی (شيخ الإسلام : ابن تيمية) لە بواری سیاسەتی شەرعی و (الحسبة)دا کە لە کتێبی (الفتاوى) و (منهاج السنة)دا هەیە ، چونکە ئەم لە پێشەوا هەرە گەورەکانە کە زۆر (تەجروبەدارن) لەم

بوارەدا و تیادا هەڵکەوتوون ، وە خوا بەم سوودی گەیاند بە ئوممەت و حەقی پێ سەرخست و بیدعە و بیدعەچی یەکانی پێ سەرکز و زەلیل کرد ، خوا پاداشتی ئەم و برایانی لە زانایان بداتەوە لە سەر ئارامگرتن و جیهاد و تێکۆشانیان بە باشترین پاداشت کە پاداشتی چاکەکارانی پێدەداتەوە ، چونکە ئەو بەخشندە و دەست کراوەیە .

جا من ئامۆژگاری هەموو موسوڵمان و مامۆستا و ڕێنماییکارێك دەکەم کە گرنگی بدات بەم کتێبە بە سوودانە دوای گرنگی دان بە کتێبەکەی خوا و سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) .

هەروەها وەصێت دەکەم بەو کتێبانەی کە لەم بوارەدا نووسراون لە لایەن پێشەوایانی زانست و ڕێنمایی لە هەر سێ مەزهەبی (مالکی و شافعی و حەنەفی) و جگە لە مانەش لە کتێبی (حەنبەلی یە) ناسراوەکان بە زانست و ڕێڕەوی ڕاست و چاکێتی بیروباوەڕ .

مەبەست ئەوەیە کە بانگەوازکار پشت بە کتێبی زانایان ببەستێت کە لەم بوارەدا نووسراوە ، چونکە ڕێنمایی دەکات بۆ ئەوەی کە نایزانێت و ڕێنمایی دەکات بۆ زۆرێك لە زانست ، خوای پایە بەرز فەرموویەتی :

﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾ [سورة البقرة : ١٩٧] واتـه : توێشـوو کۆبکەنەوە و باشترین توێشوویش لە خوا ترسان و تەقوایە ، وە گومانیشی تێدا نی یە کە زانست و چاوڕۆشنی لە تەقوایە[1] .

**پ ٢٢١/ ئایا بۆچوونی بەرێزتان چی یە سەبارەت چارەسەرکردنی ئافرەتان بۆ پیاوان لە بواری چارەسەرکردنی ددان دا ئایا ئەمە دروستە ؟ وە بۆ زانینتان لە گەڵ ئەمەشدا دکتۆری پیاو هەیە لەم بوارەدا و لە هەمان وڵاتدا ؟**

**وەڵام** / ئێمە زۆر هەوڵمان داوە و زۆریش کارمان کردووە لەگەڵ بەرپرسەکاندا بۆ ئەوەی پیاوان چارەسەری پیاوان بکەن و ئافرەتانیش چارەسەری ئافرەتان بکەن ، وە بۆ ئەوەی دکتۆرە ئافرەتەکان تایبەت بن بە چارەسەرکردنی ئافرەتان و دکتۆرە پیاوەکانیش تایبەت بن بە چارەسەر کردنی پیاوان لە بواری ددان و جگە لەمەش ، وە تەنها ئەمەش حەقە چونکە ئافرەت (عەورەت) و فیتنەیە ئیللا مەگەر خوا ڕەحم بکات ، بۆیە پێویستە دکتۆرە ئافرەتەکان تەنها تایبەت بن چارەسەرکردنی ئافرەتان و دکتۆرە

---

[1] فتاوى الشيخ ابن باز رحمه الله ، المجلد الرابع / أسئلة مهمة وأجوبتها .

پیاوەکانیش تەنها تایبەت بن بە چارەسەر کردنی پیاوان مەگەر لە حاڵەتێکی زۆر زۆر زەروردا نەبێت ئەگەر نەخۆشینێك لە پیاواندا هەبێت و دکتۆری پیـاو نەبێت بتوانێت چارەسـەری بکـات ئـەو کاتـە هیچـی تێـدا نـی یـە ، و خـواش دەفەرموێت : ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ﴾ [سورة الأنعام : ١١٩] ، واتە : خوای گـەورە شـتە حەرامـەکانی بۆتـان روون کردووەتـەوە و نابێت ئێوە ئەنجامی بدەن مەگـەر ئـەوە نـەبێت کـە زۆر زەرور دەبـن بـۆی ، ئەگینا پێویستە دکتۆرە ئافرەتەکان تایبەت بن بە چارەسەرکردنی ئافرەتـان و دکتۆرە پیاوەکانیش تایبەت بـن بـە چارەسـەر کردنـی پیـاوان ، وە بەشـی دکتۆری پیـاوان جـودا بێـت و بەشـی دکتـۆری ئافرەتـانیش جـودا بێـت ، وە خەستەخانەی تایبەت هەبێت بۆ پیاوان وخەستەخانەی تایبەتیش هەبێت بـۆ ئافرەتان بۆ ئەوەی هەمووان دوور بن لـە فیتنـە و تـێکلاوی زەرەرمەنـد ، ئـا ئەمە پێویستە لە سەر هەمووان(٢) .

---

(٢) فتاوى الشيخ ابن باز رحمه الله ، المجلد التاسع / أسئلة وأجوبة تتعلق بالطب .

**پ ٢٢٢/ هەموو دەمێك ئەو فەرموودە پیرۆزە دەبیسین كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تیایدا فەرموویەتی : " النساء ناقصات عقل ودين" ، وە هەندێك لە پیاوان ئەم فەرموودەیە بە كار دێنن بۆ خراپەكاری لەگەڵ ئافرەتاندا ، جا داوا لە بەڕێزتان دەكەین كە واتای ئەم فەرمووودەیەمان بۆ ڕۆشن بكەنەوە ؟**

**وەڵام** / واتای فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرموویەتی : " ما رأيت من ناقصات عقل ودين أغلب للب الرجل الحازم من إحداكن ! فقيل يا رسول الله : ما نقصان عقلها ؟ قال : أليس شهادة المرأتين بشهادة رجل ؟ قيل : يا رسول الله : ما نقصان دينها ؟ قال : أليس إذا حاضت لم تصل ولم تصم " واتە : نەم بینیوە كەم عەقڵ و كەم دینی وەكو ئێوە كە هۆشی پیاوی كارامە لە سەر ببات ! وترا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باشە كەم عەقڵی ئافرەتان لە چیدایە ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : باشە شایەتی دانی دوو ئافرەت بەرانبەر بە شایەتی دانی یەك پیاو نی یە ؟ وترا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەم دینی ئافرەتان لە چیدایە ؟ فەرمووی : باشە ئەگەر كەوتە ناو بێنوێژیەوە واز لە نوێژ و ڕۆژو ناهێنێت ؟

پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە کەمی عەقڵی ئافرەتان لە ڕووی بێهێزی لە بەر کردن و بە ئاگا بوونیانە و شایەتیدانیان بە شایەتی ئافرەتێکی تر پڕدەکرێتەوە ، وە ئەمەش بۆ ڕێکخستنیی شایەتیدانە ، چونکە ئافرەت هەندێك جار شتی لە بیر دەچێت و شت زیاد دەکات یان کەمی دەکات بۆ سەر شایەتی دانەکەی ، وەك خوای پاك و بێ گەرد فەرموویەتی : ﴿وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى﴾ : [سورة البقرة : ٢٨٢] واتە : دوو پیاو لە خۆتان بکەن بە شایەت وە ئەگەر نەبوون ئەوا پیاوێك و دوو ئافرەت لەو شایەتانەی کە پێیان ڕازی دەبن بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان لە بیری چوو ئەوەی تریان بیری خاتەوە .

وە کەم دینی ئافرەت لە بەر ئەوەیە لە کاتی بێنوێژی و زەیسانیدا واز دێنێت لە نوێژ و ڕۆژوو ، وە نوێژ بە قەرز ناگێڕێتەوە ئەمەش کەم دینی یە بۆ ئافرەت ، بەڵام ئەم کەمی یە ئافرەتانی لە سەر تاوانبار ناکرێت ، بەڵکو ئەم کەمی یە بەپێی شەرعی خوای گەورە هاتووتە دی ، ئەم کەمی یە خوا بۆی داناوە چونکە بەزەیی بە ئافرەت هاتووەتەوە و کارئاسانی بۆ کردووە ، چونکە ئەگەر ڕۆژوو بگرێت لە کاتی بێنوێژی و زەیسانیدا ئەوا زەرەری

پێدەگات ، خوای گەورە بەڕەحمی خۆی بەحەلاڵی داناوە ئافرەتان لەکاتی حەیز و زەیسانیدا ڕۆژوو نەگرن و پاشان بەقەزا بیگرنەوە ، بەلاّم نوێژ لەکاتی حەیزدا قەدەغەکارێکی هەیە ، بەڕەحمی خوا بۆ ئافرەت لەکاتی حەیزدا حەلاڵ کراوە نوێژ نەکات هەروەها لەکاتی زەیسانیدا ، پاشان شەرع وایە کە ئافرەت لەم حاڵەتەدا قەزای نوێژ نەکاتەوە ، چونکە قەزاکردنەوەی ناڕەحەتی زۆر تێدایە چونکە نوێژ لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار دوبارە دەبێتەوە ، لەکاتێکدا حەیز چەند ڕۆژێك دەخایەنێت ، دەگاتە حەوت یان هەشت ڕۆژ یان زیاتر ، زەیسانی جاری واهەیە دەگاتە چل ڕۆژ بۆیە ڕەحم و چاکەی خوایە بەرامبەر ئافرەتان کە کردن و قەزاکردنەوەی نوێژی لەسەر هەلگرتوون .

لێرەوە دەرکەوت کە کەمی ژیری و دیانەتی ئافرەتان لە هەموو شتێکدا نییە بەڵکو تەنها لەوەدایە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕونی کردۆتەوە کە ناتەواوی ژیری ئافرەتان لەوەدایە کە ناتوانن شایەتیدانیان کۆك بکەن و بەباشی ئەنجامی بدەن ، وەناتەواوی دیانەتیان لەوەدایە کە بە هۆی نەکردنی نوێژ و ڕۆژوو لەحاڵەتی حەیز و زەیسانیدا توشیان دەبێت ، ئەمەش مانای ئەوە نییە ئافرەتان لە هەموو شتێکدا لە پیاوان کەمترن و پیاوان لەوان

چاکتربن ، بەشێوەیەکی گشتی پیاوان لە ئافرەتان باشترن لە بەر چەندەها هۆکار ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ بەلاّم هەندێ جار ئافرەتی واهەیە لەچەندین شتدا لە هەندێ لە پیاوان چاکتر دەبێت ، چەندەها ئافرەتان هەن لە چەندین لە پیاوان ژیر و دیندارتر و کار دروسترن ، تەنها ئەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەلمێنراوە کە بەگشتی ئافرەتان لەم دووشتەی باسکران کەمترن لەپیاوان وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕونیکردۆتەوە ، ئافرەتی وا هەیە ئەوەندەچاکەی زۆر دەبێت لە زۆر لە پیاوان چاکتر دەبێت لە کردەوە و تەقوا و پلە و پایەی لە ڕۆژی دواییدا ، جاری واهەیە بایەخ دەدات بەشتگەلێك و داکۆکی دەکات چاکتر لە هەندێ لە پیاوان کە زۆر هەوڵدەدەن و بایەخدەدەن ، تەنانەت لە مێژووی ئیسلامدا دەبێتە مەرجەعێك ئەمەش ڕوونە بۆ کەسێك تێبفکرێت لەحاڵی ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، و سەردەمی هاوەلاّن ، بەم ڕوونکردنەوە ئەوە دەزانرێت کە ئەم کەم و کوڕییە قەدەغەی ئەوە ناکات ڕیوایەتیان وەربگیرێت و شایەتی دانیان ئەگەر دوانبن وەربگیرێت ، زۆر ئاساییەو قەدەغەشنابێت تەقوا دار و چاکترینی بەندەکانی خوا بێت ژنان و پیاوان ئەگەر بێتو

بەردەوام بێت لە سەر دینداری خۆی با نویژو ڕۆژووش نەکات لە کاتی حەیز و زەیسانیدا ، کە وابوو دروست نییە بۆ هیچ ئیمانداریك تانەو تەشەریان لێبات و بە ناتەواویان بزانێت لە هەموو شتێکدا پێویستە ڕوون بکرێتەوە و فەرمودەکەی پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بە باشترین بار تەفسیر بکرێت ، وە خوای پایە بەرزیش زاناترە[٣] .

**پ ٢٢٣/ حوکمی یاری بۆکسێن (یان : مشتە کۆڵە ) ( الملاكمة)، و زۆرانبازی لەگەڵ گا** (ومصارعة الثيران)، **و زۆرانبازی ئازاد** (المصارعة الحرة ):

موسڵمانێك لە میصرەوە پرسیار دەکات لە حوکمی ئیسلام سەبارەت بە یاری بۆکسێن و زۆرانبازی لە گەڵ گاو زۆرانبازی ئازاد ؟

**وەڵام** / یاری بۆکسێن و زۆرانبازی لە گەڵ گا لەو یاریانەن کە لە ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا قەدەغەکراون ، لە بەر ئەو زیانە زۆرو ترسناکیە گەورەیەی کە لە بۆکسێندا هەیە ، و لە بەر ئەو ئەزیەت دانە ناڕەواییەی کە بەرامبەر بە ئاژەڵەکە ئەنجام دەدرێت لەزۆرانبازی لەگەڵ گادا ، بەڵام سەبارەت بە زۆرانبازی ئازاد کە ترسناکی و ئازارێکی تێدا نی یە لەگەڵ دەرنەکەوتنی

---

[٣] فتاوى الشيخ ابن باز رحمه الله ، المجلد الرابع / معنى نقص العقل والدين عند النساء .

عەورەت ،ئەوا هیچ ڕێگرێك نی یە لە حەڵاڵێتی ، لە بەر ئەو فەرموودەیەی کە زۆرانبازی پێغەمبەری خوامان (ﷺ) بۆ دەگێڕێتەوە لە گەڵ یزیدی کوڕی ( ڕکانة ) (رضي الله عنه) و لێبردنەوەشی ، وە لەبەر ئەوەی کە بنەوا لەم کردارانەدا حەڵاڵێتی یە جگە لەوانەی کە شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز قەدەغەی کردوون ،هەروەها بڕیارێك لە (المجمع الفقهي الإسلامي التابع لرابطة العالم الإسلامي )ەوە دەرکراوە کە یاری بۆکسێن و زۆرانبازی لە گەڵ گادا قەدەغە دەکات لە بەر ئەو هۆکارانەی کە پێشتر باسمان لێوە کردن ، ئەمەش دەقەکەیەتی :

بڕیاری سێیەم : سەبارەت بە بابەتی : ( یاری بۆکسێن و زۆرانبازی ئازاد و زۆرانبازی لە گەڵ گادا ) .

شوکر و ستایش تەنها بۆ خوای پەروەردگار ، و درووود و سەلامیش لە سەر ئەو پێغەمبەرە بێت کە پێغەمبەری بە دوادا نایەت ، سەروەر و پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) و ئەهل و بەیت و یارو یاوەرانی ، پاش ئەمەش :

( مجلس المجمع الفقهي الإسلامي لرابطة العالم الإسلامي ) لە خولی دەیەمیدا ، کە لە ( مەککەی پیرۆز ) دا و لە بەرواری ( يوم السبت ٢٤ صفر ١٤٠٨ هـ الموافق ١٧ أكتوبر ١٩٨٧ م إلى يوم الأربعاء ٢٨ صفر ١٤٠٨ هـ

الموافق ٣١ أكتوبر ١٩٨٧ م ) ڕوانیویــەتی یــە بابــەتی یــاری بۆكســێن و زۆرانبازی ئازاددا لەو ڕووەی كە بـە وەرزشـێكی جەسـتەیی ڕەوا دادەنرێـت ، لەگەڵ زۆرانبازی لەگەڵ گادا كە بەربڵاوە لە هەندێك لە وڵاتانی بیانی دا ، ئایا ڕەوایە لە ڕوانگەی ئیسلامدا یان نا ڕەوایە ؟ وە دوای تاوتویێ كردن سەبارەت بە بابەتەكە لـە هـەموو بوارەكانیـەوە ، و ئـەو ئاكامانـەی كـە لـەم جۆرانـەدا دەكەوێتــەوە ، كـە دەدرێنـە پـاڵ وەرزش و ناوەنـدەكانی ڕاگەیانـدن وەكـو تەلەفزیۆن لە وڵاتانی ئیسلامی جگە لەوانیش پەخشی دەكەن .

وە دوای ڕوانــین بـۆ ئـەو لێكۆڵینەوانــەی كـە پێشــكەش كـراون بــە داواكاری ( مجلس المجمع ) لـە خـولی پێشـوویدا ، لـە لایـەن چـەند پزیشـكێكی پسپۆڕ و كارامە ، هەروەها دوای ڕوانـین بـۆ ئـەو ژمێریاریانـەی كـە لـە لایـەن هەندێكیانەوە پێشكەش كرابوو سەبارەت بەوەی كە ڕووی داوە لە جیهانـدا ، لــە ئاكـامی بــەكاربردنی یــاری بۆكســێن و ئــەو ڕووداوە دڵ تەزێنانــەی كــە دەبینرێت لە سـەر شاشـەكانی تەلـەفزیۆن لـە ئـەنجامی زۆرانبـازی ئـازاد ، ( مجلس المجمع ) ئەم بڕیارەی خواری دەدات :

### یەكەم : یاری بۆكسێن :

( مجلس المجمع ) بە کۆڕای دەنگ ئەوە دەبینێنت کە یاری بۆکسێن کە باسکرا ، کە ئەنجام دەدرێت لە چوار چێوەی وەرزشی پێشبڕکێکان دا لە وەڵاتەکەماندا ئەنجام دەدرێت کردارێکی قەدەغەکراوە لە شەریعەتی ئیسلامی دا ، چونکە لە سەر ئەوە بنیات دەنرێت کە هەرکامەیەك لە دوو یاریزانەکە زیاتر بەرامبەرەکەی ئەزیەت بدات لە جەستەیدا ، ئەزیەت دانێکی زۆر لەوانەیە بگاتە ڕادەی کوێر بوون ، یان تێکدانی مێشکی یاریزانەکە ، شکاندنی زۆر لە ئێسکەکانی ، یان دەگاتە مردن ، بێ ئەوەی هیچ مەسئولیەتێك بکەوێتە سەر لێدەر ، لە گەڵ دڵخۆشی بینەران بۆ ئەو کەسەی کە دەباتەوە ، وە پێخۆش بوون بە ئازاری ئەوی تریان ، ئەوەش کردارێکی قەدەغەکراوە بە گشتی و بە هەموو بەشەکانیەوە لە حوکمی ئیسلامدا ، لە بەر وتەی پەروەردگار کە فەرموویەتی : ﴿ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ ﴾ [سورة البقرة : ١٩٥] ، وە فەرموویەتی : ﴿ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ [سورة النساء : ٢٩] ، وە لە بەر ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تیایدا فەرموویەتی :

" لا ضرر ولا ضرار " .

لە بەر ئەوەیە ، زانایانی شەریعەت فەرموویانە ئەگەر كەسێك خـوێنی خۆی حـەڵاڵ بكـات بـۆ كەسـی بەرامبـەر و پـێی بڵێـت : ( بمكـوژە ) نابێـت بیكوژێت ، وە ئەگەر ئەو كردارەی ئەنجامدا ئەوا مەسئولە و شایستەی سزایە . وە لە سەر ئەو بنەوایە (كۆنگرە ) بڕیـاری ئـەوە دەدات كـە یـاری بۆكسـێن نابێت پـێی بوترێـت یاریـەكی وەرزشـی و جەسـتەیی یـە ، ناشـبێت ئـەنجام بدرێت ، چونكە وەرزش لە سەر بنەوای مەشق ڕاهاتن نـەك ئەزیـەت دان یـان زیـــان گەیانـــدن ، وە پێویســـتە لابرێـــت لـــە بەرنامـــەی نـــاوخۆی و ، بەشدارنەبوونیش تیایـدا لـە یاریـە نێـو دەوڵەتیـە جیهانیـەكان دا ، هـەروەها (كۆنگرە) بڕیاری ئەوە دەدات كـە ڕەوا نـی یـە لـە بەرنامـەكانی تەلەفزیۆنـدا پیشان بدرێت ، بۆ ئەوەی لاوانمان ئەم یاریە خراپە فێر نەبن و هەوڵی لاسایی بدەن .

## دووەم : زۆرانبازی ئازاد :

سەبارەت بە زۆرانبازی ئازاد كە تیایدا ڕەوایە بۆ هەردوو زۆرانبـاز كـە ئەزیـەت و زیـان بـە بەرامبەرەكـەی بگەیـەنێت . ( كـۆنگرە ) ئـەوەی تێـدا دەبینیت كە كردەوەیەكی هاوشێوەیە بە تەواوی بۆ یاری بۆكسێن كە باسكرا

، با لـە شێوەشـدا جیـاواز بـن ،چـونکە هـەموو ئـەو قەدەغەکراوانـەی کـە ئاماژەیان بۆ کراوە لە بۆکسێندا بەهەمان شـێوە لـە زۆرانبـازی ئـازاد کـە لـە شێوەی زۆرانبازیدا ئەنجام دەدرێت ، هەمان حوکمی ئەویش وەردەگرێـت لـە قەدەغەکردندا . بەڵام ئەو جۆرەکانی تری زۆرانبازی کە تەنها لە بـەر وەرزش ئەنجام دەدرێت ، و تیایدا ڕێ بەوە نادرێـت کـە یاریزانـەکان ئەزیـەتی یـەکتر بدەن ئەوا ڕەوایە بە پێی شەریعەت ، (کۆنگرە) یش هیچ ڕێگرێك نابینێت لە ئەنجامدانی .

## سێیەم : زۆرانبازی لە گەڵ گا :

بەڵام سەبارەت بە زۆرانبازی لە گەڵ گادا کە بەربڵاوە لـە هەنـدێك لـە وڵاتانی جیهاندا ، ئـەو یاریـەی کـە دەبێتـە هـۆی کوشـتنی گاکـە ، لـە لایـەن یاریزانەکەوە بەشێوەیەکی هونەری کە یاریزانەکە مەشقی لە سـەر کـردووە ، ئەمەش بەهەمان شێوە قەدەغەکراوە لە شەریعەتی ئیسلامی پیرۆزدا ،چونکە دەبێتـە هـۆی کوشـتنی ئاژەڵێـك بـە ئـازارەوە ، بـە هـۆی ئـەو تیرانـەی کـە دەچەقێنرێنە گیانی ،وە زۆر جاریش ئەم زۆرانبازیە دەبێتە هۆی ئەوەی گاکە زۆرانبازەکە بکوژێت وە ئەم زۆرانبازیە کـارێکی دڕندانەیـە ، ئـاینی ئیسـلامی

پیرۆز قەدەغەی دەکات ئەو ئایینەی کە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرموویەتی : " دخلت امرأة النار في هرة حبستها ، فلا هي أطعمتها وسقتها إذ حبستها ، ولا هي تركتها تأكل من خشاش الأرض " جا ئەگەر ئەمە لەبەر زندانی کردنی پشیلەیەك بێت ئەنجامدەری لەڕۆژی دواییدا بخاتە ئاگری دۆزەخەوە ، ئاخۆ ئەبێ حاڵی کەسێك چۆن دەبێت گایەك ئەزیەت دەدات تا مردن ؟!

**چوارەم : ئاژەڵ بەشەرداران :**

هەروەها (کۆنگرە) بڕیاری قەدەغەکردنی ئەوە دەدات بەسەر ئەوەی ڕوودەدات لە هەندێك لە وڵاتاندا لە بەگژیەکدادانی هەندێك جۆری ئاژەڵ ،وەك : وشتر و بەران و کەڵەباب ( کەڵەشێر ) و جگە لەمانەش ، تاکو یەکتر بکوژن یان ئەزیەتی یەکتر بدەن .

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما كثيرا والحمد لله رب العالمين

گرنگترین کەسانی بەشداربوو :

عبد العزيز بن عبد الله بن باز ( رئيس مجلس المجمع ) .

و د. صالح بن فوزان بن عبد الله الفوزان .

و د. بكر عبد الله أبو زيد[٧] .

**٢٢٤/ بۆچی لە ئیسلامدا کە کوڕێك لە دایك دەبێت دوو حەیوانی بۆ سەر دەبڕن بەڵام بۆ کچ یەك دانە؟**

وەڵام : **بسم الله الرحمن الرحيم**

**بەڵێ ڕاستە و سەلمینراوە لە هەندێ لە فەرمودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر کەسێك کوڕێکی ببێت دوو حەیوانی بۆ بکات بە گوێزەبانە بە ڵام بۆ کچ یەك دانە**

**وەك لە فەرموودەی دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە دا هاتووە خوای لێ رازی بێت وەك دەفەرموێت: (أنَ رسول الله صلي الله عليه وسلم أمرهم عن الغلام شاتان مكافئتان وعن الجارية شاة)** رواه أحمد والترمذي وصححه الألباني في الصحيحة (١٦٥٥).

---

[٧] فتاوى الشيخ ابن باز رحمه الله ، المجلد الرابع / حكم الملاكمة والمصارعة الحرة .

واتە (پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێکردوین بۆ کوڕ دوو حەیوانی یەکسان سەرببڕین وە بۆ کچیش یەك دانە. جالێرە وە ئەو پرسیار و ڕەخنانە سەرچاوە دەگرن کە گوایە ئاینی پیرۆزی ئیسلام جیاوازی کردووە لە نیوان کچ و کوڕ دا جا بۆ وڵام دانەوەو ڕەواندنەوەی ئەم شوبهانە دەبێ پێشەکی ئەوە بزانین کە ئیسلام هی خوایە وە دژی جیاوازی ڕەگەزیە و بەڵگەش ئەوەیە هەردوو ڕەگەز خوا دەیبەخشێ

وە ئەگەر لە ئەحکامەکاندا جیاوازی هەبوو لەبەر خودی ڕەگەزەکان نیە وە لەوەش زیاتر ئیسلامی پیرۆز چەندین ڕینمای گەورەی تیدایە بۆ بنەبڕکردنی جیاوازی ڕەگەزی لەوانە وەك ئایەتی: [لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثاً وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ ] الشورى ٤٩.

واتە(خاوەندایێتی ئاسمانەکان و زەوی تەنها هی خوایە هەرچی بوێت دروستی دەکات بەهەرکەس بیەوێت کچ دەبەخشێت و بە هەر کەس بیەوێت کوڕ دەبەخشێت.

خوای گەورە وەك لەم ئایەتەی باسی دەکەین ئەو پێناخوش بوونەی لە کاتی بونی کچاندا لە لایەن نەزانەکانەوە بە خراپ داناوە کە دەفەرموێت:

[وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ (*) يَتَوَارَى مِنْ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ] النحل ٥٨-٥٩ . واتە (خو ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکیك لەو نەفامانە ڕووی گرژ و تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سنگی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە وە لە داخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی و بە تەنها بیردەکاتەوە.ئایە بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و بێ نرخی یاخود زیندە بە چاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە.

خەڵکی لە نەفامیدا لە پێش ئیسلام کچانیان خۆش نە دەویست بەڵکو هی وایان هەبوو لە خیزانەکەی تورە بوو لێی دوورکەوتووەتەوە بەهۆی ئەوەی کوڕی بۆ نەهێناوە چونکە کۆمەڵگەیەکی پڕ لە تایفەگەری وشەڕوشۆر بووە حەزیان لە کوڕ کردووە کە پیویستی ژیانیان بەوە هەبووە تاوەکو خۆری ئیسلام دەرکەوتووە هیچ لەو ڕەگەز پەرستی و تایفەگەریانەی نەهێشتووە و بانگەشەی چاکێتی و گەورەی بەخیوکردن وپەروەردەکردنی کچانی ڕاگەیاندووە جارێك بەوەی کە قەڵغانە لە ئاگری دۆزەخ

وەك عائیشە ی دایكی ئیمانداران دەفەرموێت: [دخلت إمرأة ومعها ابنتان لها تسأل فلم تجد عندي شيئاً غير تمر سأعطيتها إياها فقسمتها بين ابنتيها ولم تأكل منها ثم قامت من فخرجت فدخل النبي صلى الله عليه وسلم علينا فأخبرته فقال من ابتلي من هذه البنات بشيء فأحسن اليهن كن له ستراً من النار ] رواه البخاري والمسلم

واتە(ئافرەتێك هاتە ژورەوە و دوو كچی خۆی لەگەڵ بوو وە داوای خواردنی كرد جا هیچ خواردنی لای من نەدۆزیەوە تەنها دەنكە خورمایەك نەبێت منیش ئەوەم پێدا و ئەویش لەنیوان هەردوو كچەكەیدا دابەشی كردو خۆی لێی نەخوارد پاشان هەستاو رۆیشت جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتە ژورەوە منیش هەواڵم پێدا و ئەویش فەرمووی هەركەس خوا لەو كچانەی بداتیّ وە چاكەیان لە گەڵدا بكات ئەوا دەبنە قەڵغان بۆی لە ئاگر.

وە جارێكی تر بەوەی كە دەبنە هۆی چونە بەهەشتەوە وەك دایكە عائیشە دەفەرموێت: [جائتني مسكينة تحمل ابنتين لها فأطعمتها ثلاث تمرات فأعطيت كلَ واحدة منهن تمرة ورفعت الى فيها تمرة لتأكلها فاستطعمتها ابنتاها فشقت التمرة التي كانت تريد أن تأكلها بينهما فأعجبني شأنها فذكرت الذي

صنعت لرسول الله صلى الله عليه وسلم فقال ان الله قد أوجب لها الجنة أو أعتقها بها من النار.] رواه مسلم

واته (ئافرەتێکی هەژار هات بۆ لام و دوو کچی خۆی بە باوەشەوە بوو منیش سێ دەنکە خورمام پێدان ئەویش هەریەك خورمایەکی پێدان و دەنکە خورمایەکی برد بۆ دەمی بۆ ئەوەی بیخوات جا کچەکان بینیان داوای خواردنی ئەوەشیان کرد ئەویش کردی بە دوو کەرتەوە منیش ئەمەم لا سەیر بوو بۆیە ئەوەی کە کردی بۆ پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە ئەویش فەرمووی بەڕاستی خوای گەورە بەهەشتی بۆ داناوە یان رزگاری کردووە لە ئاگر.

وە جارێکی تر بەوەی پلەو پایە بەرزدەکاتەوە وەك (أنس)ی کوری مالك دەفەرموێت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: [من عال جاريتين حتى تبلغا جاء يوم القيامة أنا وهو وضم أصابعه ] رواه مسلم.

واتە(هەرکەسێ دوو کچ بەخێو بکات تاوەکو پێدەگەن ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا من و ئەو بەیەکەوەین جا هەردوو پەنجەی شایەتومان و ناوەراستی بەیەکەوە نوساند.

کەوابوو دەرکەوت فەزڵی بەخێوکردن کچ چەندە گەورەیە لە ئیسلامدا زۆر گرنگی پێدراوە ئەمەش لەبەر ئەوەی باوکان دایکان هەروەها کەسانی تری بەخێوکاریش کەمتەرخەمی نەکەن و جیاوازی لە نیوان کچ و کوڕدا نەکەن چونکە خەڵکی زۆر جار لەبەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان گرنگی بە کوڕان دەدەن

بەڵام لە ئیسلامدا دەبینی لە پرۆسەی هاوسەر گیریدا دەبێ کوڕ مارەیی بە کچ بدات لەکاتێکدا هەردووکیان هاوبەشن لەو پرۆسە یەدا،هەروەها چۆن پێش مێردکردنی ژیانی بۆ دابین کراوە لە لایەن باوك و براکانیەوە.دەبێ مێردی ژیانی بۆ دابین بکات ئەمانەو چەندین شتی تریش هەمووی رێزن بۆ کچان و ئافرەتان.

ئەنجا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی کە گوایە جیاوازی لە نێوان کچ و کوڕدا کراوە لەسەربڕینی حەیوانی گوێزەبانە کە گوایە ئەو دوو دانەی کوڕ بەڵگەبێت لەسەر چاکێتی بەسەر کچدا کەیەك دانەی بۆ دەکرێت من دەپرسم کوا بەڵگەی چاکیتی و فەزڵ لەو دەقانەی لەسەر ئەم بابەتە هاتوون بۆ ڕونکردنەوەی ئەمەی کە گوتمان وا باشترە بەڵگەکان بخرێنە ڕوو چونکە

ئەگەر تەماشای فەرموودەکان بکەین نابینین نەك بە ڕاشکاوی بەڵکو بە ئاماژەش ئەم جیاوازیەی تیا نیە ئەنجا بۆ ئەم مەسەلەیە پیویستە مانای عەقیقەو گوێزەبانە بزانین لە زمان و زاراوەی شەرعدا چین وە بپرسین ئایا عەقیقە شوکرو سوپاسی خوایە لەسەر ئەوەی پێیداوین یان ئەرك و پێویستیە دەبێ ئەنجامی بدەین یان هەردووکیانە وە عەقیقە بۆچی وە ئەو فەرمودانەی لەم بارەیەوە هاتوون چییان لێوە فێر دەبین فەرموودەکانیش:

١) عن سلمان بن عمار الضَّبي قال سمعت رسول الله (صلي الله عليه وسلم) يقول مع الغلام عقيقه فأهريقوا عنه دماً وأميطوا عنه الأذى) رواه البخاري

واتە (لەگەڵ منداڵی لە دایك بوودا عقیقە هەیە ئێوەش لە جیاتی ئەوە خوێن بڕێژن و نارەحەتی و پیسیەکان لەسەری ڕاماڵن و لاییەن.

عەقیقە لە زماندا وەرگیراوە لە عقَ يَعِقُ کە بە (کسر و ضم)ی پیتی عەین ماناشی ئەو قژەیە بەسەر منداڵەوە لە کاتی لە دایك بووندا

بەڵام لەزاراوەی شەرعدا بریتیە لەوحەیوانەی لە حەوتەم ڕۆژی لە دایك بوونی منداڵدا سەر دەبڕێت کە لەورۆژەدا سەری دەتاشرێت و ئەوقژەی کە پێی دەگوترێت عەقیقە لادەبرێت بۆیە حەیوانەکەش بەوەوە ناسراوە.کەوا

بوو مانای فەرمودەکە کە فەرمووی (مع الغلام عقيقة) بەم شێوەیە دەبێت عەقیقە پێویستەسەرببرێت لەگەڵ لە دایك بوونی منداڵدا(لە حەوتەم ڕۆژدا بەپێی سونەت کە لەوبارەیەوە هاتووە).

**١) عن بريدة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال (كل مولود مرتهن بعقيقة) رواه الطبراني في المعجم الاوسط ٣٣٧٢ وعن سلمان بن عامر الصنبى قال قال رسول الله صلي الله عليه وسلم (كل مولود مرتهن بعقيقه فأهريقوا عنه دماً وأميطوا عنه الأذي)**رواه الطبراني في الكبير برقم ٦٢٠٣و٦٠٧٩ بلفظ مع الغلام عقيقة فأهريقوا عنه الدم و أميطوا عنه الأذي).

واتە(هەموو منداڵێك بارمتەو بەندە بە عەقیقەکەیەوە واتە بەستراو و پەیوەستە بە ئەنجام دانی عەقیقە بۆی کە کرا ئازاد دەبێت.

**بۆ تەفیسیری ئەمەش چەند ڕایەکی جیاواز هەن لەوانە:**

أ)ئیمامی احمد دەفەرموێت بەند و قەدەغەکراوە لە تکاکردن بۆ دایك و باوکی ئەگەر بەمنداڵی مرد تاوەکو ئەوەی بۆ دەکرێت.

ب) عەقیقە منداڵ ڕزگار دەکات لە دەستی شەیتان و ڕزگاری دەبێت لەوکۆت و بەندەی شەیتان بۆ هەوڵدان بۆ بەرژەوەندیەکانی دوا رۆژی وەك ابن القیم و کەسانی تریش دەفەرموون.

ج) منداڵێك ئەگەر عەقیقەو سەرتاشینی بۆ نەکرێت گەشە ناکات وەك نمونە و هاوشێوەکانی خۆی بڕوانە تحفة المحتاج في شرح المنهاج وە تحفة الحبيب علي شرح الخطيب للبجيرمي.

**٣) عن الحسن بن السمرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال كل مولود مرتهن بعقيقه يذبح عنه بدم يوم سابِعهِ ويسمي ويحلق)**المعجم الكبير للطبراني ٦٩٣١ . **واتە (هەموو منداڵکی لە دایك بوو بارمتەو بەندە بە کردنی عەقیقەکەیەوە کە رۆژی حەوتەم بۆی سەردەبرێت وە لە هەمان رۆژدا ناوی لێدەنرێت و سەری دەتاشرێت.**

**٤) كل مولود مرتهن بعقيقته تذبح عنه يوم سابعه)**رواه الترمذي ١٥٢٢ و ابن ماجه ٣١٦٥ و أصله في البخاري ٥٤٧١ و٥٤٧٢.

**٥) عن علي رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم عق عن الحسن بكبش وقال يا فاطمة احلقي رأسه وتصدقي بزنه شعره فضة)** رواه الترمذي.

ئەمانە ئەو فەرمودانەی کە لەم مەسەلەیەدا ئەصلن دەبینی هیچ فەرمووده و گۆ و ریوایەتێك باسی ئەوەی تێدا نیە باسی لەچاکێتی کوڕبەسەر کچدا بکات لە سەر برینی حەیوانی گوێزەبانە کەوابوو هەندێ لە زانایان دەیڵێن تەنها ڕاو بۆ چونێکە بو نیادیان ناوە لەسەر ئەوەی کە عەقیقە کارێکە مەبەست پێی:

(١) خۆشی دەربڕینە.

(٢) سوپاسکردنی خوایە.

(٣) ئاشکراکردنی خزمایەتی و پەیوەندی نێوان منداڵ و باوك و دایکێتی.

(٤) ئاشکراکردنی پلەوپایەی کورانە وەك ئەم زانایانە وتویانە

١) الشيرازي لە مهذب دا ئەڵێ (ولأ نها إنما شرع للسرور بالمولود و السرور بالغلام أكثر مكان الذبح عنه أكثر).

واتە(عەقیقە تەنها بۆ خۆشی دەربڕینە بە بوونی منداڵەکە وە دڵخۆش بوونیش بە کوڕ زۆرترە بۆیە سەربڕین بۆی زیاترە.

وەڵاممان بۆ ئـەم وتەیـە ئەوەیـە كـوا بەڵگـە كـە هۆكـاری سـەربڕینی ئاژەڵ بۆ منداڵ خۆشی دەربڕینە لە كاتیكدا ئەگەر مرۆڤەكانیش رازی بـن بـە كچ و كوڕیش وەڕقیان لە كچان نـەبێت بـەڵام ئەگـەر كـوڕان بێـت زیـاتر پێـی دڵخۆش بن ئـەوە نـازانم هـیچ بەڵگەیـەك لەسـەر حـەرامێتی هـەبێت وە نـاخ و فیترەتـی زۆرینەی خەڵك وایە بۆ نمونە ئەگەر خێزانێك هیچ منداڵێكیان نـەبێت لە دوای چەندین ساڵ ڕازی دەبـن كـە تـەنها كچـیان هـەبێت هـەروەها ئەگـەر خێزانیك چەندین كچیان هەبێت هەربەتەمای كوڕێكن چونكە بە هۆی ئـەوەوە ڕەچەڵەكی پیاوەكـە دەمێنێـت ،بـەڵام ئـەوەی بـە جـەزم بڵێـت ئـەم حوكمـە تەشـریع كـراوە لەبەرفلاّنـە (علـە) و هۆكـار ئـەوە پێویسـتی بـە بەڵگـە هەیـە ئەوەش بزانە (علە)ی حوكمەكان بەسێ شێوە دەدۆزرێتەوە

١) قورئان و سونەت

٢) ئیجماع

٣) دەرهێنان (الاستنباط) ی زانایان

كە جۆری سێ یەمیان جێگەی خیلافی زانایانە ئەوانـەی قیـاس جـیگیر دەكەن و ئەوانەی نەفی دەكەن بەڵام جۆری یەكەم و دووەم زۆرینـەی ئەانـەی

قیاسیش نەفی دەکەن باوەریان پێان هەیە ئەوەش بزانە جۆری یەکەم دەبێت

بە دوو بەشەوە:

**بەشی یەکەم**: بە ڕاشکاوانە باسکردنی عیللە وەك ﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لأَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ النساء **١٦٥** دەبینی عیللە لە ناردنی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت لە لایەن خواوە جلە جلالە بریتیە لە ﴿لأَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾

واتە بۆ ئەوەی خەڵکی لە دوای ناردنی پێغەمبەران هیچ بیانویەکیان نەبێت بە سەر خواوە

**بەشی دووەم** / ئاگاداری لەسەر هەبوونی عیللە (التنبيه على العلة) ئەمەش بەچەند دەستەواژەیەك دەکرێت وە لە أصول دا هاتووە یەکێك لەوانە بریتیەیە لە وصف يعقبة حكم مقترن بالفاء واتە وەسفێك حوکمێکی بەدوادابێت بەسترابێت بە پیتی (فا)ەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ﴾ البقرة **٢٢٢**

وەسفەکە کە عیللەی حوکمەکەیە بریتیە (أَذًى) حوکمەکەش بەستراوە بە (فا)ەوە بریتیە لە (فَاعْتَزِلُوا).

کە ئەم مەسەلەی خۆمان لە خزمەتی داین لەم جۆرەیە کە ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە (الغلام مرتهن بعقيقه فأهريقوا عنه الدم و أزيلو عنه الأذى)رواه البخاري

وەسفەکە لێرەدا کەعیللەی حوکمەکەیە بریتیە لە (مرتهن بعقيقتة) حوکمەکەش بەستراوە بە (فا)ەوە بریتیە لە (فأهريقوا) وە أزيلو عنه.

بەمەش دەتوانین بڵێین ئەوەی کە لە مهذب دا هاتووە وانیە کە دەڵێن تەنها لەبەر خۆشی دەربرینە.

٢/ شيخ عبد الرحمن ناصر السعدي لە ارشاد أولى البصائر والالباب لنيل الفقة ج١ لاپەرە ٩٢٥ ئەڵێ :

(وأما العقيقة عن المولود فشرعت شكراً لله تعالى على نعمة على العبد بحصول الولد و ضوعف الذكر على الانثى أو لإظهار المزيه ولأنَ النعمة به أتم والسروربه أوفر وتفاؤلاَ بانَ هذه العقيقة فادية للمولود من أنواع الشرور و إدلال على الكريم برجاء هذا المقصد وتتميماً لأخلاق المولود).

کورتەی ئەم مەسەلەیەش ئەوەیە کە ئەم حوکمە تەشریع کراوە لەبەر سوپاسکردنی خوای گەورە لەسەر بەخشینی ئەم نیعمەتەیە وە بۆ کوڕیش

دوو حـەیوان دانـراوە بـۆ دەرخسـتنی جیـاوازی نێـوان کـوڕو کـچ وە چـونکە نیعمەتی پێدانی کـوڕ تـەواو تروخۆشـی بـۆ کردنـی زیـاترە دە بـۆ گەیشـتنی بــەوەی ئــەم عەقیقەیــە خراپــەکان لەســەر لــە دایکبووەکــە نــەهێڵێ وە.....هتـد).دەبینی لـەم قسـانەدا تـەنها ئـەو بڕگەیـە بەڵگـەی لەسـەرە کـە دەفەرموێت (عەقیقە خراپەکان نەهێڵێ)

وەدرێژەی وەڵاممان بۆ ئەم قسانە هەمان وەڵامی خاڵی یەکەمە.

[3]) شیخ زکریا الانصاري لە (أسني المطالب في شـرح روض الطالـب دا ئەڵێ و المعني فية إظهار —البشرية والنعمة ونشر النسب....)

واتــە مەبەســت و مانــای ئەنجامــدانی (عقیقــة)دەرخســتنی خۆشــی ونیعمەتی منداڵ پێبەخشین و پەخش کردنی خزمایەتی و نـەژاد و ڕەچـەڵەکە لە ڕاستیدا ئەمانەش بە فەرمودەکاندا نە هاتوون ئەوەندە هەیـە بلـێن ئەگـەر ئەوسودانەش هەیە بەڵام ناتوانرێ بگوترێ عیللە و هۆکاری حوکمن.

[4] ) المناوي لە (الفیض القدیر) دا لە پێشەوا شافعی دەگێڕێتەوە (والشافعي ندب ذبـح شـاتین عـن الـذکر إظهـاراً لشـرفه وإبانـة لمحلـه لـذا فضـل بـه علـی الانثی...).

واتە(پێشەوا شافعی سەربڕینی دوو حەیوانی بۆ کوڕ بە سونەت داناوە لەبەر چاکێتی پلەوپایەی کوڕبەسەر کچ ەوەلە راستیدا ئەم قسەیە هیچ بەڵگەیەکی لە فەرموودەکاندا تیانیە.

لە کۆتاییدا دەرکەوت لەم فەرموودانەدا باس لە جیاوازی نێوان کوڕو کچ نەکراوە وە سەربڕینی دوو حەیوانیش بۆ کوڕان بۆ چاکێتی خودی کوران نیە بەسەر کچانەوە.

وە ئەگەر لای دایکان و باوکانیش هەبێت لەبەر پێوستی ژیان و مانەوەی نەژاد و هێزو...هتد ئەمانە ناکاتە ئەوەی جیاوازی لە نێوان خودی منداڵەکان هەبێت بۆیە کۆتای وەڵامەکەم بەوە دێنم کە کوڕان پێویستیانبە سەربڕینی دوو حەیوان هەیە بۆ ڕزگار بوونیان لەو بەندەی کە باسکراوە وە کچانیش پێویستیان بەیەك حەیوان هەیە.

وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه وسلم.

**٢٢٥ / باشە بۆچی خوای گەورە لە قورئاندا ژمارەی (أصحاب الكهف)ی دیاری نەکردوە ئەڵێن گوایە ئەمە دەلیلە لەسەر ئەوەی کە قورئان هی خوا گیان نیە هی کەسێکە کە ئەو شتە غەیبیانە نازانێت.**

**وەڵام :** بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

پێشەکی نابێ پرسیار بکرێت بۆچی خوای گەورە دیاری نەکردوە چونکە دەفەرموێ: ﴿لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ واتە: پرسیاری لێ ناکرێت بۆچی ئەوە دەکات لە کاتێکدا ئەوان پرسیاریان لێدەکرێت دەربارەی ئەوەی دەیکەن.

بەڵام دەکرێ بگوترێ ئایا حیکمەتی زانراو هەیە لە باسنەکردنی ژمارەی هاوەڵانی ئەشکەوت لە وەڵامدا بەڵێ وانەیەکی پەروەدەیی فێردەبین لەم بەسەرهاتە کە ناوەڕۆکی چیرۆکەکان مەبەستن و ئادەمیزاد کەڵکیان لێ وەردەگرن نەك شتە ڕوکەش و لاوەکیەکان لە ڕاستی دا ئەگەر ژمارەی هاوەڵانی ئەشکەوت پێنج بن یان شەش یان حەوت هیچ لە ئەسڵی چیرۆکەکە ناگۆڕێت وە ناویان بزانرێت یان نا وە ڕەنگی سەگەکەیان بزانرێت یان نا هیچ

لـە مەسـەلەکە ناگۆڕێـت جـا خـوای گـەورە لـە گـەڵ باسـکردنی چـیرۆکەکە ئەوەشی فێرکردووین کە خەڵکانی پێش ئێمە گرنی بە شتی لاوەکی ئـەدەن و جیـاوازی دروسـت ئەکـەن وە لـە حەقیقـەتی ژمارەکـەش زانـا نـین بەڵکـە لـە خۆیانەوە قسە دەکەن وەك خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿رَجْماً بِالْغَيْبِ﴾ واتـە: هەروەها بەنەزانیەوە قسە دەکەن.

بەڵام خوای گەورە ژمارەکەیان دەزانێت و دەفـەرموێت: ﴿مَا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾

کەواتە خۆی دەیزانێت و ئەو زانیاریەشی داوە بە هەندێك لە خەڵکی.

بۆیە ابن عباس رضي الله عنه دەڵێ من لەوانەم کە دەیزانن ژمارەیـان حەوت کەس بووە کەوا بوو ئەگەر زانـرا شـتێکی باشـە بـەڵام خۆمـانی پێـوە سـەرقاڵ ناکـەین وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿فَلا تُمَارِ فِيهِمْ إِلاَّ مِرَاءً ظَاهِراً﴾

واتە: لە موجادەلـە لـە دیـاری کرنیـان مەکـە مەگـەر ڕوکـەش نەبێـت کەتەنها بڵێیت وا نیە کە ئێوە دەڵێن ئەمەش بەڵگە لەسەر ئـەوەی کـە گرنـی بە شتی لاوەکی نەدرێت لەبەسەرهات و چیرۆکەکاندا.

وە بڕگەی دووەمی پرسیارەکە [ **کە گوایە ئەمە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلامی خوا نیە**] ئەڵێم: نەخێر وا نیە چونکە خوای گەورە چیرۆکەکە لە سەر زمانی ئادەمیزادەوە دەگێڕێتەوە وە بەڕاشکاوی ئەفەرموێت: ﴿قُلْ رَبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِمْ﴾

واتە خوای گەورە لە هەموو کەس باشتر ژمارەیان دەزانێ ئەوەندە هەیە بڵێین حیکمەت لە باسنەکردنی ژمارەیان لە لایەن خوای گەورەوە چیە؟ ئەمەش وەك باسمان کرد لەبەر ئەوەیە کە قورئان وریا کردنەوەیەکی داوە بە خەڵکی کە جیاوازی لە شتی وا دروست نەکەن لەبەر ئەوەی خەڵکی ڕابهێنێت لەسەر واز هێنان لەو شتانەی کە سوودی بۆ دونیاو ئاینی خەڵك تیادا نیە هەرچەندە ئاماژەی کردوە بە ژمارەکەیان چونکە ڕا جیاوازەکانی باس کردوە کە سێ ڕای جیاوازن بۆ دوانیان دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُونَ ثَلاثَةٌ رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْماً بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾

لە سێیەمدا هیچ ناڵێ وەك دەفەرموێ:

ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ژمارەیان حەوت کەس بووە جا نازانم ئەمە چۆن دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە قورئان هی خوا نیە بە

پێچەوانەوە چونکە قسەکانی ئەوانی ڕەد کردەوە و زانیاری تەواوی دایەتە پاڵ خۆی کەوابوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان هی خوایە نەك مرۆڤەکان.

لە کۆتایدا ئەڵێم وشەی خوا گیان بە کارنەهێرێت باشترە چونکە یەکێك لە ماناکانی ئەوەدەگەیەنێت کە خوا ڕوحی منە وە مانای تریش هەڵدەگرێت کە ڕوحم بە فیدای خوا بێت کەواتە دووربن لەم زاراوانە باشترە.خواش زاناترە.

# پاشکۆی ئەم کتێبەیە

## بریتی یە لە سەرجەم دیدار و

## چاوپێکەوتنەکانی

## بەڕێز ماﻣۆستا خلیل أحمد

## لەگەڵ گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا

# دیداری

## گۆڤاری ڕێگای شەرع

## لەگەڵ بەڕێز مامۆستا خلیل أحمد

سەلەفییەت چییەو بەکێ دەوترێ سەلەفی؟ بنەما سەرەکییەکانی سەلەفییەت چین؟ ئەو گرفتانە چین لەمەنهەج و دنیابینیی سەلەفییەتدا هەن؟ لەکوردستاندا سەلەفییەکان تا چەند بوونیان هەیە؟ بۆچی سەلەفییەکان دژایەتیی ئیسلامییەکانی تر دەکەن‌و دژی حزبایەتین؟ بۆچی ئیسلامییەکانی تر سەلەفییەکان بەدەستی دەسەڵات دەزانن؟ هەندێك لەسەلەفییەکان خۆپیشاندان بەحەرامدەزانن‌و سەرکردەکانی وڵاتانی موسوڵماننشین بە(وەلی ئەمر) دادەنێن‌و پێیانوایە نابێت دژایەتییان بکرێ، ئایا ئەم کارانەی سەلەفییەکان جۆرێك نیین لەبیدعە، چونکە ئەمەیش بریتییە لەدۆستایەتیکردنی دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان‌و دژایەتیکردنی

موسوڵمانان؟ ئەمانەو چەندین پرسیاریتر لەم دیدارەدا ئاڕاستەی بەڕێز مامۆستا خەلیل ئەحمەد" کەسایەتیی دیاری نێو سەلەفییەکانی کەلار، کراوە ئەویش بەڕێزەوە وەڵامی پرسیارەکانی (ڕێگای شەرع)ی داوەتەوە.

**پرسیاری یەكەم : سەرەتا ئەگەر بتوانی پێناسەیەكی سەلەفیمان بۆ بكەیت ، وە بە كێ دەوترێت سەلەفی ؟ئایا سەلەفی لە كوردستاندا تا چەند بونیان هەیە؟**

**مامۆستا خليل أحمد**: بسم الله الرحمن الرحيم

سەلەفی بەو کەسە دەگوترێت شوێن کەوتەی پەیڕەوی سەلەف بێت ، ئەوەش بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان و سوننەت بەتێگەشتنی سەلەف (هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم و ئەوانەی دوای ئەوان و ئەوانەی دوای ئەوانیش ) هەروەك پرسیار کراوە لە لیژنەی هەمیشەیی فەتوای سعودی ژمارە (١٣٦١) (١٦٥/١)

س :ماهي السلفية ومارأيكم فيها ؟

ج: السلفية نسبة إلى السلف والسلف هم صحابة رسول الله صلى الله عليه وسلم وأئمة الهدى من أهل القرون الثلاثة الأولى رضي الله عنهم الذين شهد لهم رسول الله صلى الله عليه وسلم بالخير في قوله (خير الناس قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ثم يجيء أقوام تسبق شهادة أحدهم يمينه ويمينه شهادته) رواه أحمد والبخاري ومسلم والسلفيون جمع سلفي نسبة إلى السلف وقد تقدم معناه وهم الذين ساروا على منهاج السلف من اتباع الكتاب والسنة والدعوة إليهما فكانوا بذلك أهل السنة والجماعة , وبالله التوفيق وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

**پرسیار : سەلەفییەت چیە وەڕاتان چیە بەرامبەری ؟**

**وەڵام : سەلەفییەت نیسبەتە بۆ لای سەلەف وەسەلەفیش هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودان صلى الله عليه وسلم وەپێشەوایانی ڕێگای هیدایەتن لەسێ سەدەی یەکەم ڕەزای خوایان لەسەر بێت ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شایەتی خەیری بۆ داون لە فەرمودەی (چاکترینی خەڵك سەدەی منن پاشان ئەوانەی لە دوایان دێن پاشان ئەوانەی لەدوایان دێن پاشان قەومی وادێن کە شایەتیان پێش سوێندیان ئەکەوێ وەسوێندیان پێش شایەتییان , وەسەلەفییەکان : کۆی سەلەفی یە , نیسبەتە بۆ لای سەلەف وەماناکەی پێشتر کرا وەئەوان ئەوکەسانەن کە لەسەر مەنهەجی**

سەلەفن لە شوێن کەوتنی کیتاب و سوننەت وە بانگەوازکردن بۆیان وەکارکردن پێیان وە بەوەش بوون بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت) .

جا هەرکەسێك هەڵگری ئەو بەرنامەیە بێت لەبیرو باوەڕو وتەو کردەوە ئەوە سەلەفییە إن شاء الله وەلە کوردستاندا سوپاس بۆ خودا بونێکی بەرچاویان هەیەو سەرچاوەی زانستی شەرعی و بانگەوازن بۆ خواپەرستی و شوێن کەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان صلى الله عليه وسلم دور لەزیادەڕەوی وکورت ڕەوی وەخاوەنی چەندین مزگەوت ووتار خوێن و مامۆستا و کەسایەتی ناسراون .

**پرسیاری دووەم : بۆچی سەلەفیەکان دژایەتی ئیسلامیەکان دەکەن؟وە ئیسلامیەکان ئێوە بە پیاوی دەسەڵات ئەزانن بە حوکمی ئەوەی قەت لەسەر دەسەڵات قسە ناکەن .**

**مامۆستا خلیل أحمد**: نابێت دژایەتی موسڵمانان بکرێت بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ برایەتی دۆستایەتیان لەگەڵ بکرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ .

**وەپێغەمبەری خودا صلی اللّٰه علیه وسلم لە حەدیسی أبو هريره کە ئیمامی موسلیم ریوایەتی دەکات دەفەرموێت :** ((....لاَ تَحَاسَدُوا ، وَلاَ تَنَاجَشُوا ، وَلاَ تَبَاغَضُوا ، وَلاَ تَدَابَرُوا ، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَاناً ... الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ ، لاَ يَظْلِمُهُ ، وَلاَ يَخْذُلُهُ ، وَلاَ يَحْقِرُهُ ، التَّقْوَى هَا هُنَا وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ .))

مناجشة : **واتە : لە موزایەدا دا نرخ زیاد بکەیت ، وە مەبەستیش نەبێت ئەو شمەکە بکرێت .**

وَلاَ تَبَاغَضُوا: **واتە : ئەو هۆکارە مەگرنە بەر کە دەبێتە مایەی ڕقبونەوەتان لە یەکتر چ جای ڕق هەبوون لەیەکتر و دژایەتی کردنی ، وە ئەگەر شتێك لەوانە کەوتە دڵتانەوە ئەوە پێداگربن لەسەر نەهێشتن و ڕاماڵینی لە دڵەکانتاندا .**

وَلاَ تَدَابَرُوا: **واتە : پشت لەیەکتر مەکەن واتە : لە بیروڕاکانتاندا .**

**پێویستە موسڵمانان لەسەر ئەو فەرمودەیە ، و هاوشێوەکانی بڕۆن و هەنگاو هەڵگرن .**

بەڵام ئەوەندە هەیە ئێمە چۆن بایەخ بەم لایەنە گرنگە دەدەین پێویستە ئێمە و باقی موسڵمانانیش لایەنی دەست گرتن بەشەرعەوە ، و کارکردن بەتەواوی شەرع و سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرامۆش نەکەن خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ﴾ یان دەفەرموێت : ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ﴾ وە دەفەرموێت : ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾

**وة ثيَغةمبةرى خؤشةويستمان صلى الله علية وسلم دةفةرمويَت :** (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو ردّ ) رواه مسلم ، **وة دةفةرمويَت** : (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَراً فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسانِهِ، وإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ) رواه مسلم .

لە ڕوانگەی ئەم دەقانەی باسمان کردن و چەندین دەقی تریش پێویستە لە سنوری ئاینەکەماندا بوەستین و پێشێلکاری نەکەین ئەم هەڵوێستەش سەلەفەیەکان زۆر بایەخی پێدەدەن و لەسەری ڕادەوەستن ئەگینا مەبەستیان دژایەتی کردن نیە بەڵکو بە پێچەوانەوە مەبەستیان دڵسۆزی و تەکمیل کردنی موسڵمانانە ، وە عینوانی خەمخۆریانە بۆ دین و ژین و خەڵك و وڵاتیش ئەگینا هیچ

بەرژەوەندیەکی خۆیانی تێدا بەدی نایەت ئەی کوا بەرژەوەندی و دونیا خۆری ئەگەر تۆ بانگەشەی جیٚ بە جیٚ کردنی تەواوی تەوجیهات و تەعلیماتی ئیسلام تەنانەت بەسەر خۆشتدا بکەیت.

ئەو برِگەی کە لە پرسیارەکەدا هاتووە و دەڵێت : ئیسلامیەکان ئێوە بە پیاوی دەسەڵات ئەزانن....

لە وەڵامدا ئەڵێم نا وانیە هەموو ئیسلامیەکان سەلەفیەکان بە پیاوی دەسەڵات نازانن ئەوە لێدوانی چەند کەسێکی نا مەسئولە و حیساب بۆ قسەی خۆ نەکردووە و ئەو چەواشەکارییانە ئەنجام ئەدات ، ئەنجا ناکرێت و لە کوێی دونیا دا هەیە رِەوتێك هەمووی خۆفرۆش و بەکریٚ گیراو و پیاوی خەڵکی تر بێت ، وە نە دەسەڵاتیش پەکی کەوتووە لەبەر سەلەفییەکان ، هەروەها دەبێت دەرس لەوەش وەربگیرێت بۆ سەلەفیەکان ئیسلامیەکان تۆمەتبار ناکەن بە خۆفرۆش و پیاوی کەسانی تر هەمان ئیحتیمال واریدە لەسەر ئەوانیش بەڵام ئێمە هەڵس و کەوت بە ئادابە شەرعیەکان دەکەین ، وە بەریشین لەوەی نەیارەکانمان تەنها لەبەر ئەوەی نەیارمانن بەوانە تۆمەتبار بکات .

هەروەها ئەوانەی بەو شتانە تۆمەتبارمان دەکەن یان لە نزیکەوە نامانناسن یان پاڵنەرێکی خراپ کاری تێکردوون ئەو قسانە بکەن بەهەر حاڵ خوای گەورە لە هەموو لایەکمان ببورێت ».

ئەنجا قسەکردن لەسەر دەسەڵات ئێمە نایشارینەوە قسەکردنمان یان نەکردنمان بایەخی هەیە و بەنرخە هەروەها ئاسان نیە ئەگەر هەڵوێستمان هەبێت لە دەستنیشان کردنی هەڵە و کەم و کوڕی و حوکم بەسەر کاربەدەستاندا ، وە لەکاتی گونجاو و بەرژەوەندی شەرع ، و جەماوەری موسڵماناندا قسە دەکرێت ، نەك نانەوەی ئاشوب و فیتنە ، وە ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر لە تواناماندا هەبێت ، وە ئەگەر نا ئەوە بێدەنگ دەبین ، وە بێدەنگیشمان ئەوە ناگەیەنێت ئێمە شەریکین لە خراپەی هیچ خراپەکارێکدا بەڵام سیستمی شەرعیمان هەیە بۆ ئینکاری مونکەر لەوانەشە کەسانێك لە دابەزاندنی ئەو سیستمەدا جیاوازبن لەگەڵماندا ئەوە ئێمە مادام شتەکە ئیجتیهادی بێت ئەوە ناکەینە گرفت لەگەڵیاندا بەمەرجێك دەستەواژەی دژ بە دین دروست نەکەن .

**پرسیاری سیٚ یەم : ئێوەی سەلەفی زۆر جار لە برایەتی نێوان موسڵمانان ئەکەن بەڵام نابینین ئەم برایەتیەتان لەگەڵ ئیسلامیەکاندا هەبێت ؟ ئەی ئەوانیش هەر براتان نین وەکو لە فەرموودەدا هاتووە موسڵمان برای موسڵمانە؟**

**مامۆستا خلیل أحمد**: لە وەڵامی پرسیاری پێشوو دا وەڵام دراوەتەوە

**پرسیاری چوارەم : باس لەوە دەکرێت ئێوەی سەلەفی دژایەتی حزبایەتین کەچی خۆتان و بەرنامەکانتان هەمووی وەکو شێوەی حزب وایە ، وە خەڵکی کیٚ تایبەت بە خۆتان هەیە ، و ئەوانەشی لەگەڵتانن تەنها کتێبی مامۆستایانی خۆتانن بخوێننەوە واتە ئەبێت ببنە پیاوی خۆتان وە لە ژێر بیروبۆچونەکانتاندا بن ئەی ئەمەش جۆرێك نیە لە حزبایەتی ؟**

**مامۆستا خلیل أحمد**: بەڵیٚ ئێمە سیستمی حزبی سیاسی لە وڵاتی ئیسلامدا بەخراپ دەزانین و دژایەتیشمان کردووە ، وە بەدیلیشمان چەندین جار خستۆتە ڕوو ئەی مەگەر هەر دەستەواژەی حزبی سیاسی نیە تەواوی ئاین و نەتەوەو خاك و نیشتیمانی لاواز کردووە؟ هەر بەرژەوەندی تەسکی حزبی نیە ئەو هەموو ڕق وکینە و دژایەتی و

پارچە پارچەبونەی خاك و هێز و سامان و ئیدارەی لێکەوتوەتەوە؟ من نازانم براکوژی چ پاساوێکی هەیە؟ ئەگەر حزبایەتی نەبوایە موسڵمان موسڵمان بکوژێت ، کوردێك کوردێکی تر بکوژێت ، ئەگەر دەمارگیری کەس و لایەن و حیزب نەبێت چی وای کرد رۆحیان لەدەست بچێت؟

ئەی ئەگەر موسڵمانان بۆ نموونە واز لە حزبایەتی بێنن و کار بەم ئایەتە بکەن کە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ **وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا**﴾ ئایا کارێکی خراپیان ئەنجام داوە؟ یان ئەگەر هەموو کوردێك رابیتەی کوردایەتی پێکەوە بیانبەستێتەوە ، و واز لە حیزبایەتی بێنن ئەوە لە دیدی کەسێکی کورددا ئایا کارێکی خراپیان کردووە؟ هەروەها کەس و لایەنەکانی تریش .

بۆ ئەوەی کە ئێمە بەرنامەکانمان وەك حیزبە من بە دوو خاڵ وەڵامی دەدەمەوە :

یەکەم : پێناسەی حیزبی سیاسی لە فەرهەنگی سیاسەتدا پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە کە بەکورتی ئەمە پوختەکەیەتی (کۆبونەوەی

کەسانێك لەسەر شێوازی ڕێکخستنی هەرەمی و بونی پەیڕەوی داخلی و خارجی بۆ هەوڵدان بۆ چونە سەر حوکم).

ئەگەر ئەم پوختەیە تاقی بکەینەوە بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان و کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان و باقی پارتە سیاسیەکانی تر ئەوا دەبینی ئەمانە حیزبی سیاسین و تەواوی بەندەکانی ناو پێناسەکە دەیانگرێتەوە ، بەڵام ئەگەر بێن زانکۆی سەلاحەدین و زانکۆی سلێمانی و تەواوی خوێندنگاکان و ڕێکخراوە مەدەنیەکان و کارگە و ....هتد بەراورد بکەین لەگەڵ ئەو پێناسەیەی سەرەوەدا نابینی نە هەموو بەندەکانی تیا بێت ، وە نە کەسیش پێیان دەڵێت حزبی سیاسی جا من نازانم ئەبێت فەلسەفەی سەلەفیەکان چی بێت ئەگەر حیزب بن و خۆیان فیکری بونی حیزب –ساڵەهای ساڵە– ڕەدکەنەوە، وەهەروەها ئەبێ لەچی بترسن ئەو هەموو موجازەفەیە بکەن یان چەواشەکاران کەسانێکن ناتوانن ڕای بەرامبەر قەبوڵ بکەن.

دووەم : مەرج نیە هەندێ خاڵ و بەندی ناو پێناسەکە لەهەر کۆمەڵە کەس و ڕەوتێکدا هەبوو ئەوە بە حیزبی سیاسی حساب بکرێت وەك باسمان کرد بۆ نموونە زانکۆی سەلاحەدین لەڕوی ژمارەوە و سیستم

و بەڕێوە بردنەوە لە هەندێ حیزبی ناوچەکە تۆکمە و بەهێزترە تا ئێستاش کەسێك دەمارگیری حیزبی نەبووە بۆی ، یان چەندین کەسی ناو حیزبە ئیسلامیەکان ئەگەر پرسیاری لێ بکەیت کاکە ئایا دەتوانیت بڵێیت من سەلەفی نیم مەگەر لەسەر مەنهەجی سەلەف نەبێت ئەگینا ناتوانێت بڵێت من سەلەفی نیم بەڵام ئەگەر پرسیار لە هەر سەلەفییەك بکەیت ئایا تۆ یەکگرتوویت یان کۆمەڵیت خێرا پێت دەڵێت نەخێر هەرگیز واجبیش نیە من ئەوانە بم ، کەوا بوو بازنەی سەلەفیەت بازنەی مەزهەبی ئاینی یە و دەستەواژەی حیزبی سیاسی نیە ئەمەش زۆر ڕون و ئاشکرایە .

جا بۆ ئەوەی کە دەڵێ ﴿خەڵکی خۆتان هەیە کتێبی خۆتان دەخوێنێتەوە.....﴾ ئەمە قەدەغە و بڤە نیە ئێمە کەحیزب نین بەڵام مەزهەب و تاقمێکین پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی ئەوەی پێداوین کە موسڵمانان بەش بەش دەبن بۆ چەندین تاقم و مەزهەبەوە ، وە ئەوەی لە کۆی ئەو هەموو تاقمانە لەسەر حەق بێت تەنها برتیە لە ﴿الطائفة المنصورة﴾ ﴿الفرقة الناجية﴾ مەبەستیشم ئەوە نیە تەنها لە کوردستانن یان تەنها قوتابیەکانی مامۆستا فڵان و

فیسارن یان لەناوچەی فڵان و فڵان بەڵام یەك بیروبۆچون و مەنهەجیان هەیە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا دا .

جا هەبونی خەڵك و کتێبی تایبەت بە تاقم و ڕەوتێك جیاوازە لە هەبوونی حیزبی سیاسی بۆ نموونە کورد وەك نەتەوە بگرە بادینی و سۆرانی خەڵك و تاکی خۆیان و کتێب و پێداویستی تایبەتیان هەیە نە کورد و نە بادینی و سۆرانیش حیزبن ، وەڵلاهی زۆر سەرم سوڕ دەمێنی لەم شوبهانە بەڵام وەك ئەمانەت هەر وەڵامیان دەدەمەوە یەکەم : واجبمە دووەم : کەسانێك بەداخەوە کار لەسەر ئەم چەواشەکاریانە دەکەن.

**پرسیاری پێنجەم : هەست بەوە دەکرێت سەلەفیەکان چەند باڵێکیان هەیە ، و لەناو یەکدا ڕق و کینەتان بەرامبەر یەکتر هەیە بۆ نمونە هەندێك لەسەفیەکان ڕقیان لە مەلا جاسمی سەلەفی و باڵەکەیەتی لەبەر ئەوەی مەلا جاسم وەکو بیروبۆچونەکانی ئێوە نیە ئەم دژایەتی و بوغزاندنە لە کوێی دیندا جێگەی ئەبێتەوە ؟**

**مامۆستا خلیل أحمد** : سەلەفیەکان وەك باقی خەڵکی تر مرۆڤن و کەم و کوڕی لە تاکەکانیاندا هەیە ، وە لەوانەیە جیاوازی و دەمارگیری و

نەزانی کەسێکیان وا بکات لەگەڵ ئەوی تر جیاواز بێت ئەمە ئەگەر قەبوڵ نیە و موخالەفەی شەرعە بەڵام هیچ کەس لە سەلەفیەکان بە حەڵاڵی نازانن و بەدەستەواژەی کار کردن بۆ ئیسلامی نازانن ، وە تا ئێستا باڵ و ڕەوتی جیاوازی زەق لە ناو سەلەفیەکاندا دروست نەبووە ، وە ئەگەریش بێت لە دوو خاڵ بەدەر نیە یان سەلەفی نیە و بەناو سەلەفیەتەوە کار دەکات یان هەر بە واقیعی کەس و ڕەوتێکی توشبووە بە دەمارگیری و ڕق و کینە و بە جیاواز لە باقی سەلەفیەکانی تر لەڕاو بۆچونی دا لەبەر هەواو ئارەزووی ، مەبەستیشم ئەوە نیە بڵێم دەبێت هەموو سەلەفیەك لە ورد و درشتدا فەتواکانیان وەك یەك وابێت نەخێر مەبەست ئەوەیە لە شتە گشتی یەکاندا یەك مەنهەجیان هەبێت .

بۆ ئەو بڕگەیەی کە باسی مەلا جاسمی تێدا کراوە کە ڕەوتێکی هەیە و سەلەفیەکان ڕقیان لێ یەتی ...

من دەڵێم مەلاجاسم تا چەند ساڵێك لەمەو پێش تێکەڵاوی لەگەڵ سەلەفیەکاندا هەبووە بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا لەگەڵ هەموو سەلەفیەکاندا تێکەڵاوی نیە و لەوانەیە ئەمە کاری کردبێتە سەر ئەوەی خەڵکی وابزانن باڵێکی سەلەفی جیاوازە لەگەڵ ئەوانی تر ، وە

من واشنازانم سەلەفیەکان بوغزاندنی بەرنامە بۆ داڕێژراویان هەبێت بۆ مەلا جاسم و حەزیش ناکەن هیچ کەسیٚ لە موسڵمانان لەدەست بدەن .

**پرسیاری شەشەم : ئەگەر سەیرێکی ژیانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بکەین هەمیشە دژی ستەمکار و زاڵمان و پیاوخراپەکان وەستاوەتەوە ، وە هەمیشە قسەی حەقی کردووە بۆچی ئێوە خوێنی دەیان گەنج لە خۆپیشانەکاندا شەهید و بریندار کران کەچی نەمانبینی ئێوە ورتەتان لە دەم بێتە دەرەوە تەنانەت لە لایەن هەندێك لەسەلەفییەکانەوە خۆپیشاندانیش حەرام ئەکەن ئایا ئەم کارانەی ئێوە دەلالەت لەوە ناکات ئێوە پیاوی دەسەڵاتن.**

**مامۆستا خلیل أحمد** : ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیەوسلم تەنها شەڕکردن و بەگژدا چونی زاڵمان نەبووە بەڵکو سەبر و ئارام گرتن و لێبوردنیشی تیا بووە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿**أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ**﴾ وە ﴿**فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**﴾ ( **أَمْرِهِ** ) واتە : **القتال** .

یان ﴿لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُسَيْطِرٍ﴾ و ﴿وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾

مەبەستیشم ئەوە نیە سەردەم سەردەمی مەککەیە و قیتال و جیهاد نیە لە ئیسلام دا بەڵام ئەمەویت ئەو شوبهەیە بڕەوێنمەوە کە دەگوترێت سیرەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەمیشە دژی ستەمکار و زاڵمان و پیاوخراپەکان بووە ، ئەوەندە هەیە ئێمە هاوڕا نین لەگەڵ هیچ زاڵمێك دەسەڵاتدار بێت یان بێ دەسەڵات ئەنجا مەسەلەی خۆپیشاندان ئێمە بەدەستەواژەیەکی شەرعی نازانین ، وە بەڕاشکاوانە چەندین جار باسمانکردووە ئەمەش مانای ئەوە نیە دەسەڵات لەسەر حەقە و هیچ گەندەڵیەکی نیە ، وە ئۆپۆزسیۆن و خەڵکیش خاوەنی هیچ داوایەکی ڕەوا نین ، نا وانیە بەڵکو ئێمە باوەڕمان وایە ئەوە بە ئیعلامی بونیاد نەر و کۆڕ و کۆبونەوەو چەندین کۆنفرانسی زانایانی پسپۆڕ چارەسەر دەکرێت .

ئەنجا هەڵوێستمان بەرامبەر کوشتن و بریندار کردن و ئەزیەت دانی خەڵك چ خۆپیشاندەر بێت یان دەسەڵات زۆر ڕون و ئاشکرایە ئێمە لە هەموو ڕێنمایەکانمان ئەوە بڵاودەکەینەوە کە ڕێز لەیەکتر بگیرێت و حیوار و نەصیحەت و دیالۆك بکرێت ، وە بەرژەوەندی یە گشتیەکان لەبەر چاو بگیرێت ، وەئایا ئەگەر ئێمە خۆپیشاندانمان بەحەرام زانی

بۆ ئەبێ پیاوی دەسەڵات بین ئەی بۆ ئەوە نەکات کە دڵسۆزی ڕۆڵەکانی خۆمان بین؟ یان دانا بین بە حاڵی ڕژێمەکان و گۆڕانکاری لە کاتێکیشدا دەسەڵات خۆی باوەڕی بەخۆپیشاندان هەیە ئێمە تەنها ڕێنمایەکانی ئاینەکەمان وامان لێ دەکات باوەڕمان پێی نەبێت ئەگینا ئەوان ئامۆزامان نین و ئۆپۆزسیۆن خاڵۆزا .

**پرسیاری حەوتەم : ئێوە ئەڵێن شوێنکەوتەی سەلەفی ساڵحین بەلاَم لەگەڵ سەلەفی ئاسمان و ڕێسمانتان فەرقە بە بەڵگەی ئەوەی ئەبینن لەگەڵ موسڵمانان کەسێکی زینا کەرتان پێ باشترە لە بانگخوازێك ئەمە لە برێك فەتوای سەلەفیەکان هەیە ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو بانگخوازە حزبیە یان لەگەڵ نەهج و بەرنامەی ئێوەدا نیە ئەم حوکمدانە بەسەر کەسێکی بانگخواز بە چی بەڵگەیەکە؟**

**مامۆستا خلیل أحمد** : ئێمە بە بێ گومان خۆمان بەسەلەفی دەزانین و هیچ جیاوازیەکیش لە نێوان سەلەفیەکاندا بە شێوەیەکی گشتی و سەلەفیەتیشدا بەشێوەیەکی گشتی نازانین بۆیە دەڵێم بەشێوەیەکی گشتی چونکە ئەمە عەدل و ئینسافە لەبەر ئەوەی پێویست نیە مرۆڤ (١٠٠٪) سەد لە سەد سەلەفی بێت ئەوجار پێی بگوترێت سەلەفی چونکە سەلەفیەت مەنهەجە ، وە هیچ جیاوازییەکی لەم ڕووەوە لەگەڵ

ئیسلامدا نیە وەك ئەوەی ئەگەر كەسێك لە هەندێ شتدا پێچەوانەی ئیسلامیش بوو لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە ، سەلەفیەتیش بەهەمان شێوە، ئەنجا كەسێك كە پرسیار دەكات دەبێت ئامانجی وەرگرتنی وەڵام بێت نەك حوكم دان بەسەر بەرامبەردا ئەگەر ئاسمان و ڕێسمانمان فەرقە ئیتر پرسیار بۆچی؟

ئەنجا بۆ شێتێكیش ئەڵێت زیناكەرێكی پیسی تاوانبار باشترە لە بانگخوازێكی پاكی بێ ئینحراف و هەڵە؟ نەخێر بەڵكو مەسەلەكە چەواشەكردن و گەورە كردنەوەی ئەم شتانەیە تا خەڵكی سادەی پێ هەڵخەڵەتێن ئەگینا من پرسیارێك دەكەم ئایا هەموو بانگخوازێك بۆ ئیسلام و سوننەت بە -گومانی خۆی - موسڵمان و سوننیە؟ نەخێر نموونەی قادیانی و جەهمی و قەدەریی و جەبری و موعتەزیلە و ئەشعەریەكان دێنمەوە ئەگەر كەسێك بڵێت زیناكەرێكی سەلەفی (سوننی) باشترە لە موبتەدیعێك ئایا ئەو قسەیە هیچی تێدایە؟ لەكاتێكدا ئیمامی ئەوزاعی دەفەرموێت : "پێم خۆشترە كوڕەكەم هاوەڵی جەردە و دزێكی سوننی بكات نەك هاوەڵیی خواپەرستێكی موبتەدیع" رواه اللالكائي في شرح اصول الاعتقاد .

وه پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت : " بەندەکانی خودا بەهەر تاوانێکەوە بگەنەوە بەخوای گەورە شیرک نەبێت ئاسانترە لە هەواو ئارەزوو (بیدعە)" أخرجة البيهقي في الاعتقاد .

وه ئیمامی بەربەهاری لە (شرح السنة) دا دەفەرموێت : " وإذا رأيت الرجل من أهل السنة رديء الطريق والمذهب فاسقا فاجرا صاحب معاص ضالا وهو على السنة، فاصحبه واجلس معه فإنه ليس يضرك معصيته، وإذا رأيت الرجل مجتهدا في العبادة متقشفا محترقا بالعبادة صاحب هوى، فلا تجالسه ولا تقعد معه ولا تسمع كلامه ولا تمش معه في طريق، فإني لا آمن أن تستحلي طريقته فتهلك معه "

هەروەها بەربەهاری ئەفەرموێ : یونسی کوڕی عوبێد کوڕەکەی بینوە لای کەسێکی موبتەدیعەوە دەرچووە پێی گوتووە " يا بني! لأن أراك خرجت من بيت خنثى أحب إلي من أن أراك تخرج من بيت فلان وفلان، ولأن تلقى الله يا بني! زانياً فاسقاً سارقاً خائناً أحب إلي من أن تلقاه بقول فلان وفلان. " أخرجه ابو نعيم في الحلية والخطيب في تأريخ بغداد وابن بطة في الإنابة الكبرى والآجري في الشريعة نحوه واسناده صحيح .

ئەوە دەمێنێ ئەوە بڵێین ئایا ئیسلامیەکان هەموویان سەلەفین بێ گومان نەخێر لە کاتێکدا لەسەرکردەکانیانەوە چەندین قسە و بیروباوەڕی ناقوڵا دەبیستین .

لەوانەیە کەسێك بڵێت تەنها بەوەی لە حیزبدا بوو خراپترە لەزینا کارێك لە وەڵامدا دەڵێم حوکمی وا بەسەر تاکە دیاری کراوەکاندا هەڵەیە ، و نابێت بەهیچ کەسێك بگوترێت مەگەر کەسەکە بە دیاری کراوی حوکمی موبتەدیعی بەسەردا درابێت ئەوکاتە ئەو قسانەی زانایان دەیگرێتەوە ، کەوا بوو کاتێك حوکمێك بەڕەها باس دەکرێت جیاوازە لەوەی بە تعیین کەسەکە دیاری بکرێت جا بۆ دیاری کردنی کەسەکە دەبێت اسباب هەبێت وە (موانع) یش نەبێت .

**پرسیاری هەشتەم : ئێوە چەمکی سەلەفیتان بەسەر خۆتاندا بڕیوە لەبەرامبەریشدا بەناوی بیدعەوە دژایەتی چەندین چەمکی دیکە دەکەن ئایا بڕینی چەمکی سەلەفی و بڕینی بەسەر خۆتاندا جۆرێك نیە لە بیدعە؟**

**مامۆستا خلیل أحمد :** ئێمە مافی خۆمانە پێشبڕکێ بکەین بۆ سەلەفی بونمان و چەمکی سەلەفی بۆ خۆمان بەکار بهێنین بەڵام هیچ ڕێگرییەکمان نیە لە هیچ کەسێك مونافەسەی سەلەفی بونی خۆی

بکات و ئەو ناوە بەکار بهێنێت بۆ خۆی بە مەرجێك لەسەر ئەو ڕێڕەوە لا نەدات و شتی تازە نەهێنێتە ناو دین و لە وکێشمەن کێشەشدا زانستی شەرعی بەپێی تێگەیشتنی هاوەڵان حاکمە و زانایانی متمانە پێکراوی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

وە هەر شت و چەمکێکیش ئێمە بە بیدعە لە قەڵەممان دابێت یان لە مەو لا بە بیدعە هەژماری بکەین ئەوە لێکۆڵینەوە و زانستی شەرعی حاکمە لە نێوانماندا هەرچەندە گومانی خێرمان بۆ خۆمان و موسڵمانانیش هەیە تەنها ئەوەندە هەیە تا زیاتر زانستی شەرعی بەکار بهێنین لە یەکتر نزیك دەبینەوە ،وە ناوی سەلەفی بیدعە نیە هەر وەك ناوی سوننی وایە بەبێ زیاد و کەم.

پرسیاری نۆیەم : بۆچی پێتان وایە خۆپیشاندانی ئاشتیانە بۆ گۆڕینی زوڵم و ستەم و تاغوتەکان بە لاتانەوە حەرامە ، و تەنانەت ئێوە ئەڵێن سەرکردەکان وەلی ئەمرن بۆ موسڵمانان و نابێت لە دژیان بوەستینەوە کەچی ژیانی پێغەمبەر و سەحابە و سالحان دژایەتی کردنی دەسەڵاتی زاڵم و ستەمکاریان کردوە ئەم کارانەی ئێوەش جۆرێك نیە لە بیدعە؟ئەویش وەلائە بۆ دەسەڵاتێکی ستەمکار و بەرائە لە موسڵمانان.

**مامۆستا خلیل أحمد** :خۆپیشاندان بە ڕەوا نازانین چونکە بەدەر لە وەی کێشەو ئاشوبی لێ دەکەوێتەوە بۆ وڵات هەروەها دەستەواژەیەك نیە لە نێوان موسڵماناندا کاری پێکرابێت بۆ گۆڕینی حوکم ، وە ئەگەر تەماشای کتێب و سەرچاوەکانی زانست بکەین شتێك نابینین بە ناوی خۆپیشاندانەوە ، ئنجا ئێمە بە دیراساتمان بۆ بارودۆخی ناوچەکە دەزانین ئەم خۆپیشاندانانە بەرنامەی دەرەکی لە پشتەوە هەیە بۆ هەندێ وڵات بە OK بۆ هەندێکی تر بە NO, وە ئایا سەرکردەکان وەلی ئەمرن بۆ موسڵمانان یان نا؟ ئێمە لەم پرسەدا زۆر بە وردی مامەڵە دەکەین چونکە لابردنی کاربەدەستان بە زۆر ئەگەر خەلیفەی موسڵمانان و هێزیان نەبوو وە کاربەدەستەکە کە لا دەبرێت کافر بوو پێویستە تەکفیر بکرێت وموسڵمانان بزانن ئەو کەسە ویلایەتی بەسەر موسڵمانانەوە لە دەست داوە پاشان موسڵمانان ڕێك بخرێن و هێزیان و توانایان هەبێت بۆ بەرەنگاری ئەو کەسە تەکفیر کراوە وە هەموو ئەمانەش بە کەسانی زاناو قسە بیسراو دەبن وە هۆکاریش بۆ لە دەست چونی ئەم خاڵە بە تایبەت خودی هەندێ لە حزبە ئیسلامیەکانە کە بڕیاری موشارەکە کردنی دەسەڵاتیان داوە ئەگەر حکومەتەکانیش بە ئاشکرا لە ئیسلامیش هەڵگەڕابنەوە جا لەم

کاتەدا تەکفیر کردنی کاربەدەستان و قسە کردن لەسەر هەندێ بەر پرس لەسەر وتەو کردەوەی بێ باوەڕی کە لێیان دەوەشێتەوە دەبێتە هەڵوێست و کێشەی لێ دەکەوێتەوە بۆیە سەلەفیەکان زۆر جار تەکفیری کار بەدەستان ناکەن لەبەر :

**یەکەم** : لەبەر ئەوەی کارێکی ئاسان نیە هەرچەندە بۆ کەسانی زانا و پسپۆڕ و بەڕەچاو کردنی کات و شوێنی گونجاو بڤە نیە و بەڵکو ئەرکی خۆیانە .

**دووەم** : موسڵمانانیش بە تایبەت ئەوانەی کە لە ئاینەکەیان شارەزان زۆر کەمن وە شوێن کەوتنی جەماوەریان بۆ خۆیان بەدەست نەهێناوە .

**سێ یەم** : ئامادەکاری بۆ گۆڕینی حوکم ئایا کردوویانە یان تەنها ئاژاوەیەك دروست دەبێت هیچ ئەگەرێکی بە هێز نیە بۆ دەستەبەر بوونی ئەوەی چاوەڕوانی دەکەن .

**چوارەم** : هەر ئەوانەی کە حیزبی سیاسی ئیسلامیان دروست کردووە لەسەر ئەوەی کە کاربەدەست و حوکمەتەکەیان موسڵمان و ئیسلامی نیە خۆیان ناتوانن ئەوەی لە دڵەوە باوەڕیان پێیەتی ڕاگەیەنن بۆیە

من پرسیاریان لێدەکەم ئەگەر حکومەتەکەیان لا موسڵمانە بۆ حیزبی ئیسلامی سیاسیان دژی دروست کردووە ، وە ئەگەر موسڵمان نین و کافر بونەتەوە بۆچی ئەو هەموو موشارەکات و بەشداری کردنە لە حوکم ؟ باشە ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر حیزبە ئیسلامیە سیاسیەکان نەتوانن هەڵوێستی ڕونیان لە تەکفیر و گۆڕینی هەبێت و ناشی کەن ئەی سەلەفیەکان چۆن بتوانن ؟ چونکە دەبێتە هۆی ئاشوب و دروست کردنی شەڕی خوێناوی لە نێوان خەڵکی بێ دەسەڵات و دەسەڵاتدارانی پڕچەکدا .

وە ئێمە کە بێدەنگین لە خراپەکارییەکانی دەسەڵات مانای ئەوە نیە کە ئێمە وەلائمان بۆیان هەبێت و پێمان خۆشە سور بن لەسەر ئەو خراپە ، وە ئایا ئەمە جۆرێکە لە بیدعە؟

نەخێر چونکە ئەگەر واجبیش بێت قسەمان هەبێت و تواناشمان هەبێت و نەیکەین ئەوا تاوانبار بوینە بەڵام کارێکمان نەکردووە مەبەستمان پێی لەخوا نزیك بونەوە بێت و بەکاری چاکیشی بزانین کە ئەوانە ڕوکنەکانی بیدعەن .

**پرسیاری دەیەم : بنەما سەرەکیەکانی سەلەفیەت چین و سەلەفیەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە؟ ئەو ئیشکالیاتیانە چین کە لە مەنهەج و دنیابینی سەلەفیەتدا هەن؟**

**مامۆستا خلیل أحمد** : بنەماکانی سەلەفیەت یەکسانە بە بنەماکانی ئاینی ئیسلام بە بێ زیاد و کەم بەڵام ئەو ئیسلامەی کە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم بە ئاینیان داناوە بە تایبەت یەکخواپەرستی خودا و نەکردنی شیرك وە دوورکەوتن لەتاوانە گەورەکان و بەردەوام نەبوون لەسەر بچوکەکان ،وە ڕاگەیاندنی زانستی شەرعی و فەرمان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە و پابەند بوون بە خوڕەوشت و ئاکاری موسڵمانانەوە و ....هتد

وە سەلەفیەت هیچ ئیشکالیاتی لەگەڵ دونیابینیدا نیە ، وە بناغەمان بۆ دونیابینین ئەوەیە کە دونیا هەمووی موباحە مەگەر زیانی هەبێت وە دەقی شەرعی هاتبێت لەسەر حەرام بوونی کەوابوو سەلەفیەت پەیوەندی بە ئاینەوە هەیە نەك دونیا وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت : ( من احدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) رواه مسلم وەك دەبینین دەفەرموێت : (في أمرنا) واتە لەئایندا بەڵام بۆ دونیا

**خوای گەورە دەفەرموێت** ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾

وصَلَى اللهُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّد، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّم

# وەڵامی

# ڕاپۆرتێکی گۆڤاری لڤین

گۆڤاری لڤین لە ژمارە (٢٥٨)ی بەرواری ٢٠١٤/٢/١، لە ڕاپۆرتێکدا هێرشێکی توندی کردۆتە سەر سەلەفی یەکان، لە ژێر ناونیشانی (لە ژێر هەیمەنەی دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی دا سەلەفی یەکان لە گەشەکردنێکی بەرچاودان) کە تیایدا کۆمەڵێك هێرشی ناڕەوا و درۆ و بوهتان بۆ سەلەفی یەکان کراوە ، بە پێویستمان زانی بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ڕاپۆرتە لەنزیکەوە کۆمەڵە پرسیارێك ئاراستەی بەڕێز مامۆستا خلیل أحمد بکەین.

**پ١/ ئایا ڕەوتی سەلەفی مەدخەلی یانی چی، وە ئایا چی پەیوەندییەکی بە وڵاتی سعودیەوە هەیە؟**

مامۆستا خلیل أحمد : بسم الله والصلاة والسلام علی رسول الله... بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئێمە چەندین جار وەڵاممان داوەتەوە ، کەوا سەلەفیەت یەکسانە بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ، وە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ناوەڕۆکی مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نییە ، واتە چی سەلەفیەت و چی مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نوێنەرایەتی ئیسلامی ڕاستەقینە دەکات ، ئەو ئیسلامەی کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دین بووە بۆ خەڵك و هەتا ڕۆژی قیامەتیش دینە، سەلەفیەت و ئەهلی سوننە نوێنەرایەتی ئەو مەنهەجە دەکەن و درێژبونەوەن بۆ ئەو مەنهەجە بەبێ زیاد و بەبێ کەم، جا ئەم سەلەفیەتەی کە ئێستا هەیە هیچ جیاوازییەکی نییە ، وە بەهیچ شێوازێك نەگۆڕاوە لەوەی کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا هەبووە صلی الله علیه وسلم ، بۆیە بە دەقی فەرمودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەلەفیەت دەمێنێتەوە تا هاتنی ڕۆژی قیامەت {لاتزال طائفة من أمة ظاهرين على الحق لايضرهم من خذلهم ولامن خالفهم حتى يأتي أمر الله}.

واتە: بەردەوام تا ڕۆژی قیامەت خەڵكانێك ئیسلام دەمێننەوە لەسەر مەنهەجی حەق هیچ کەسێك زیانیان پێناگەیەنێ لەوانەی کە لەنێو موسوڵمانانداندا هەر موسوڵمانن بەلاّم لەسەر ئەو مەنهەجە نین وە ئەوانەشی کە دژایەتیان دەکەن لە جگە لە موسوڵمانان ، کەوابو سەلەفیەت هەر دەمێنێ و بەڵگەیشە بەسەر خەڵکەوە تا ڕۆژی قیامەت، واتە هەڵگران و نوێنەرانی ڕاستەقینەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە درێژایی تەمەنی خەڵکی دەبێ بمێننەوە ، ئەوانەشی کە نوێنەرایەتی ئیسلامی حەق دەکەن پەیامی خوا دەگەیەنن بەخەڵك هەر دەبێ کۆمەڵێك بن، خۆنابێ دینی خوا لەسەر زەوی ببڕێ، چونکە ئەگەر دینی خوا لەسەر زەوی بڕا هیچ کەسێك ئیقامە حوجە و بەڵگەی بەسەردا نادرێ، ئەو کۆمەڵەش بە دەقی فەرمودە ئەوانەن کە لەسەر مەنهەجی صەحابە دەڕۆن ، کەوابو سەلەفیەت لەناو و ناوەڕۆکدا یەکسانە بەئیسلامی ڕاستەقینە و تێگەیشتنی ڕاست بۆ ئیسلام، وە ئەگەر تەماشای قورئان بکەین خوای تعالی دەفەرموێ :

﴿وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ ( النساء - ١١٥) .

واتە: هەرکەسێك دژایەتی پێغەمبەر بكات صلی الله علیه وسلم و ئەوەی شوێنی ڕێبازی ئیمانداران نەکەوێ ، ئەوکاتەی کە ئیسلام هاتووە ئیماندارانی سەردەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وە موسوڵمانانی سەردەمی دابەزینی وەحی بریتی یە لە ئیمانداران ، کەوابوو ئەو تێگەیشتنەی کە صەحابە لەسەری بون و ئەو ڕێگا و ڕێبازەی کە لەسەری بون لەلایەن خوای تعالی مەبەستە ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ .

کەوابو ئەمە وەك ناوەڕۆك مەنهەجی سەلەفی یەکانە ، مەنهەجی ئەو کەسەی کەوا درێژە بەئیسلامی ڕاست دەدات پێویستە لەسەر مەنهەجی صەحابە بێت ئەمە وەك ناوەڕۆك ، وەك ناویش: وشەی سەلەف یان سەلەفیەت ناوێکە کەبەسەر زاری پیرۆزی پێغەمبەردا هاتووە صلی الله علیه وسلم ، لە فەرمودەی مسلم دا بە فاگمەی کچی دەفەرموێ (نعم السلف انا لك) واتە: باشترین پێشین بۆتۆ منم ، کەوابو وشەی سەلەف مانایەکی شەرعی هەیە ، کەسێك دەگرێتەوە کە پێش کەسێکی تر بڕوا لەتەمەندا گەورەتر بێت یان لە فەزڵ و چاکەدا باشتر بێت ، ئەوانەی لە پێش ئێمەوە ڕۆیشتون لە صەحابە ، لە پێش ئێمەوەن لە زەماندا ، و لە پێش ئێمەوەن لە کردەوەی چاك و جێبەجێکردنی ئیسلام و فەزڵیان لە ئێمە گەورەترە ، و فەهم تێگەیشتنیان

بۆ دین لە ئێمە باشترە ، ئێمە کەدەڵێین سەلەفین لە دیندا و لە مەنهەجدا سەلەفین ، ئەگینا لە دونیادا کە هەندێ هۆکار هەیە لەم سەردەمەدا لە سەردەمی زێڕینی ئسلامدا نەبووە ، بۆیە ئێمە لە دونیادا نوێخوازین و هەر شتێك نوێخوازی و داهێنان بێت بەمەرجێ زیانبەخش نەبێ ئێمە باوەڕمان بەهەر هەموی هەیە ، بەلاّم لە مەسەلەی دیندا هەر شتێك ئەوکاتە دین بووە ئێستاش هەر ئەوە دینە ، بۆیە دین بە هیچ شێوەیەك زیاد و کەمی تیا ناکرێت ، چونکە ئیسلامێك کە هاتووە بۆ ئەو سەردەمە بۆ هەموو سەردەمێك دەتوانێ خۆی تازە بکاتەوە و وەك چۆن لەو کاتەدا ژیانی گۆڕیوە ئێستاش دەتوانێ ژیان بگۆڕێ ، وە خەڵکیش لە روی سیستەمی دینداریيەوە پێویستیان بەهیچ شتێك نییە کە لە ئیسلامدا نەبێ ، چونکە هیچ شتێك نەماوە ئیلا لە ئیسلامدا هەیە ، وە پێغەمبەری خوا صلى الله وسلم کاتێك کە صەحابەیەك وەفات دەکات دەفەرموێ {ئەو هاوەڵەی کە پێش هەمومان مردووە ئەوە سەلەفی ئێمەیە}، کەوابو ئەمە سەلەفیەتە لە ڕوی ناو و ناوەڕۆکیشەوە ، وە خاوەن ناو و ناوەڕۆکێکی شەرعی یە ، وە کۆنن ، سەبارەت بە پرسیارەکەت کە دەڵێ ی ڕەوتی سەلەفی مەدخەلی؟ ئەم وشەی مەدخەلی یەتە تۆمەتێکە دەخرێتە پاڵ سەلەفی یەکان ، وەك چۆن لە

ڕابردودا ئەو کەسانەی یەکتاپەرست بون و شەریکیان بۆ خوا دانەدەنا و لە گۆڕ و پەڕۆ دور کەوتبونەوە ، لەکاتێکدا خەڵك سەرقاڵی قەبر پەرستی و دار و بەرد و پەڕۆ بوو ، هەرکەس یەکخواپەرست بوایە پێیان دەوت (وەهابی) ئەوە ناو و ناتۆرەیەك بو بۆ ناشرینکردن و زەق کردنەوەی هەڵگرانی دینی ڕاستەقینە بەوەی کە ئەمانە شوێنکەوتەی کەسێکن لە وڵاتی سعودیە بەناوی (محمدی کوڕی عبدالوهاب) ، بەڕاستی درۆ دەرکەوت هیچ کەسێك وەهابی نییە ، وە هیچ کەسێك شوێنی محمدی کوڕی عبدالوهاب ناکەوێ لەبەر خودی شەخسی خۆی ، وە محمدی کوڕی عبدالوهاب غەیری ئینسانێك کە زانا بێت لە شەریعەتی ئیسلام هیچی تری بەدەست نییە، وە وەکو هەمو زانایەکی شارەزا لە دین قسەکانی کاری پێدەکرێ و لێشی ڕەت دەکرێتەوە ، بۆیە هیچ کەسێك ڕازی نابێ بەوەی کە وەهابی بێت ، وە باوەڕیشمان بە وەهابیەت نییە ، ئێستاش لەبەر ئەوەی (ربیع ی کوڕی هادی مدخلی) کە زانایەکە لە سعودیە و هەندێ چارەسەری هەیە دژ بە هەندێ لە مخالەفات کە موسوڵمانان دەیکەن لە ڕوی بیدعە و حزبایەتی کردنەوە کە پێچەوانەی مەنهەجی ئەهلی سوننەیە، وە قەڵەمەکەی خستۆتە گەڕ بۆ دەستنیشانکردنی هەندێ هەڵە لەو هەڵانە ، کۆمەڵێك خەڵك بۆئەوەی قسە بەو سەلەفیانە بڵێن و

تۆمەت بدەنە پاڵیان کە باوەڕیان وەك باوەڕی خۆیان نییە ، ناو و ناتۆرەی مەدخەلیەت دەخەنە پاڵیان بۆ ئەوەی لە وشەی گەورەی سەلەفیەت دایانڕنن و بلێن ئەمانە مەدخەلین نەك سەلەفی ، بەڕاستی ئەمەش زولمێکە هەر خوا خۆی دەزانێ کە لەهەندێ بەندەی خوا دەکرێ ، ئەگینا بەڕاستی ئێمە مەدخەلی نین و وەهابی نین و جامی نین و سەربەهیچ لایەن و شەخسێك نین و باوەڕیشمان پێی نییە ، تەنانەت خودی ربیع کوڕی هادی خۆیشی مەدخەلی نییە ، وە شافعی خۆیشی شافعی نەبووە ، و ئەبوحەنیفە خۆیشی حەنەفی مەزهەب نەبووە ، بەڵکو ئەوانە کۆمەڵە کەسێکن بۆچونیان هەیە و زانستیان هەیە ، بۆیە بەڕاستی ئەم ناو و ناتۆرانە خوای تەعالا نەهی لێکردووە بە دەقی قورئان: نابێت ناو و ناتۆرە لەیەك بنێین بەمەبەستی شکاندنەوەی یەکتر و لە ڕێزی یەکتر کەمکردنەوە ، وە مەبەستێکی تریش لە پشتیەوە هەیە ، لەبەرئەوەی ربیع کوڕی هادی مەدخەلی لە وڵاتی سعودیە دادەنیشێ ، هەندێك لەو کەسانەی بە سەلەفی یەکان دەڵێن مەدخەلین بۆ ئەوەی بلێن ئەم مەنهەجەی کە هەندێ لە سەلەفی یەکان لەسەرین لە سعودیەوە هاتووە و هاوردەی سعودیەیە ، وە موخابەراتی سعودیە ئەم ئیشە دەکات ، بەڕاستی ئەمەش بەرەو هەڵدێر بردنی کۆمەڵە خەڵکێکە بۆ ئەوەی تێڕوانینیان بەرامبەر

بانگخوازە سەلەفی یەکان بگۆڕێت ، بۆئەوەی شك و گومان لەسەر سەلەفی یەکان دروست بێت و بڵێن ئەمانە موخابەراتی وڵاتانی ترن ، وە خاوەن ڕەوت و بەرنامە و چەمکێکی وشکن کە بەکەڵك نایەت لە ئێستای کوردستاندا یان لە ئێستای هەندێ وڵاتانی تردا ، چونکە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر واقعی حاڵیان دەگۆڕێ ، بەڕاستی سعودیە تا ئێستا بە پێی زانیاری خۆم بە هیچ شێوە و شێوازێك هەوڵێکی نەداوە لەگەڵ ڕەوتی سەلەفی لە کوردستاندا بە نزیکبونەوەیەك یان چاوپێکەوتنێك ، من بە هیچ شێوەیەك نە لە خۆم یان مامۆستایانی هاوڕێم ئاگامان لە شتی وا نییە ، وە ئەگەر هەر کەسێك لە نەیاری سەلەفی یەکان لەم بابەتەوە شتێك دەزانێ کە سەلەفی یەکان پەیوەندییان بە دەزگای هەواڵگری هەر وڵاتێکەوە هەیە ، یان پەیوەندیان بە فکرە و بۆچونی هەر شەخسێکەوە هەیە ، ئەی بۆ ئاشکرای ناکەن؟ با ئاشکرای بکەن بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە و بە دەیەها نوسراو و ڕاپۆرت و بەیاننامە ، پاشان تۆمەت و درۆ هەڵبەستن زۆر ئاسانە ، ئەوەی کە سەلەفی یەکان هاوردەی سعودیەن ، نا واللە پێش ئەوەی پێمان بچێتە ناو سعودیە بۆ بەجێهێنانی عمرە یان بۆ حەج کە هەندێ لە برایانی سەلەفی حەجیان کردووە ، سەلەفیەت لەم وڵاتەی خۆمان بەربڵاو بووە لە کۆتایی

هەشتاکانەوە، ئەوە گەنجانەی کە لە جیلی خۆماندا هەن ، بە دیراسات و خوێندن هەمویان سەلەفی بون ، پێش ئەوەی زانایەکی سەلەفی بناسن ، تەنها بە خوێندنەوی ئەو کتێب و قورئان و فەرمودەی کەلەبەردەستدا هەیە ، وە بۆ وەلاّمی پرسیارەکە دەلّێم: ئەم تۆمەتە ، تۆمەتێکی زۆر کۆنە ، هەموو جارێك تازەی دەکەنەوە و گەرمی دەکەنەوە ، هەرجارەی بە ناو و ناتۆرەیەکەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لە سەلەفی یەکان بتەکێننەوە.

**پ٢/ ئایا ڕاستە لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە بانگەشەی سەلەفی پاڵپشتی لێکراوە؟ وەك ئەم نوسەرە دەڵێ: هەندێ کەس هاتوچۆی دکتۆر عبداللطیف یان دەکرد لە تکریت کە لە لایەن ڕژێمی ئەوسای بەعسەوە پاڵپشتی دەکران؟**

مامۆستا خلیل أحمد/ ئەوەی کە بانگەشەی سەلەفی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە پاڵپشتی کراوە، جگە لە درۆیەکی شاخدار هیچی تر نییە ، درۆیەکە هەمو کەس دەیزانێ ، چونکە ڕژێمی بەعس لەسەردەمی خۆیدا دژایەتیەکی زۆری بانگەشەی سەلەفیەتی کرد ، تەنانەت چەندین کەسی لێگرتن و بەندی کردن و لەسێدارەی دان ، مامۆستایەکی وتار خوێن هەبو لە بەغداد تەنها

لەبەر ئەوەی مەنهەجی وەك مەنهەجی شێخ ئەلبانی بوو ، لەسەر مەنهەجی ئەو دەڕۆیشت و گەنجێکی چالاك بو لە مزگەوتەکەی خۆیدا باسی یەکتاپەرستی دەکرد، ڕژێمی بەعس لە سێدارەی دا . سەبارەت بەوەی کە دەڵێ هەندێ لە سەلەفی یەکان هاتوچۆی دکتۆر عبداللطیف یان کردووە لە تکریت لەکاتی ڕژێمی بەعسدا، باشە دکتۆر عبداللطیف کەی لەکاتی ڕژێمی بەعسدا لە تکریت بو؟، کەی لەوێ مزگەوت و قوتابخانە دەرسی هەبو؟ کەی ئێمە لە کوردستانەوە ڕۆیشتوین بۆلای ئەو بۆئەوەی فێری سەلەفیەت بین؟ وە حکومەتی بەعسیش پشتگیری کرد!!! بەڕاستی دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس ئەوەی من بزانم دکتۆر عبداللطیف سەردانی تکریتی کردووە و لەوێ مزگەوت و دەرس و دەوری هەبووە، پاشان بابەتی پاڵپشتی کردنی ڕژێمی بەعس لە بانگەشەی سەلەفیەت یان لە دکتۆر عبداللطیف بەڕاستی ئەم قسەیە ڕاست نی یە ، وە ئەو کەسانەشی کە خەڵکی تکریت بون و هەندێ لە مەنهەجی سەلەفی یان هەبووە لەسەردەمی ڕژێمدا ، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەربەدەر کراون ، یەکێك لەوانە بەناوی (ئەبومنار) کە خەڵکی تکریت بووە ، لەبەرئەوەی هەندێ باسی شرك و توحیدی کردووە و بەسەلەفیەت ناسراوبووە ، لەدەستی ڕژێمی بەعس هەڵهاتووە ، بەوناونیشانەی چەندین

جار هاتۆتە کوردستان نیشتەجێبووە . ئەگەر سەلەفیەت لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە پاڵپشتی بکرایە ئەوکات بانگەشەی سەلەفی بەشێوەیەکی بەرچاو گەورەتر دەبوو ، وە خەڵکیش دەیانزانی ، وە لەهەموو سەردەمی بەعسدا ئیسلامی یان وەهابی ژێردەستە بون و لەبەندینخانەکاندا بون.

سەبارەت بەوەی ڕژێمی بەعس پاڵپشتی دکتۆر عبداللطیف کردووە ، ئەمە درۆیەکی زۆر ڕونە بۆ دکتۆر عبداللطیف دەکرێ یان نەزانینێکە ، ئەوکەسەی کە ئەو پرسیارەی کردووە دیارە وایزانیوە کە دکتۆر عبداللطیف پێش ڕوخانی ڕژێمی بەعس لە تکریت بووە ، ئەوە بەڕاستی بەوشێوەیە نی یە و هەڵەیە ، وە خەڵکی سەلەفیەت لە دکتۆر عبداللطیف فێرنەبووە ، چونکە دکتۆر عبداللطیف و غەیری ئەویش ، بەڵکو هەمو ئەو برایانە هەریەکەیان بەش بەحاڵی خۆیان خوێندنەوەیان کردووە و دیراساتیان کردووە ، پێش دکتۆر عبداللطیف و پاش ئەویش ، تا سەردەمی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ، پاشان بانگەشەی سەلەفیەت لەکوردستاندا ئەوە نییە هەر نەبوبێ و هیچ کەسێك سەلەفی نەبوبێ ، بەڵکو تێڕوانینمان بۆ خەڵکی کوردستان و سوننی شێوازێکی ترە ، ئێمە لەبەر ئەوەی حزبێك نین ، یان مەزهەبێك نین ، باوەڕمان وابێت تازەین و ساڵی ئەوەندەی ئەوەندە دروست

بوین ، نەخێر ، بەڵکو بانگەشەی سەلەفیەت لەگەڵ هاتنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ، وە کوردستانیش لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا بووەتە ولاٌتێك لە ولاٌتە ئیسلامی یەکان ، بانگەشەی سەلەفیەتی هەر تێدا هەبووە ، بەلاٌم هەندێکجار لە هەندێك شوێن کز بووە یان کوژاوەتەوە و زانایەکی تیا نەماوە و کەسێکی تر هاتۆتە شوێنەکەی ، گرنگ ئەوەیە وەکو کۆمەڵگا و میللەت ، مێللەتێکە پەیوەستە بە مەنهەجی ئەهلی سوننەوە ، وە ئێمە حورمەت و ڕێزمان بۆ گەلی خۆمان هەیە کە گەلێکی موسوڵمانە ، وە زۆرینەی خەڵکی ئەم کوردستانە لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە و ڕێبازی سەلەفیەت حسابن ، جا هەرکەسێك نەیەوێت سەلەفی بێ و دەرچووە لە مەنهەجەکە بە ئەنجامدانی هەندێ بیدعە ئەوە سەلەفی نییە ، ئەگینا باقی خەڵکەکەی تر لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە بون هەرچەندێکیان زانیبێ یان نەیانزانیبێ لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە بوون ، بۆیە سەلەفیەت بیروبۆچونێك نییە نامۆ بێت بە ئیسلام و لە مەنهەجی ئەهلی سوننەدا نەبێت ، بەڵکو مەنهەجی ئەهلی سوننە خۆی بەتەنها نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی ئیسلام دەکات ، بۆیە هیچ پێویست ناکات بڵێین : بانگەشەی سەلەفی سەرهەڵدانەکەی و دروستبونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ئەوەندەی ئەوەندە

و لەلایەن دکتۆر عبداللطیف هاتووە یان لەلایەن کەسێکی ترەوە ، نەخێر ، بەڵکو خەڵکی کوردستان هەربەدرێژایی مێژووی هاتنی ئیسلام خەڵکی موسوڵمان بووە و نەوە لەدوای نەوە ئەهلی سوننە هاتووە .

**پرسیار٣/ مەبەستی گۆڤاری لڤین چی یە کە دەڵێ: ڕەوتی سەلەفی مەدخەلی لەناوچە و شارەکانی هەرێمی کوردستاندا لە گەشەکردنێکی بەرچاودایە؟**

مامۆستا خلیل أحمد/ گەشەکردنی ڕەوتی سەلەفی لە ناوچە و شارەکانی هەرێمی کوردستان هیوا و ئاواتی ئێمەیە ، وە ئێمە ئەم گەشەکردنە بە خێر و ڕەحمەتی دەزانین بۆ خۆمان ، بۆ دونیا و قیامەتی خەڵك ، چونکە ئێمە خۆمان بە خەڵکێکی میانڕەو ، بە خەڵکێکی خاوەن مەنهەج و پەیڕە و پرۆگرامێکی نەرم و نیان دەزانین ، وە ئێمە چارەسەریشمان پێ یە بۆ هەموو پێشهاتەکانی ناو کۆمەڵگا و بیروبۆچونیان ، و بۆ ڕەوشت و ئەخلاقیان ، و بۆ کڕین و فرۆشتنیان ، و بۆ سیاسەتیان ، و بۆ ولأتیان ، و بۆ بەرگری کردن لە خاك و ئاویان ، ئێمە نەمانشاردۆتەوە کەوا چەندین جار لەگەڵ چەندەها خەڵکی ڕۆشنبیر و ژیردا قسەمان کردووە ، ئێمە لەبەرئەوەی ئاشناین بە

دینی ڕاستەقینەی ئیسلام ، ئاشناین بە مەنهەجی ئەهلی سوننە ، ئاشناین بە مەنهەجی سەلەف ، چارەسەرمان بۆ هەمو شتەکان پێیە بە شێوازێکی میانڕەوانە کە چارەسەری هەموو کێشەکانی تیایە ، دوور لە زیادەڕەوی و کورت ڕەوی ، جابۆیە ئەگەر خەڵکێك زیاتر پەیوەست بێت بە مەنهەجی ئەهلی سوننە و سەلەفیەتەوە ئێمە شوکری خوای زیاتر لەسەر دەکەین و دڵمان پێی خۆش دەبێ، چونکە سەلەفیەت وانابینین کە ئەم نوسەرە دەیبینێ ، بەڵکو سەلەفیەت بە ڕەحمەت و نەرم و نیانی دەبینین ، وە سەلەفیەت بە چارەسەر دەبینین ، وە هەرتاکێکی سەلەفی دروست بێت دەبێتە خاوەن بیروبۆچون و بیروباوەڕێکی دروست ، هەر تاکێکی سەلەفی دروست بێت دەبێتە کەسێك کە دەست بۆ حەلاڵ بەرێت و وازلە حەرام بێنێت ، بەڕاستی ئەم نوسەرەی کەوادەڵێ : یان ئەوەتا ئیسلام و سەلەفیەت ناناسێ یان دژی ئیسلام و سەلەفیەتە ، چونکە ئەگەر بزانێ ئیسلام بریتی یە لە خێر و خۆشی ڕەحمەت و دینی خوایە ، وە ئەگەر سەلەفیەت ناناسێ ، ئێمە سەلەفیەتی بۆ پێناسە دەکەین : سەلەفیەت یانی ئیسلام، ئەگەر سەلەفیەت هیچ جیاوازییەکی لە ئیسلام هەبوو ، ئێمەش نامانەوێ ، وەرن با دیراسە و گفتوگۆی لەسەر بکەین لە سەر مێزەکان یان لەماڵەکان یان با

چەندین کۆنفرانس ببەسترێت لەسەر ئەوەی کە ئێمە جگە لە دینی ئیسلام بە سەلەفیەت نازانین ، وە لە سەلەفیەتیشدا شتێك نابینین کە پێچەوانەی ئیسلام بێت ، کەوابو ئێمە تا کەسێکی زیاتر پەیوەست بێت بە موسوڵمانێتیەوە و ڕەوشت بەرزیەوە ، بە پەرستش و جیاکردنەوەی حەڵاڵ و حەرامەوە ، دڵخۆش دەبین ، چونکە سەلەفیەت یەکسانە بە ئیسلام ، کەوابو نازانم مەبەستی ئەم نوسەرە چی یە؟ ئایا هانی بەرپرسەکان دەدات؟ ئایا هانی نەیارانی سەلەفییەکان دەدات کەلەسەر مەنهەجی سەلەفیەت نین؟ یان هەرایەك دروست دەکات بۆئەوەی خەڵك وریابکاتەوە لە سەلەفییەکان بۆ ئەوەی لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێ؟ بەڕاستی ئەمە ئەگەر وابێت ئیشی کەسێکە کە چارەسەری گونجاوی پێ نییە ، بەڵکو پەنا ئەباتە بەر بوهتان کردن ، هەربۆیە پێی دەڵێین: گەشەکردنی سەلەفی یەکان ، گەشەکردنێکی سودبەخشە (ئیجابی)ە ، وە بۆخۆیان کار دەکەن ، کارەکەشیان بریتی یە لە کۆمەڵە شتێکی یاسایی (کتێب، ناملیکە، گۆڤار، هتد) بەپێی ڕێنمای وەزارەتی ڕۆشنبیری ، هەبونیان لە مزگەوتەکان بە بڕوانامە و ڕێنمای وەزارەتی ئەوقاف، لەکام کاریاندا فشاریان خستۆتە سەر لایەنێك یان کۆمەڵێك یان گروپێك؟ بەڵکو بۆخۆیان خەریکی کار و چالاکی خۆیانن ، ئێمە

نازانین ئەم ئازادی لێسەندنەوەیە یانی چی؟! ئەی باشە بۆ هەموو حزب و لایەنێکی سیاسی، و هەموو ڕێکخراوێك ، و هەموو ڕەوتێك بە موسوڵمان و ناموسوڵمانەوە لەم وڵاتەدا ئازادە لەوەی چۆن کار و چالاکی خۆی ئەنجامدەدات ، باشە گریمان سەلەفی یەکان حزبێکی سیاسین ، ئەی بۆ لەکاتێکدا چالاکییەکانت پیشان بدەیت و بانگی خەڵکی بکەیت ، خەڵکانێك بە مەترسی ناوی بەرن و بڵێن خەڵکینە ئاگاداربن ئەمانە شتێکی ترسناکن ! ئەی ئێمە بۆ تا ئێستا بە هیچ حزب و لایەنێك نەمانوتووە ئەو لایەنە لەگەشەکردنی بەرچاودان ، خەڵکینە ئاگاداربن !! بەڕاستی ئەم جۆرە هاندانە باوی نەماوە و بەکەڵك نەماوە، بۆیە بەو نوسەرە دەڵێم لە جیاتی ئەو نوسینەی کە دەیەوێ هانی بەرپرسان بدات بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕەوتی سەلەفیەت ، یان ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە مەترسی ئەو ڕەوتە ، وە ئەو شتانەی ئێمە دەیلێین و دەینوسین ئەگەر جیگای قبولْ نیە لای بەڕێزیان بۆ خۆی نایەت مناقەشەی نوسینەکانمان بکات ، و مناقەشەی بیروبۆچونەکانمان بکات بە بەڵگەی قورئان و فەرمودە یان بەڵگەی هەرشتێك کە خۆی باوەڕی پێی هەیە، ئێمە دەربارەی هەر شتێك قسەمان کردبێت هەر لە چلەپۆپەی عەقیدەوە تا بچوکترین شت لە ئیسلامدا، ئەگەر وتبێتمان لە

نوسینێکماندا ، و لەوتارێکماندا ، و لە کردەوەی هەر کەسێکماندا ، ئەو نوسەرە سەربەستە لەوەی بێت و مناقەشەمان لەگەڵ بکات، ئەگەر قسەکانی ئەو لەسەر حەق بوو ئێمە لەسەر هەڵەبوین ، دەگەڕێینەوە سەر حەق ، چونکە ئێمە خەڵکێکین باوەڕی تەواومان بە هەموو ئیسلام هەیە ، وە دەمارگیریمان تیا نییە بۆ هیچ مەزهەبێکی ئیسلامی ، و بۆهیچ حزبێکی ئیسلامی ، و بۆ هیچ وڵاتێکی ئیسلامی ، و بۆهیچ کەسایەتیەکی ئیسلامی، بەڵکو باوەڕی تەواومان بە گفتوگۆی زانستی هەیە لەسەر مێزەکان ، وە لەسەروی هەمویشیەوە سەرخستنی دین ، و سەرخستنی وڵات ، و سەرخستنی نەتەوە ، و پارێزگاری کردن لەخاك، و پاراستنی ئەمن و ئاسایش ، و پارێزگاری کردن لە سەر وماڵی هاوڵاتیان ، دروشم و ئامانجی ئێمەیە .

**پرسیار٤/ سەلەفییەکان کار لەسەر بەهێزکردنی پێگەی خۆیان دەکەن ، ئەم ڕەوتە ئەگەرچی بەئاشکرا حزبی نین و بانگەشەی حزبی بونیش ناکەن ، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێکخراوی تۆکمە کار لەسەر هاندانی گەنجان دەکەن بۆ ئەوەی ببن بە سەلەفی ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بەڵێ پێویستە کار بۆ گەشەکردنی خۆمان بکەین ، چونکە ئێمە خۆمان بەئەندامێکی سودبەخشی ئەم کۆمەڵگایە دەزانین ، خۆ ئێمە خۆمانمان لێنەبێزراوە ، بەڵێ خۆمان بە خەڵکێکی دڵسۆزی ئەم کۆمەڵگەیە دەزانین، بۆیە پێویستە خەڵکی سودبەخش زیاد بکرێت ، بۆیە پێویستە خەڵکی ئاشنا بکرێن بە مەنهەجی ڕاستی ئیسلامەتی ، چونکە ئێمە ئەهلی سوننە و سەلەفیەت بەو شێوەیە نابینین کە بەڕێزیان دەیبینێت ، لەوەشدا کە دەڵێ : حزبی نین و بەئاشکرا بانگەشەی حزب بون ناکەن ، بەلاّم بەشێوەیەکی تۆکمە و ڕێکخراوەی کار دەکەن ، بەڕاستی ئەم بەڕێزە نە لە حزبی سیاسی تێگەیشتووە ماناکەی چی یە و زاراوەکەی مانای چی دەگەیەنێ ، نە لەکاری ڕێکخراوەی تۆکمە تێگەیشتووە ، نە لە کاری ئیسلامەتی تێگەیشتووە ، چونکە بە ڕاستی حزبی سیاسی بریتی یە لەکۆمەڵە کەسێك کە مەنهەج و پێڕەو پرۆگرامێکی ناوەکی و دەرەکی هەبێت ، وە ئەو کۆمەڵە کەسە لەسەری پێك بێن ، لە سەرکردەوە بۆ بنکردە ، وە سیاسەتی چونە سەر حوکمیان هەبێت ، وە ئێمە چەندینجار ئەم وەلاّمەمان داوەتەوە ، کەوا مەرج نییە هەمو ڕێکخراوێك و هەموو کارنامەیەك ئینسانەکان لەسەری کۆك بن و لەسەری بڕۆن ئەوە بریتی بن لە حزبی

سیاسی ، چەندینجار وتومانە سیستەمی زانکۆکان ، سیستمی ئیدارەی کارگەیەك ، یان ڕێکخراوێکی خزمەتگوزاری ، بەڕاستی ئەوانە هیچیان حزبی سیاسی نین ، ئەگەر وەڵامەکە بەوە بدەمەوە کە سەلەفییەکان حزبی سیاسی نین ، وە سەلەفیەت هەرگیز نابێت بە حزبی سیاسی ، وە ئەگەر هەر کۆمەڵە خەڵکێکیش بەناوی سەلەفیەتەوە حزبێکی سیاسی دروست کرد ، ئەوە فلاَنە حزبی فلاَنە کەسی سەلەفی یە ، وە دامەزراندنی ئەو حزبە بۆچونی هەندێ سەلەفی یە ، ئەمما سەلەفیەت خۆی کۆبکرێتەوە لە حزبێکی سیاسیدا ئەوە هەرگیز ڕێك نایەت ، چونکە سەلەفیەت یەکسانە بە ئیسلام ، هەرکەسێك ناوی سەلەفیەتی ئیستغلال کردبێت بۆ حزبیەت ئێمە بە ناڕەوای دەبینین ، چونکە نابێت ئیسلام کۆبکرێتەوە لە حزبێکدا ، هەرچەند بۆتە جێگەی مشتومڕی موسوڵمانان کە حزبی ئیسلامیان هەبێت و کاری پێبکەن ، ئێمە بۆ خۆمان وەکو سەلەفیەکانی کوردستان باوەڕمان پێی نییە ، ئەگەر هەموو سەلەفییەکانی کوردستان کۆببەنەوە لەوەی کە حزبێکی سیاسی دروست بکەن بەناوی حزبی سەلەفی یان بەناوی حزبی فلاَنی سەلەفی ئەوکات من یەکەمین کەس دەبم مخالەفەیان دەکەم ، چونکە سەلەفیەت بریتی یە لە مەنهەج ، ئەمەش شتێکی ڕونە ، کەسی خوێندەوار ئەم شتە دەزانێ ، وە

ئەمەش لە دونیای ڕۆشنبیریدا شتێکی ئاشکرایە ، من زۆر سەیرم لێدێ لەوەی کە چەندین جار لە چەندین ڕۆژنامەنوسەوە لەم کوردستانەدا ئەمە دەوروژێنرێت کە سەلەفییەکان حزبن ، بەڵام ئەم بەڕێزە دەڵێ : بانگەشەی ئەوە دەکەم کە حزب نین ، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێکخراوی تۆکمە کاردەکەن ، ئەگەر مەبەستت ڕێکخراوی تۆمار کراو یان تۆمار نەکراو ، ئەگەر ڕێکخراوەیەك بتوانێ هەمو ئەندامە سەلەفیەکانی کوردستان یان زۆرینەی ئەندامە سەلەفیەکانی کوردستان ، یان زۆرینەی کەسایەتیە سەلەفیەکان ، یان زۆرینەی موسوڵمانە سەلەفیەکان کۆبکاتەوە ، بەڕاستی بەوشێوەیە نیە ، وە ڕێکخراویش ناتوانێ سەلەفیەکان کۆبکاتەوە چونکە سەلەفیەت بریتی یە لە دین و لەمەنهەج ، تەنها ئیسلام و سەلەفیەتە دەتوانێ خەڵك کۆبکاتەوە ، بەڵام ئەگەر بتەوێ ئیسلام و سەلەفیەت لە چوار چێوەی شتێکی بچوکتردا کۆبکەیتەوە بێگومان نابێت و ناکرێت ، پاشان ڕێکخراو بریتی یە لە ئیشی خزمەتگوزاری ، و مهنی ، و ئیغاسی ، وە کارێك بێت لەکارەکان نەك هەمو کارەکان لەناو ڕێکخراوێکدا کۆبکەیتەوە ، بەڵام سەلەفیەکان ڕێکخراوە نین و ناشبن ، ئەی کارەکانیان بۆ تۆکمەیە ؟ ئەوە دەیسەلمێنێ کەوا ئیسلام خۆی تۆکمەیە ، وە ئیسلام خۆی بریتی یە لە ڕێز ، ئیسلام بریتی یە لە ڕۆشنبیری

، کاتێك کە من لەشوێنێکدا دەژیم ، لەهەمان شوێن ١٠ کەس لەمن پلەیان بەرزترە ، ئەوکات من هەرکات ویستم کارێك بکەم دەڕۆم پرس بەوان دەکەم ، بە پێچەوانەشەوە ، ئەگەر لە شوێنێك بوم ١٠کەس هەبو پلەیان لەمن نزمتربو لە زانست و ئەزموندا دێن پرس بەمن دەکەن ، بەڵام هیچ زۆرکردنێك نیە لەوەی بەقسەی من دەکەن یان نە ، بۆیە ئێستا لە کورستان هیچ کەسێك سەرۆکی سەلەفیەکان نیە ، هیچ کەسێك پلەی یەکەم نیە وەکو پلەیەکی حزبی پێبدرێ و (ئەمر و نەهی) بەدەست بێت ، وە هەرکەس بەقسەی نەکات تاوانبار بێت ، وە بۆسەلماندنی ئەم قسەیەم دەتوانن ڕاپرسیەك بکەن لەنێو هەمو سەلەفیەکانی کوردستاندا ، بزانن هیچ کەسێك هەیە بەرپرس بێت ، و لەلایەن هیچ گەنجێکی سەلەفیەوە بلێت ئەگەر بە قسەی نەکەم تاوانبار دەبم ، بەڵام ئیشی سەلەفیەکان لەبەرئەوەی خوای تعالی دەفەرموێ: ﴿ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ هەربۆیە ئەسڵ لە ئینسانی کەم علم ئەوەیە بگەڕێتەوە بۆلای ئینسانی شارەزا ، وەئەمەش شتێکی ڕونە لەهەمو ئەدیانەکاندا ، کەوا هەرکەس لەشتێکدا شارەزابو خەڵکی پرسیاری لێدەکەن ، بەحوکمی ئەوەندەی شارەزای هەیە خەڵکە دەگەڕێنەوە بۆلای ، کە گەڕانەوە بۆلای ئیشی تۆکمە دروست دەبێت ، پاشان ئیشی سەلەفیەکان

بریتی یە لە خزمەتکردنی دین ، هەرمامۆستایەك کە کۆمەڵێ قوتابی هەیە و دەرسی لادەخوێنن ، ئەوکەسانە فێری ئەو ڕۆشنبیریە دەکات کە خۆی پێیەتی ، وە قوتابیەکان بیر و بۆچونی ئەو مامۆستایە دەگوازنەوە ، بۆیە ئیشەکان بە ئێشێکی تۆکمە دێنە پێش چاو ، لەبەرئەوەش بەشی دەرونی خۆیانی تیانیە و کارەکان بۆ خوایە بڕێکی زۆر بەرەکەتی تیا دەبینرێ ، ئەگەر لەدورەوە بیبینی وادەزانی ڕێکخراوێکی تۆکمەیە و لەکاری حزبێك دەچێ ، بەلاّم بۆخۆی لەناوەڕۆکەوە بەوشێوەیە نییە ، وە لەناوەڕۆکەوە هیچ سەلەفی یەك بەرپرسی سەلەفی یەکی تر نیە ، پاشان ئەگەر ئێمە باوەڕمان بەحزبایەتی هەبێت ئەی ئایا لە قازانجی خۆمان نییە ئەگەر بڵێین باوەڕمان بەحزبایەتی هەیە ؟! یان بۆ کەسێك ٣٠ساڵ لەتەمەنی بەم قسەیەوە بەسەر بەرێت و بڵێت من باوەڕم بە حزبایەتی نیە ، ئایا ئەمە جۆرێك نییە لە دوو ڕوی و خۆخەڵەتاندن؟! ئێمە پڕبەدەم هاواردەکەین و دەڵێین ئێمە باوەڕمان بە حزبی سیاسی نییە ، نەك وەك نەزانینێك و نازانین حزبی سیاسی چی یە ، نەخێر ، بەڵکو حزبی سیاسی زیانی بەم وڵاتەی ئێمە گەیاندوە بە خاکی و بەئاوی و بەنەتەوەی و بەدینی ، وەئەمەش ئەوە ناگەیەنێ ئێمە دژی حزبی سیاسی بین و هەرکەسێك حزبی سیاسی هەبو لە

ئیسلامی و لە عەلمانیەوە بەهەموو شێوەیەك هەوڵبدەین بۆ ڕوخانیان و دژیان بووەستین ، نەخێر ئێمە موسوڵمانانی ئەم وڵاتە بە ئیسلامی و بە عیلمانیەوە دەزانین لەچی بارودۆخێکدا ژیاوە و گەیشتۆتە ئەم قۆناغە بۆیە دڵسۆزیمان بۆ تاك بەتاکی ئەم کەسانە هەیە بەمەبەستی ئەوەی کە بەهەر هەمومانەوە بتوانین خەڵکێکی زیاتر بیرمەند بکەین و هۆشیاریان بکەین کەوا حەلاڵ و حەرام بزانن ، قازانجی خۆیان لەدیندا و لەنەتەوەدا بزانن ، ئەگینا ئێمە مەرامی شەخسیمان نیە بۆخۆمان کەوا چەندە قازانج دەکەین لەم مەنهەجە ، نەخێر ، چونکە بەڕاستی ئێمە خۆمان کوشتووە بۆئەوەی خەڵکی پێبگات ، لەو ڕووەشەوە کە دەڵێم خۆمان کوشتووە ئەگەر باوەڕمان بە حزبی سیاسی هەبێت بۆخۆمان و بۆ موچەمان ، تا ئێستا شتێکمان هەبو بەناو حزبەکەی خۆمان و لایەنەکەی خۆمان و مەزهەبەکەی خۆمان ، بەلاّم ئێمە بەدەمی خۆمان دەڵێین باوەڕمان بەو شتە نییە ، بۆیە ئەگەر باوەڕمان هەبێت وەکو ئینسان ، یان بۆنمونە ئەگەر لەڕوی ئەندام و ئەو خەڵکانەی ئێستا بن بەسەلەفی ئەگەر کۆببنەوە و تۆماری حزبێکی سیاسی بکەن خۆهیچیان لە حزبەکانی تر کەمتر نییە ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە هەوڵنادەن بۆ کورسی ، هەوڵنادەن بۆئەوەی جێگەی هیچ

کەسێك لەق بکەن ، بەڵکو هەوڵئەدەن بۆ ئەوەی چاکسازی کاربەدستان بکەن ، بەومانایەش نە کە ئێمە پیاوی سوڵتەین و پیاوی حکومەتین ، وە حکومەتیش هەرچی بکات ئێمە پێی ڕازین .

**پرسیار ٥/ سەرچاوەیەك پێی وایە گرتنەبەری ئەم جۆرە سیاسەتە لە چێوارچێوەیەکی ئاینی نادیار زۆر ترسناکە بەبەراورد لەگەڵ حزبێکی سیاسی ئاینی وەك یەکگرتو و کۆمەڵ ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / نەخێر بەهیچ شێوەیەك ترسناك نییە ، وە ئەو سەرچاوەیە وادەڵێ من نازانم کێ یە و لەچی ئاستێکدایە ، وە من تائێستا خەڵکێکی خاوەن فکر و ستراتیژ و شارەزا لە ئیسلامی یەکان ناناسم ، ئەگەر هەشبێت ، لە فکر و مەنهەجی سەلەفی ناناسم ، تاوەکو ئەم سەرچاوەیە بڵێت ئەم جۆرە سیاسەتە لە چوارچێوەیەکی ئاینی نادیاردا زۆر ترسناکە ، وە سەلەفیەکان ترسناکیان لە حزبێکی ئیسلامی سیاسی وەك یەکگرتو و کۆمەڵ زیاترە ، نەخێر وانییە ، وە ئەم قسەیە لەقسەی کەسێکی ئیسلامی دەچێت ، کە دەیەوێ بڵێت حزبی ئیسلامی سیاسی ئەگەر هەشبێت هیچ

کێشە نییە ، چونکە دەتوانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەی ، بەڵام ئەم بیروبۆچونەی کە خۆی ئاشکرا ناکات زۆر ترسناکە و نادیارە و ڕون نیە ، بە ڕاستی ئەمە لەقسەی کەسێك دەچێ کە بیەوێت ئەو کێشانەی لەسەر ئیسلامی سیاسی هەیە وەك دەڵێن کەمی بکاتەوە و ترسناکیەکە بدات بەسەر سەلەفیەکاندا ، وەمن لێرەوە خەڵکی کوردستان نوسەرەکەش دڵنیادەکەمەوە لەوەی کەوا سەلەفیەت هیچ شتێکی پێ نیە کە لەچوارچێوەی ئیسلام بچێتە دەرەوە ، وە هیچ جۆرە شتێکی ناڕونیمان نیە ، وەهیچ مەزهەب و دینێکمان نیە ئیلا ئیسلام نەبێت ، وەمن زۆر جار ئەوەم وتووە کەوا ئێمە هیچ مەزهەبێکمان نیە و هیچ دینێکمان نیە جگە لە ئیسلام ، جا هەرکەسێك بەڵگەمان لە ئیسلام بۆ دەهێنێتەوە ئەوە دینمانە ، وە ئێمە بڕیارمان نەداوە کە هەرشتێك خۆمان بڕوامان پێی هەبێت هەر دەبێت ئەوەبێت ، هەربۆیە دەرگای ئێمە کراوەیە بۆ گفتوگۆ و لە قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی صەحابە ، جا هەرکەسێك دینی ئیسلامی قبوڵ نەبێت و دژایەتیشی بکات ئەوە لە ئێمە نییە و بەیەکیشەوە نامانکرێت ، بەومانایەی کە ئێمە نابینە ئەو و ناشلێین با ئەوە لە ئێمە بێت ، بەڵام دەتوانین لەگەڵیدا بژین ، بەڕاستی ئێمە دڕندە نین خەڵك بتۆقێنین ، خەڵك بکوژین ، ئەوەی

موخالیفمان بێت هەرچیەکمان لەناخدا هەیە بەسەریدا بیڕێژین ، هەرگیز بەوشێوەیە نیە ، بەڵکو ئەوکاتیش هەر بە ئیسلام حوکم دەکەین ، کەوابوو دەمەوێ خەڵك دڵنیابکەمەوە لەوەی کە سەلەفیەت ترسناکی پێ نیە ، بەڵکو ڕەحمەتی پێ یە ، خێری پێ یە ، خۆشی پێ یە ، سەلەفیەت وەکو مۆمێك وایە دەسوتێت بۆئەوەی چواردەورەکەی ڕون بکاتەوە ، بۆئەوەی خەڵکی لەپاڵیدا بحەوێنەوە ، چونکە من ئەگەر ئارامگربم بەرامبەر خەڵکێك کە موخالفی منن ، وەکو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن کاتێك نوێژ دەکات پیسی ناوسکی حوشترێك دەکەن بەسەریا ئارام دەگرێ ، یان یەخەی پێدەگرن و ئازاری دەدەن ئارام دەگرێ ، وە چەندین قسەی ناشرینی پێدەڵێن و لە شار و وڵاتی خۆی دەریدەکەن ئارام دەگرێ ، کەوابو ئێمەش دەبێ چاو لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بکەین ئەگەر هەرچیەکمان پێبکرێ ئێمە لەسەرمان پێویستە ئارام بگرین ، ئارامگرتنەکەش ئەوە نیە کە بەرامبەر حاکم ئارام گربین و بەرامبەر خەڵکی ئارام نەگرین ، نەخێر ، بەڕاستی من لێرەوە ئەوە ڕاست دەکەمەوە کە ئێمە ئارامگردەبین بەرامبەر هەمو تاکێك لەم کۆمەڵگایەدا بە ئیسلامی و بە عەلمانیەوە ، بە زانا و بەنەزانەوە ، بە حاکم و بە مەحکومەوە ، چونکە ئێمە ئەگەر بمانەوێ

ڕەحمەت بین بۆ خەڵك لەسەرمان پێویستە خزمەتکاری خەڵك بین و خزمەتیان بکەین ، چونکە بەڕاستی ئێمە هیچ شتێکمان بۆخۆمان ناوێ ، تەنانەت ئەگەر سەردەمانێك هات هەمو خەڵکی پەیوەست بون بەدینەوە ، هەمو خەڵکی وتیان حکومەتی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی و یاسای ئیسلام و حوکمی قورئان و فەرمودەمان دەوێ ، ئەوکاتە ئێمە دەڵێین باشە پیرۆزتان بێت ، فەرمون خۆتان کێ هەڵدەبژێرن هەڵیبژێرن ، وە ئێمە بۆ خۆمان هیچمان ناوێ ، بەڕاستی ئامانجی ئێمە ئەوە نیە باسی سوڵتە بکەین بۆخۆمان ، بەڵکو بۆ خەڵك دەمانەوێ ، بۆ خەڵکی چاك و بەدین دەمانەوێ ، پێمانخۆشە ئەم ولاتە دین حاکم بێت تیایدا ، پێمانخۆشە لەم ولاتەدا حوکم بە قورئان و فەرمودە بکرێت ، بەلاَم ئەگەر خۆم نەبم ناهێڵم شتی وامان نیە ، بۆیە ئێمە هیچ ترسناکیەك لە بیروبۆچون و ئاکار و ڕەوشتماندا و سیاسەت و هەڵس و کەتمان نیە ، وە هیچ ناڕونیەك لە ئایندەماندا نیە و ناشبێت إن شاء الله.

**پرسیار ٦/ ئایا سەلەفیەکان لە هەوڵی ئەوەدان دەست بەسەر مزگەوتەکاندا بگرن بۆئەوەی پەیامی خۆیانی تێدا بڵاوبکەنەوە؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بەڕاستی پرسیارێکی سەیرە ، کوا ئەو ڕێژە زۆرەی سەلەفیەکان کە لەمزگەوتەکاندان ، ئەگەر بەراوردی مزگەوتەکان بکەیت کەچەندین مەلای غەیری سەلەفی تیایە ، جا ئەومەلانە ئەگەر لەحزبە ئیسلامیەکان بن یاخود لەمەزهەبەکانی سۆفی و دەروێش ، وەهەندێك مەلا هەیە لەسەر لیستی حزبە عەلمانیەکان دانراوە ، وە هەندی ٚمەلا هەیە هەر خۆی لەسەر هیچکام لەوانە ساغ نەکردۆتەوە ، یانی ئەگەر حساب بکەین لەهەر شارێکدا مەلا سەلەفیەکان لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕن ، ئەم گەورەکردن و زەقکردنەوە لە ڕاگەیاندنەکان و ڕۆژنامەکاندا بەڕاستی لەوانەیە مەرامێکی خراپی لە پشتەوە بێت ، من ناڵێم مەرامەکە دەستی وڵاتێك یان حزبێك یان لایەنێکی لەپشتە ، وە تۆمەت بۆ هیچ کەسێك ناکەم ، بەڵام ئەم نوسەرە بەرپرسی یەکەمە لەوەی کە ئەم شتە گەورە دەکاتەوە یان ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە باسانە دەوروژێنن ، یان باخەڵکی تریش بڕوات مزگەوتەکان داگیربکات ، لە ڕێگەی وەزارەتی ئەوقاف و دامەزراندنەوە ئەگەر بڕوانامەی هەیە بابڕوات مزگەوتێك داگیربکات ، باشە کەسێك ئەگەر نەتوانێت

مەلایەتی بکات یان نەتوانێ بچێ دین فێرببێت و دین بگەیەنێ ئەبێ کێ لەمزگەوتەکاندا بێت ، بەڕاستی ئەمە پرسیارێکە یان ئەوەتا ئەم نوسەرە ڕقی لە مزگەوتە و ڕقی لەباسکردنی دینە یان ئەوەتانێ تەنها سەلەفیەکانی خۆش ناوێ و خەڵکی تری خۆشدەوێ هەرکەسێکی تربێت ، وە ئێمە ڕێگەمان لەهیچ کەسێك نەگرتوە بۆئەوەی بڕواتە سەر مینبەر و دین بگەیەنێ ، وە ئێمە بە فشاری خوێن و شەڕ و ئاژاوە و تێکدانی بارودۆخی ئەمنی نەچوینەتە مزگەوتەکانەوە ، و هەرکەسێ لەهەر شارێك دەڕواتە هەر مزگەوتێك ئەوە نیە کە لەلایەن کەسێکەوە ئاراستە بکرێت و پێی بڵێن ئەوە بکە و وابڵێ ، یانی ئاراستە کراوی ڕێکخراوێك بێت یان ئاراستەکراوی وڵاتێك یان حزبێك جا پارتی بێت یان یەکێتی یان هەر حزبێکی تر وەك هەندێ جار تۆمەت بۆ سەلەفیەکان دروست دەکەن کە پیاوی دەسەڵاتن ، من وەکو کەسێکی لاوازی سەلەفیەکان لێرەوە دەڵێم هیچ جۆرە گرێبەستێك یان بەیاننامەیەك و هیچ جۆرە پەیوەندیەکی فەرمی لە نێوان ئێمە و پارتی و یەکێتی و هیچ لایەنێکی تر نیە ، ئەم جۆرە تۆمەت کردنە بۆ بانگەوازی سەلەفی زوڵمێکی گەورەیە و خوا قبوڵی ناکات ، لەڕاستیدا ئێمە هەرکەسێك نەیارمان بێت لەناو ئیسلامدا یان دەرەوەی ئیسلام ئەوەندە عەقڵیەتمان هەیە کە بتوانین هەڵسوکەوتێکی

ژیرانە لەم وڵاتەدا بکەین کە دەزانین وڵاتەکەمان بەچی بارودۆخێکدا تێدەپەڕێ ، بۆیە ئێمە بەوپەڕی ژیریەوە باوەڕمان بەوەیە کە فشار لەگەڵ هیچ مەزهەبێك و هیچ لایەنێك و هیچ وڵاتێك دروست نەکەین ، جا ئەگەر مەلایەکی سەلەفی بڕوانامەی هەبێت و زانستی پێبێت و بڕواتە مزگەوتێکەوە کە کەسی تر ناچێت ، حکومەتیش شوێنەکە بە چۆڵی دەبینێ و لەسەر داواکاری خەڵك دادەنرێت بۆ دەبێ خەڵکانێك پێی ناخۆش بێت ؟ بۆ دەبێ خەڵکانێ بێن و بڵێن ئەمانە زیادیانکردووە ، باشە وادیارە زیادکردنیان ڕەحمی خوایە بەرامبەر بەو خەڵکە ، پاشان ئەم جۆرە ڕەخنەگرتنانە و تێکەڵکردنی سەلەفیەت بە سیاسەت و زیادیان کردووە و ترسناکن ، من حەزدەکەم بەڕاشکاوی پێمان بڵێن ئەو رەخنانەی لەسەلەفیەت دەگیرێن چین ؟؟ بەدەر لەوەی بڵێن: ئەمانە وشکن ، ئەمانە تەنها بایەخ بە ڕیش دەدەن ، ئەمانە بایەخ بە کورتی شەرواڵەکانیان دەدەن ، وە ئەم ڕەخنانە ڕاست و دروست نین ، بەڵکو سەلەفیەت چارەسەری پێیە ، سەلەفیەت بانگەشەیەکی گەورەیە ، سەلەفیەت کورت ناکرێتەوە لە بۆچونی مامۆستایەك یان دوو مامۆستا ، حزبێك یان دوو حزب بەناوی ئیسلامەوە ناوی خۆیان ناوە حزبی فلانی سەلەفی ، وەکو باسمانکرد سەلەفیەت نوێنەری ڕاستەقینەی ئیسلامە

، مەزهەبێکی ڕاست و دروستە بۆئیسلام ، وە موڵکی هیچ کەسێك لە ئێمە نیە ، کەوابو ئەم شێوە گەورەکردنەی کەوا سەلەفیەکان مزگەوتەکان بەدەست دەگرن و لەهەوڵی پەرەپێداندان ، گریمان وایە ، ئایا بەلای کێوە گرنگ نی یە کە هەر بیروبۆچونێکی هەیە پەرەی پێبدات؟!

**پرسیار٧/ ڕای بەڕێزتان چی یە بەدابەشکردنی سەلەفیەت بەزیاتر لە ڕەوتێك ، وەك سەلەفی جیهادی ، سەلەفی حەرەکی ، سەلەفی تقلیدی ، سەلەفی مەدخەلی ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / ئەم دابەشکردنەی سەلەفیەت بۆ چەند ڕەوتێك شتێکی زۆر کۆنە، سەلەفیەت یەك سەلەفیەتە ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ {ستفترق الأمة إلى ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة}، ئێمە سەلەفیەت بە مەنهەجێکی گەورە دەزانین ، وە ئەوەی بەناو سەلەفیەتەوە دەکرێت ئەگەر بینیمان پێچەوانەی شەرعە و لەگەڵ میزانی مەنهەجی سەلەفیەتدا ناگونجێت ئەوە بریتی نیە لە سەلەفیەت، وە ئەو چوار جۆرەی کە باست کرد من بۆخۆم هیچکام لەو جۆرانە نیم ، چونکە سەلەفیەت بەتەنها جیهاد نازانم ، وە سەلەفیەت تەنها بە تەنزیم و حەرەکە نازانم ، وە

سەلەفیەت تەنها بە تەقلید نازانم ، سەلەفیەتی مەدخەلی هەر باوەڕم پێی نیە ، چونکە من (ربیع کوڕی هادی مەدخەلی) بە زانایەکی گەورەی ئیسلامی دەزانم ، بەلاّم بەهەمووو ئیسلامی نازانم ، و هەمو دین لای ئەو کۆنابێتەوە ، هەروەك چۆن هەمو دین لای شافعی و حەنبلی و حەنەفی و مالك کۆنەبویەوە ، ئەم دابەش کردنە بۆ شێواندنی جوانی سەلەفیەتە ، چونکە دەرکەوتووە سەلەفیەت مەنهەجێکە چارەسەرە و گەڕانەوەیە بۆ دینی ڕاستەقینە ، هەربۆیە کۆمەڵێك لە دوژمنەکانی لە دەرەوە و ناوەوەی ئیسلامدا هاتن ئەم جۆرە دابەشکردنانەیان کرد بۆئەوەی خەڵکی دڵی بگۆڕێ بەرامبەر بەسەلەفیەت ، ڕەنگە کەسێك بڵێ: (خەوارج) سەلەفی ئێمەن ، چونکە لەپێش ئێمەوە ڕۆیشتون ، ئەو صەحابانەشی کە دژی خەوارج بون هەر سەلەفی ئێمەن ، وە هەردولاشیان موسوڵمان بون ، وەلاّم بۆ ئەم گومانە: ڕاستە لە ڕوی زمانەوە هەردوکیان سەلەفن بۆ ئێمە ، وە لەڕوی سەردەمیشەوە هەر سەلەفن بۆ ئێمە ، بەلاّم لایەکیان سەلەفی صالحن ، لایەکەی تریان سەلەفی گالحن ، لایەکیان مەنهەجەکەی دروستە ، لاکەی تریان مەنهەجەکەی ناتەندروستە ، بۆیە خەوارج با لەسەردەمی صەحابەشدا بوبن ، بەلاّم مەرج نیە کە هەرکەسێك ڕیشی درێژ بو ، وە شەرواڵەکەی کورت

بو ئەوە سەلەفی یە ، چونکە سەلەفیەت کورت ناکرێتەوە لە ڕیش و شەرواڵدا ، وە وڵاتی وامان هەیە تەنها لەبەر ئەوەی لەسەر مەزهەبی ئەبوحەنیفە دەڕۆن هەمویان ڕیشدارن ، بۆنمونە: وڵاتی ئەفغانستان و پاکستان ، لەکۆندا وڵاتی ئێمە هەرچی پیاو هەبووە کەوا و سەڵتەکەی و جل و بەرگەکانیان کورت بووە ، وە ڕیش لەم وڵاتەی ئێمەدا مۆدێل بووە ، بەئیسلامی و بە عەلمانیوە خەڵکی ڕیشیان هەبووە ، کەوابو سەلەفیەت بە ڕیش درێژکردن و شەرواڵ کورتکردنەوە نیە ، هەرچەندە دوو دروشمی گەورەی ئیسلامن ، کەدەڵێم گەورە: مانای وایە ڕیش بەردانەوە و شەرواڵ کورتکردنەوە (واجب)ن، وە هەرکەسێك ئەو دوو دروشمەی بەجێهێنا و کارەکانی تری پێچەوانەی مەنهەجی ئەهلی سوننە بو ئەوا ئەوکەسە پێی ناوترێ سەلەفی ، یان بۆ نمونە: ئەگەر ڕەوتێك هەبو ناوی خۆی نا سەلەفی ، یان ڕەوتێك هەبو لەسەر کتێبەکانی ئیبن تیمیە و محمدی کوڕی عبدالوهاب دەڕۆی لەهەندێ شتدا ، بەڵام لەزۆر شتدا پێچەوانەی ئەوانی دەکرد ، ئەوەش هەر بەسەلەفی حساب ناکرێ ، بۆ؟ لەبەرئەوەی خەوارج دەیانوت ئێمە بە قورئان حوکم دەکەین ، تەنانەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێك وەسفیان دەکات دەفەرموێ: { تحقرون صلاتكم إلى صلاتهم وصيامكم إلى صيامهم } .

واتە: نوێژەکانی خۆتان لەچاو نوێژەکانی ئەواندا بەکەم دەبینن ، ڕۆژووەکانی خۆتان لەچاو ڕۆژووەکانی ئەواندا بەکەم دەبینن ، وە کۆمەڵێك بون قورئانیان لەبەربوو ، و ئیلتیزاماتیان پێوە دیار بوو ، هەر بۆیە ئەم هەموو ڕەوتەی کە ئێستا لەم سەردەمەدا هەن ناوی خۆیانیان ناوە سەلەفی فلاڵنی و فلاڵنی و هتد ، بەلاَم سەلەفیەت یەك ڕەوت و یەك مەنهەجە، وە ئێمە سەلەفی مەدخەلی نین و ئەوان سەلەفی فلاڵنی، جا هەرکەسێك لە ئێمە لەهەمو ئەو ڕەوتانەی چەندێك دەگەڕێتەوە بۆلای مەنهەجی ئەهلی سوننە تاوەکو زیاتر بگەڕیتەوە و موخالەفەی ئەسڵەکانی نەکات ئەوە سەلەفی یە، هەتا کەمتر بگەڕێتەوە یان موخالەفەی ئەسڵەکە بکات ئەوە یان سەلەفی نی یە یان بەقەد ئەو مخالەفانە لە سەلەفیەت دورکەوتۆتەوە ، کەوابو پێویستە ئەمانە ڕاست بکرێتەوە ، ڕەوتی بەناو سەلەفیەتی جیهادی سەلەفی نین ، چونکە ئەوانە یان کۆمەڵە کەسێکن بەڕاستی سەلەفین بەلاَم زوڵمیان لێدەکرێت یان ئەوانە فکرەی خەوارجیان هەیە و سەلەفی نین ، پیویستە ئەم دوشتە لێك جیابکرێتەوە ، وەمن نامەوێ لێرەوە قسە بەهیچ تائیفەیەك بکەم کە هەوڵ بۆ ئیسلام دەدات ، هەرکەسێك کە بەناوی ئیسلام و دینەوە دەجولێتەوە ، ئەمەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت ، یان ئەوەیە لە لایەن

ڕاگەیاندنەکانەوە ، و لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە یان ئەوەیە زوڵمیان لێدەکرێت و ناوناتۆرەیان پێوەدەنێن ، و خەڵکی باش و چاکن و خاوەن مەنهەجی ڕاستی ئیسلامن ، یان ئەوەیە ئەوانە بۆخۆیان موخالەفەی مەنهەجی ئەهلی سوننە دەکەن ، کەوابو ناکرێ حەق دوو شت بێت {الحق واحد لایتعدد فماذا بعد الحق الا ضلال}، ناکرێ کەسێك سەلەفی بێت و لەهەمان کاتدا خەوارجیش بێت ، بۆیە سەلەفیەت یەك شتە ، ئەما سەبارەت بە سەلەفیەتی مەدخەلی و سەلەفیەتی تەقلیدی بەڕاستی ئەم دوناوە هەر بە زۆر دروست کراوە ، هەندێ کەس هەیە لە وڵاتاندا ناوی خۆیان ناوە سەلەفی تەنزیمی وەك (جمعیة تراث) لە کوەیت ، و حزبی نوری سەلەفی لە مصر ، بەڵام سەلەفی مەدخەلی و سەلەفی تەقلیدی هیچیان ڕێکخراو نین ، پاشان سەلەفی مەدخەلی ئەوانەی کە لەسەر بۆچونەکانی ربیع کوڕی هادی مەدخەلی دەڕۆن ، بەڕاستی ئەمانە ڕەوت نین ، چونکە ئەوانەی لەسەر بۆچونی شێخ ربیع دەڕۆن ، باقی زاناکانی تریان فەرامۆش نەکردووە ، بەڵام لەهەندێ بابەتدا مەنهەجی شیخ ربیع یان بەدڵە لەبەر ئەوەی دراساتی تیایە ، بۆ نمونە ئەو کتابانەی لەسەر سەید قوتب نوسیویەتی دەڵێن پێکاویەتی ، ئەی ئایا لەهەموبابەتیکدا مەرجە بیپێکێ ؟ نەخێر من باوەڕم وایە هیچ کەسێك نیە

هەمو حەق لەخۆیدا کۆبکاتەوە ، کەوابوو ئەم پۆلێن کردنە هەڵەیە و بەهیچ شێوەیەك ڕاست نیە.

**پرسیار ٨/ ڕای بەڕێزتان چی یە لەسەر ئەو قسەیەی کە دەڵێ لەوانەیە سەلەفیەکانی کوردستانیش وەك سەلەفیەکانی مصر ببن بەحزب؟**

مامۆستا خلیل أحمد / لەوانەیە لە هەمو وڵاتێکدا سەلەفیەکان حزب دروست بکەن یان لەکوردستاندا لەوانەیە چەند حزبێك هەبێت ، هەروەك چۆن ناتوانم ڕێگە لە کۆمەڵێك بگرم کە حزب بەناوی ئیسلامەوە دروست دەکەن هەرواش ناتوانم ڕێگە لەکەسێك بگرم کەدەیەوێ بەناو سەلەفیەتەوە حزب دروست بکات ، و ناتوانم سکاڵای یاسای لەسەر تۆمار بکەم ، بەڵام ئایا لە ڕوی مەنهەجەوە وە بەناو سەلەفیەتەوە دروستە ؟ بێگومان نەخێر ، ئێمە چەندینجار فەتوای زانایانمان بڵاو کردۆتەوە لەسەر حەرامێتی حزبایەتی ، بە دەنگ و ڕەنگ ، کە نابێت ئیسلام و سەلەفیەت ئیستغلال بکرێت بۆ حزبایەتی کردن ، هەرچەند ئێمە لەگەڵ ئەوەین کە دینی ئیسلام بەخەڵکی بگەیەنرێت و خۆمان ماندو بکەین لە خزمەتکردنی خەڵکی بەهەمو شێوە و

شێوازێك كە شەرعی بێت ، وە خزمەتی ئەم وڵاتە بكرێت بۆ ئەوەی چاكسازی تیا بكرێت ، بەڵاّم لەبەر ئەوەی خەڵكەكەی موسوڵمانە پێویست ناكات حزبی ئیسلامی سیاسی یان حزبی سەلەفی تیا دروست بكرێت ، وە ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان حزبێكی سەلەفی لە كوردستاندا دروست بو وەك سەلەفیەكانی مصر ، ئەوكات من یەكەم كەس دەبم كە لێیان دوردەكەومەوە ، چونكە من ئیسلام و سەلەفیەت زۆر بەگەورەتر دەزانم بڕۆم بچوكی بكەمەوە لە حزبێكدا ، پاشان بۆ نمونە ئەو كەسەی كە لەكوردستاندا حزبێكی سەلەفی دروست دەكات بێگومان هەندێ كەس هەیە كە ڕێك ناكەون لەگەڵیان یان حزبێكی تر دروست دەكەن یان هەندێ كەس هەن لەدەرەوەی ئەو دوو حزبە دەمێننەوە ، وەك چۆن ئێستا چەندین حزبی ئیسلامی هەیە و موسوڵمانی سەربەخۆش هەیە كە لەگەڵ هیچ حزبێكی ئیسلامی نیە ، ئێمە ئەوكاتە لەگەڵ هیچ حزبێك لە حزبەكاندا نابین ، بۆ؟ چونكە سەلەفیەت بریتی یە لە ئیسلام ، وە سەلەفیەت گەورەترە لە حزبێكی سەلەفی ، ئەگەر حزبێك دروست كراو ناو نرا حزبی سەلەفی فلاّن كەس ، ئێمە بە پێچەوانەی ئیسلامی دەزانین ، وە بە حەلاّڵی نازانین ، وە بەهیچ شێوازێك لەگەڵی نابین ، وە ئەم نوسەرە كە دەڵێ لەوانەیە سەلەفیەكان ببن بەحزب ، هەركە بون بە حزب ، دەڵێ كەوتونەتە

ژێر فشاری ململانێی سیاسی و پەرلەمەن و هتد ، بەڵام ئێستا کە تەماشای سەلەفیەکان دەکات ناکەونە ناو هیچ هاوکێشەیەکی سیاسی و تەنها خەڵکێکی خێرخوازن و تەنها مەبەستیان گەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئیسلامی ڕەسەنە ، هەربۆیە ڕقیەتی لە سەلەفیەکان ، من ناڵێم من لە دڵمەوە دڵی ئەو نوسەرە دەناسم ، بەڵام لە پرسیارەکەوە جۆرە شتێکی وادیارە ، وە لەسەرتاوە دەڵێ ئەگەر وەك یەکگرتو و کۆمەڵ حزب بوایەن ، ئەوکات ئەوەندە توند نەدەبو بەرامبەر بە سەلەفیەکان.

**پرسیار ٩/ ئایا ڕاستە سەلەفیەکان و بانگەشەکەیان وابەستە کردنی خەڵکە بە شتە لاوەکیەکانەوە وەك پانتۆڵ کورتی و ڕیش درێژی؟ وە هەروەها ژنەکانیان لەماڵەوە دەهێڵنەوە و لەگەڵ دونیای سەردەمدا ناگونجێن؟**

مامۆستا خلیل أحمد / ئەوەی کە دەڵێ سەلەفیەکان کۆمەڵگا بە شتی لاوەکیەوە سەرقاڵ دەکەن وەك پانتۆڵ کورتی و ڕیش درێژی ، وە ژنەکانیان لەماڵەوە دەهێڵنەوە ، و لەگەڵ دونیای سەردەمدا ناگونجێن ، ئەو قسەیە هیچ ڕاست نیە ، وە ئەم قسەیەش شتێکە بۆ ناشرینکردنی سەلەفیەکان ،

بەلاّم ئەم قسەیە ئەوەندە کۆنە هەر حەق نیە وەلاّم بدرێتەوە ، چونکە سەلەفیەکان سەرقاڵی ئەوەن کە خەڵکی پانتۆڵەکەی کورت بێت و ڕیشی درێژ بێت ، چونکە ئەمانە دو واجبن و پێویستە بەجیٚ بگەیەنرێن ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا سەلەفیەکان باسی یەکتاپەرستی دەکەن ، و باسی مافی پێغەمبەر دەکەن صلى الله عليه وسلم ، و باسی پاراستنی ئەمن و ئاسایش دەکەن ، و باسی تەندروستی دەکەن ، باسی تێکەلاّوی ژن و پیاو دەکەن ، وە باسی چارەسەری کێشەکان دەکەن ، و هەرشتێك لەقورئان و فەرمودەدابێت سەلەفیەکان باسی دەکەن ، سەبارەت بەو قسەی کەدەڵیٚ ژنەکانیان لەماڵەوە دەهێڵنەوە ، من نازانم چی سودێکی هەیە ئەگەر ژنەکانمان بەرەلاّبن؟ چی سودێکی هەیە ژنەکانمان لەدەرەوە لەگەڵ پیاواندا تێکەڵ بن؟ ئایا سەلەفیەکان قسەی گیرفانی خۆیانە کە دەڵێن تێکەلاّوی ژن و پیاو حەرامە؟ ئایا ئەم نوسەرەی کە ئەم قسەیە دەکات باوەڕی بە قورئان و فەرمودە هەیە؟ ئایا لای هەمووان ئاشکرا نیە کە پێویستە بە وریاییەوە هەڵس و کەوت لە گەڵ تێکەلاّویدا بکەین؟ سەبارەت بەدونیای سەردەم ، ئێمە وەك موسوڵمان بیردەکەینەوە ، پێویستە موسوڵمان چۆن لەگەڵ دونیای سەردەم خۆی بگونجێنیٚ ؟ ئایا ئەوەیە کە ئێمە شوێن ولاّتانی

ڕۆژئاوا بکەوین و ئافرەتان بکەینە کاڵایەك و تێکەڵیان بکەین بە پیاوان بۆئەوەی لەناو بچن و لەبار بچن ، بۆئەوەی شەرم و شکۆ و شەرەف و ناموسی خێزان و منداڵەکانمان و کوڕ و کچەکانمان لەناو بچن؟! ئەمەیە دونیای سەردەم؟! ئێمە پێویستە دونیای سەردەم دروست بکەین بە شێوازێك کە ڕۆژئاوا چاومان لێبکەن ، کوا پرۆژەی ئەم نوسەرە کەدەیەوێ دونیای سەردەم دروست بکات؟! کوانێ زانکۆ و پەیمانگای تایبەت بە کچان؟ کوانێ خولی درومان تایبەت بە کچان؟ کوانێ کارگە و هۆکارەکانی پێشکەوتن تایبەت بە ئافرەتان؟ با بەڕێزیان دروستی بکات و ئێمەش ئافرەتانمان بنێرینە دەرەوە! ئایا ئەم دونیای سەردەمە لەکوێوە بۆمان هاتووە؟ لەخواوەیە یان جگە لەخوا ، ئەگەر لەخواوەیە کەواتە لە قورئان و لە فەرمودەدا هاتووە ، ئەگەر لە جگە لە خواوە هاتووە ئەوا لەکەسانێکەوە هاتووە کە هیچ ئەزمون و شارەزاییەکیان نیە ، ئەم بەڕێزەی کە ئەم شتەی نوسیوە ئەگەر باوەڕی بە ئیسلام و بەدین هەیە پێویستە سەرچاوەکەی ئیسلام بێت ، وە لە قورئان و سوننەتەوە وەریگرتبێت ، پاشان با بێینە سەر واقع: ئێمە چی قازانجێکمان کردووە لەو کاتەوەی ئەم تێکەڵاوییەی نێوان ژنان و پیاوان دروست بووە ، ئایا ڕێژەی جیابونەوە زیادی نەکردووە؟ ئایا

کێشەی خێزانی زیادی نەکردووە؟ ئایا شیرازەی ئافرەتەکانمان زیادی نەکردووە؟ ئایا چەندین (تحروش الجنسی) بۆ کچان و کورانمان دروست نەبووە؟ ئایا ئێمە ناتوانین بژین ئیلا بەوە نەبێت کە تێکەڵاوی کوڕان و کچان نەکەین؟ سەبارەت بەوەی کە دەڵێ ژنەکانیان لە ماڵەوە دەهێڵنەوە ، ئایا کام لە سەلەفیەکان ژنەکانیان لەماڵەوە بەند کردووە؟ ئەی بۆ تائێستا هیچ ژنە سەلەفیەك نەچووە سکاڵایی یاسایی لەسەر پیاوەکەی تۆمار بکات و بڵێت من مافم لێزەوت کراوە بێن فریام بکەون؟ ئایا ئەو ژنانەی کە لەماڵەوەن حەیا و حورمەتیان پارێزراوە ئازاد نین؟ بۆدەبێ ئەگەر کەسێك ژنەکەی یان کچەکەی لە بازاڕدا بە جلێکی ناشەرعیەوە بگێڕێ (ڕێزم هەیە) بیباتە هەمو شوێنێك کە مایەی ئەوە بێت زەرەر و زیانی پێبگەیەنرێت ئەو کەسە ئازاد و سەربەستە ، لە دونیای سەردەمدایە ، ئەوە نوێخوازی و پێشکەوتن بێت ، بەلاّم ئەگەر کەسێك خێزانەکەی لەماڵەوە ڕابگرێت ، خزمەتی منداڵەکانی بۆ بکات ، یان خزمەتی ماڵەکەی بۆ بکات ، یان وەك پادشا نانی بۆ بهێنێتەوە و نەهێڵێت کار بکات ، هەرچی پاشەکەوتی هەیە لەگەڵ خێزانەکەیدا بەشی بکات ، ئەمە ئەگەر بەشێوازی سەلەفیەت هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات ، چونکە من لەگەڵ هیچ تاکێکی سەلەفی نیم ئەگەر هەڵسوکەوتێکی هەڵە لەگەڵ

خێزانەکەیدا بکات ، چونکە هەمو هەڵەیەك لە میزانی سەلەفیەتە و میزانی ئیسلامدا هەڵەیە ، وە چاوپۆشی لەهەڵەی هیچ کەسێك ناکرێت لەبەر ئەوەی سەلەفیە ، پاشان ئێمە دین و مەنهەجمان نافرۆشین بە تاکە سەلەفیەکان ، هەرتاکێك چەندێك توانای هەبێت لەناو سەلەفیەکاندا لەڕوی علم و زانستەوە هەڵەکەی هەڵەیە ، وە ئەوەی کە دەڵێ بە شتی لاوەکیەوە سەرقاڵن وانیە ، چونکە ئێمە شتی زۆرمان پێیە بۆ ئەم کۆمەڵگایە ، بەڵام کوان ئەو کەسانەی کە خەریکی دیراساتن با بێن لەگەڵ سەلەفیەکاندا دیراساتی فکر بکەن ، دیراساتی عەقیدە بکەن ، دیراساتی ئابوری بکەن ، دیراساتی سیاسەتی شەرعی بکەن ، دیراساتی دڵسۆزی بکەن بۆ خزمەتکردنی ئەم وڵاتە ، بۆ ڕزگار کردنی ئەم وڵاتە لە گەندەڵی ئیداری ، و گەندەڵی فکری ، و هتد، یانی ئەوەی کە ئێستا لایەنەکان پێوەی خەریك بون لەسەر گەندەڵی فلاَن ئەمە کۆمەڵێکە لە گەندەڵی ، ئایا گەندەڵی تەنها لە پارە و ساماندا هەیە؟ یان نەخێر گەندەڵی لە ڕەوشتیشدا هەیە ، گەندەڵی لە فکردا هەیە ، گەندەڵی لە دیندا هەیە ، لادان لەهەمو شتێکدا هەیە ، ئەوەی کە سەلەفیەکان پێیانە ، یان مەنهەجی سەلەف پێیەتی لە چاکسازی کۆمەڵگا لە گەندەڵی زۆر گەورەترە وەك خەزێنەیەك ، زۆر گەورەترە لەوەی کە ئێستا لە

ڕاگەیاندنەکانەوە باس دەکرێت لەسەر چاکسازی ، هەربۆیە لەڕاستیدا نابێت و ناکرێت سەلەفیەت بە هەڵسوکەوتی هیچ تاکێکی سەلەفی حسابی لەگەڵدا بکرێت ، کە تاکێکی سەلەفی لەبەر کرچ و کاڵی یان لەبەر پێکهاتەی کە توند و تیژە و لەگەڵ کەسێکدا بەشەڕ دێت یان دەمەدەم دەکات لەسەر پانتۆڵ یان لەسەر ڕیش یان لەسەر هەر کردەوەیەکی تر ، بێن وای لەقەڵەم بدەن کە بانگەوازی سەلەفی و مەنهەجی سەلەفیەت بە تێکڕا بریتی یە لەو شتانەی کە لاوەکین ، پاشان ئەم نوسەرەی کە پانتۆڵ کورتی و ڕیش دانان بەلاوەکی دەزانێ ، گریمان ئەم دوشتە لاوەکیە لەچاو پرسی گەورەتردا ، ئایا ئەو بەڕێزە خۆی ئەو شتانە ئەنجام دەدات یان هەر ئەسڵەن ئەمە بەلایەوە هیچ نیە یان ناتوانێ ئەنجامی بدات ، من لێرەوە ئامۆژگاری هەمولایەك دەکەم : هیچ شتێك لە ئیسلامدا لەخودی خۆیدا لاوەکی نیە ، ئەگەر فەرمانی لەسەر هاتبێ ، و بە دین دانرابێت ، و خوا داوای کردبێت ، و چارەسەر بێت لە دیندا ئەوا ئەو شتە لاوەکی نیە ، ئەگەر بە بەراورد لەگەڵ شتێکی تردا پلەی کەمتر بێت ، بەڵام نابێت ئێمە هەمو دین بەوە حساب بکەین ، وە هەڵەی تاکێکی سەلەفی لەم بوارەدا بە هەڵەی هەمو مەنهەجەکە یان بەهەڵەی تاکەکانی هەمو مەنهەجەکە حساب بکەین.

**پرسیار ١٠/ ئایا دەستی دەرەکی لە پشت سەلەفیەکانەوە هەیە بە تایبەت وڵاتانی دەوروبەر بۆ تێکدانی ڕەوشی هەرێم؟**

مامۆستا خلیل أحمد / من نازانم ئەگەر دەستی دەرەکی لە پشت ئێمەوە هەبێت یان نەبێت ، ئێمە خۆمان هەست بە هەبونی ساردی و گەرمی هیچ دەستێك ناکەین ، نە کەسێك جوڵاندوینی بۆئەوەی بەکارمان بێنێ ، نە قازانجمان لە پارە و پولی هیچ کەسێك کردووە ، پاشان ئەم پرسیارە خۆی بۆخۆی تاوانبار کردنی بەرپرسەکانی کوردستانە هەر لەسەرۆکی هەرێمەوە تا دەگاتە تێکڕای ئەندامانی حزبە دەسەڵاتدارەکان ، وەئەگەر دەستی دەرەکی لەپشتمانەوە هەبێت بۆ تێکدانی ڕەوشی هەرێم تائێستا ڕەوشی هەرێممان تێکدابوو ، وە ئەگەر سەلەفیەك بەیانی تا ئێوارە لە نوسینەکانی و وتارەکانی بپاڕێتەوە لە خوا بۆئەوەی ئەمن و ئاسایشی ئەم وڵاتە بپارێزێ ، وە بەهیچ شێوەیەك قسە بەهیچ کەسێك نەکات چ بەحاکم و چ بە مەحکومەوە ، وە ئەوەندەی سەلەفیەکان ئەمن و ئاسایشیان بەلاوە گرنگە کار گەیشتۆتە ئەوەی بە پیاوی دەسەڵات حساب دەکرێین ، لە ڕاستیدا ئێمە نە پیاوی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانین و نە هیچ وڵاتێکی تری دەرەوەی هەرێم ، وە سەر بە هیچ حزب و لایەنێك نین چی لەبەر دەسەڵاتەکەیان یان لەبەر

حزبەکەیان ، بەلاّم بەلامانەوە گرنگە بارودۆخی ئێستای ئەم ولاّتە پارێزراو بێت بۆئەوەی چاکسازی و بانگەشەی ئیسلامی حەق و لێك تێگەیشتن بەرپاببێت ، پاشان ڕەوشی هەرێم بە ئێمە تێك ناچێت ، ڕەوشی هەرێم بەکەسێك تێکدەچێت کە مەرامی سیاسی و حزبی ، و مەرامی شەخسی و گیرفانی خۆی ، و بەدوای پۆست و پلە و پایەدا بگەڕێ ، بەلاّم ئێمە پڕ بەدەمی خۆمان هاوار دەکەین و دەڵێین پلە و پایەمان ناوێ ، کورسی و پارە و پولمان ناوێ ، و موچە و ئافەرینمان ناوێ ، ئێوە برای ئێمەن ، و ئێوە کەسی ئێمەن ، ئێمە تەنها خێرمان دەوێ بۆ ئەم ولاّتە ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ پاداشتی ئێمە لای خوایە ، بەلاّم ئامان سەد ئامان ئێوە چاك بن ، و ئێوە موسوڵمان بن ، و ئێوە برای یەك بن ، و ئێوە شەڕ و مەشاکل دروسن مەکەن ، و ئێوە ئاگاتان لە میللەت بێت ، ئەمە بەرنامەی ئێمەیە ، وە ئەگەر دەستی دەرەکی هەر ولاّتێك لە پشت ئێمەوە بوایە بە درێژای ئەوەندە ساڵ نەدەبو دەرکەوتایە و ئێستا ئێمە لە هاوکێشەیەکی سیاسی هەرێمدا بەشداریمان بکردایە ، بە ڕاستی ئێمە سەر بەهیچ ولاّتێك نین ، وە هیچ دەستێك نامانجولێنێ ، ئەگەر بیشیەوێ ، هەرناتوانێ بمانجولێنێ ، چونکە بەڕاستی ئێمە تاسەر ئێسقان خۆماڵین ، و بەهیچ شێوازێك ان شا ءالله

لەخشتە ناچین بەوەی کە ولاّتی خۆمان و میللەتی خۆمان و دین و خاك و ئاوی خۆمان بفرۆشین بۆ هیچ کەسێکی تر ، چونکە ئەوانەی ئەو کارانە دەکەن لەبەر بەرژەوەندی دونیای خۆیان دەیکەن ، ئێمە پشت بەخوا دەمانەوێ دینداری بکەین بەلاّم دینداریەکیش نەبێت کە لەپێناوی دینداری کردنەکەدا پێشبرکێی زەمان بکەین و دنیا کاول بکەین و مەشاکلێك بۆ خەڵکی دروست بکەین ، ئێمە دەڵێین لەگەڵ نەیارەکانماندا ، ئەوانەی لەگەڵ ئێمە پێکنایەنەوە لە (حزب ، لایەن ، مەزهەب ، ولاّت ، هتد) کێ دەیەوێ دژایەتیمان بکات ئێمە (صبر)مان هەیە بەرامبەری ، کێ دەیەوێ لەناومان ببات ، ئێمە دەڵێین خوایە تۆ چاکی بکە و لەناوی مەبە ، بەڕاستی ئێمە زۆر لەوەوە دورین کە ڕەوشی هەرێم بشێوێنین ، ئەمەشمان لە ترسەوە نیە ، بەڵکو باوەڕمان پێیەتی ، وە ئەگەر بەدوای پلە و پایەوە بین ئەوا هەوڵی بۆ دەدەین ، ئێمە ئەم نەرم و نیانیە و ئەم مەنهەجە سەلەفیەتەی کە باوەڕمان پێیەتی لەم ولاّتەدا پیادەی بکەین ، نەلەبەر ترسە لەهیچ حزبێکی ئیسلامی و علمانی ، نەلەبەر موچە و پلە و پایەیەکی دونیاییە ، وە ئەم مەنهەجە بە دین دەزانین ، وەئێمەش ئازادین لە پێڕەو کردنی ئەم مەنهەجە ، وەك چۆن هەموتاکێك لەم ولاّتە ئازادە لەوەی مومارەسەی چی فکرەیك بکات ، هەرکات

ئێمە بوین بەئەرك بەسەر خەڵکەوە کێشەمان بۆ دروست کردن ، ئەوکات دەرگامان کراوەیە بۆ ئامۆژگاری هەمو کەسێك ، وە ئاگادارمان بکاتەوە بۆئەوەی ئێمە جگە لە چاکە هیچی بەرامبەر نەکەین.

**پرسیار ١١/ ئەم نوسەرە دەڵێ: ئێمە چەندین جار دەسەڵاتمان ئاگادار کردۆتەوە لە مەترسیەکانی ئەم ڕەوتە بەتایبەت پارتی ، کە ئەم سەرچاوەیە پێی وایە پارتی پشتیوانی لە ڕەوتی سەلەفیەت دەکات ، وە پێشتریش لەلایەن چەند مامۆستایەکی ئاینی یەوە بەنوسراو ئەم کێشەیان بەخودی مسعود بەرزانی گەیاندووە ، بەڵام بەڕاشکاوانە پێی وتون ئەمە لەدەسەڵاتی مندا نیە ، ئەم سەرچاوەیە دەڵێت دیارە دەسەڵاتێکی لەوە گەورەتر هەیە کە یەکێتی و پارتیان ناچار کردووە کە ملکەچ بن بە بەرنامەی سەلەفیەت لە هەرێمی کوردستاندا؟**

مامۆستا خلیل أحمد / ئەم کەسەی کە دەڵێ دەسەڵاتمان ئاگادارکردۆتەوە لە مەترسیەکانی ئەم ڕەوتە ، نازانم ئەم کەسە چی پۆستێکی هەیە ، یان سەر بە چی ڕێکخراوێکە ، بۆ خۆی ئاشکرا ناکات ؟! بزان سەر بە چی مەزهەبێکە؟ پاشان مەترسیەکانی ئەم مەنهەجی سەلەفیەتە چی یە؟

مەترسیەکان لە کویێ یە ، کە ئەو ئەوەندە شارەزا و پسپۆرە حکومەتی ئاگادار کردۆتەوە و حکومەتیش ئەوەندە بێئاگا و بێ عەقڵە هەستی بەو ترسناکیە نەکردووە کە ئەو هەستی پێکردووە ؟! بەڕاستی من نازانم ئەم کەسە لە چی ئاست و پۆستێکدایە کە حزبی دەسەڵاتدار لە پارتی و لە یەکێتی یان خەڵکی زۆر سیاسەتمەدار لەم وڵاتە بێئاگابن لە ڕەوشی هەرێم ، بێئاگابن لە ڕەوتی سەلەفی تا ئەو هەستی پێکردبێت و ئەوان هەستیان پێنەکردبێت؟! وە دەربارەی ئەوەی کە دەڵێ پێشتریش لەلایەن چەند مامۆستایەکی ئاینی یەوە بە نوسراو ئەم کێشەیان بە کاك مسعود گەیاندووە ، بەڕاستی ئەمە ئەگەر بوبێت دیارە کۆمەڵە مامۆستایەك تێگەیشتنێکی هەڵەیان هەیە بەرامبەر بە سەلەفیەکان ، چونکە ئەگەر سەلەفیەکانیان بناسیایە دەهاتن لەگەڵ سەلەفیەکان قسەیان دەکرد ، چونکە سەلەفیەکان کوڕی ئەوانن ، برای ئەوانن ، خزمەتکاری ئەوان دەکەن ، وە ئێمە دەرگامان کراوەتەوە بۆ هەمو مامۆستایەکی ئاینی چ مەنهەجی وەك ئێمە بێت یان مەنهەجی جیای هەبێت هەر جۆرە ئامۆژگاریەك ، هەر جۆرە دیراسات و بیروبۆچون گۆڕینەوەیەك هەیە ئێمە لەگەڵیداین ، پاشان ئەگەر شتێکی وایان بە کاك مسعود وتوە و ئەویش بە ئاشکرا پێی وتون ئەمە لەدەسەڵاتی مندا

نیە ، ئەمە دوو قسەی زۆر ترسناکی تیایە ، ئەگەر کاك مسعود وتبێتی لە دەسەلاَتی مندا نیە ئەمە جۆرە تانەیەکە لە سەرۆکی هەرێم کە کەسێکی بێدەسەلاَتە وە ئەمەش قسەیەکی زۆر هەڵەیە ئەگەر وتبێتی ، ئەگەر لە دەسەلاَتی ئەودا نەبێت ئەی لە دەسەلاَتی کێدایە؟! یان ئەم قسە کلك و گوێ کراوە لە قسەکانی کاك مسعودەوە ئەگەر وتبێتی و شتی وا ڕویدابێت ، بەقسەی ئەم نوسەرە بێت کەسێکی بالاَدەست لە ولاَتێکی ترەوە کاك مسعودی ناچار کردووە بەم شێوەیە لەگەڵ سەلەفیەکان دا بجولێتەوە ، ئەمەش بۆخۆی هەڵەیەکی ترە ، واتە کاك مسعود و سەرۆکایەتی هەرێم و سەرکردایەتی سیاسی کورد نۆکەری ولاَتانن و لەژێر فشاری ولاَتانن ، هیچیان بەدەست نیە ، خاڵێکی تر ئەوەیە کە بانگەوازی سەلەفیەت ئەوەندە گەورە دەکاتەوە لە ترسناکیدا تەنانەت کاك مسعود یش دەسەلاَتی بەسەریدا نیە ، وە ئێمە سەر بەولاَتێکی ئەوەندە بالاَدەستین کاك مسعودیش چاری ناکات بۆیە خەڵکینە فریای ئەم کێشەیە بکەون ، وە قسەیەکی سەیرتری ئەوەیە کە دەڵێ دەسەلاَتێکی زۆر گەورە هەیە کە یەکێتی و پارتی ناچار کردووە ، بەڕاستی من نازانم ئەم دەسەلاَتە کێ یە کە یەکێتی و پارتی ناچار کردووە بۆئەوەی لە بەرنامەی سەلەفیەت بێدەنگ بن تاوەکو سەلەفیەت بلاَوەبکات و

بلاْو بێتەوە چ وەکو ئەوەی کە سەلەفیەتە و لەبەر خودی سەلەفیەت یان بۆئەوەی هەر مەرامێکیان هەبێت بە سەلەفیەت ، وە بەڕاستی ئەمە قسەیەکە زۆر دوورە لە ڕاستیەوە ، وە تۆمەتی زۆر ترسناکی تیایە بۆ سەرکردایەتی سیاسی کورد و بانگەشەی سەلەفیەت و سەلەفیەکان لە کوردستان ، پێویستە خەڵك ئەوە بزانێت کە سەلەفیەکان کۆمەڵێك مامۆستان کە کوڕ و نەوەی خەڵکن ، وە بەدەیەها و سەدەها کەسی تیایە کە خاوەن بنەماڵە و ناو و ناوبانگن ، و خاوەن بڕوانامە و خاوەن دڵسۆزین بۆ خاك و ئاو و میللەتی کورد ، ئەی کوا ئەو تۆمەتەی گوایە ئێمە حزبێك ، لایەنێك ، ولاْتێك لە پشتمانەوەیە ؟ پاشان ئێمە کەی و لە کوێ تۆمەتمان بۆ هیچ لایەنێکی سیاسی ئیسلامی و عەلمانیمان کردووە بەم شێوەیە ، و بە بێ بەڵگە و بێ بنەما ، وە ئەم نوسەرەی کەئەمەی نوسیوە ئەگەر هەر زانیاریەکی لایە لەسەر ئەوەی هەر ولاْتێکی دەرەکی کە فشاری خستۆتە سەر سەرکردایەتی سیاسی کورد و لەدەسەلاْتی سەرکردایەتی سیاسی کورددا نیە بە کاك مسعودیشەوە ئەی بۆ ئاشکرای ناکات؟! یان ئەمە خۆڵکردنە چاوی خەڵکە و غەش و خیانەتە لە خەڵك یان بە کوشت دان و بەهەڵدێرابردن و مل شکاندنی تاك تاکی سەلەفیەکانە ، وە ئەگەر ئەم بابەتە لە دەسەلاْتی سەرکردایەتی

سیاسی کورددا نەماوە دەبیَ ئێمە ئێستا چیمان بکردایە لە کوردستاندا؟ بەڕاستی ئەم قسەیە زۆر ترسناکە ، وە من داواکارم نوسەری ئەم ڕاپۆرتە تۆبە بکات و بەخۆیدا بچێتەوە ، وە ئێمە توندی بەرامبەر نانوێنین ، ئەگەر ئەو دەیەویَ ئێمە لەم وڵاتەدا نەژین ئەوا ئێمە دەمانەویَ ئەو بژی با لەگەڵیشمان نەبیَ ، ئێمە ڕێزمان هەیە بۆ ئەو تێگەیشتنەی ، لەوانەیە ئەمڕۆ یان بەیانی، هەڵەیەك لەمن و هەڵەیەك لە ئەو لە ئەنجامدا پێکبێینەوە ، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە دیراسە و چارەسەی بابەتەکان بکرێت شتێکی زۆر ترسناکە.

**پرسیار١٢/ ڕای بەڕێزتان چی یە لەسەر ئەو قسەیەی کە دەڵیَ: ڕەوتی سەلەفی مەدخەلی کار لەسەر مێشکی دیندار دەکات و دەیکات بە کەسێکی ئوصولی ، ئەمەش کاریگەری خۆی دەبێت؟**

مامۆستا خلیل أحمد / ئەم پرسیارە پێشتر وەڵام دراوەیە، کەوا ڕەوتێك نیە بەناو سەلەفی مەدخەلی، وە سەلەفیەت یەك مەنهەجە ، وە ئێمە خۆمان باوەڕمان بە مەدخەلیەت نیە بەوەی کە دەمارگیریمان تیابێت بۆ ربیع کوری هادی مەدخەلی یان بۆ هەر کەسێکی تر ، ئێمە تقلیدمان بکردایە تقلیدی

شافعی و أحمدی کوڕی حنبلمان دەکرد ، یان تقلیدی کەسانی پێش ئەوانمان دەکرد ، وە ئێمە دین لە جگە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهیچ کەسێکی ترەوە وەرناگرین ، چونکە تەنها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (معصوم)ە هەڵەناکات لە شەریعەت دا ، بۆیە ڕەوتی سەلەفی مەدخەلی هەر بونی نیە ، ئەما ئەگەر بۆ نمونە ئەم سەلەفیانەی کە لەم سەردەمەدا دەژین بەتایبەت سەلەفیەکانی کوردستان کە مەنهەجی شیخ ربیع یان بەدڵە وەك مامۆستایەکی سەلەفی ، یان وەك زانایەکی سەلەفی تەماشای دەکەن ئەوا ئینکاری لەمە ناکەین ، وەتەنها ئەوەندەیە کە وەك زانایەك تەماشای دەکەن ئەگینا بە (معصوم)ی نازانن وە واش نازانن کە هەمو قسەکانی (صواب) بێت و بیپێکێت ، وەك بەبیرهێنانەوەیەك کاتی خۆی پرسیاریان لە شێخ مقبل کرد ڕەحمەتی خوای لێبێت دەربارەی شێخ ئەلبانی ، پاش ئەوەی هەندێ وەسفی کرد ، فەرموی (غیر انه یعلم یجهل ویخطئ ویصیب) ئێمەش سەبارەت بە هەمو کەسێك چی مامۆستا بێت یان زانا هەروا دەڵێین (غیر انه یعلم یجهل ویخطئ ویصیب)، وە لایەنگری هیچ کەسێك نین نە ئێستا و نەداهاتوو ، ئێمە نە لەفکرەوە واین کەخەڵك بە سەواب بزانین بەتەواوەتی وەنە بەرژەوەندییەکیش لەپشت بابەتەکەوە هەیە کە ببینە بەکرێ گیراوی

هەر کەس و حزبێك . پاشان سەبارەت بەو قسەی دەڵێ کار لەسەر مێشکی خەڵك دەکات و دەیکات بە کەسێکی ئوصولی ، ئەگەر ئوصولیبون بەمانا باشەکەی بێت کە خەڵکی بگەڕێتەوە بۆ ئەسڵەکان و بنەماکانی ئاینی ئیسلام بەڕاستی ئێمە ئوصولین ، ئەما ئەگەر بەو مانایە بێت کە ئوصولی واتە خەڵکێکی توند و تیژ ، یان خەڵکێك گوێ نەداتە حاڵی ئوممەت و بەرژەوەندی میللەتەکەی بەلاوە گرنگ نەبێت ، بەڕاستی ئێمە ئەو ئوصولیە نین کە لە میدیاکانەوە قسەیان پێدەکرێ و باسیان دەکەن ، بەڵام وەك زاراوە ئوصولیەت شتێکی باشە ، کەدەڵێ کاریگەری خۆی دەبێت، بەڕاستی من نازانم ئەم نوسەرە لە چی ئایندەیك دەترسێ ئەگەر خەڵك بگەڕێنەوە و دەست بە بنەماکانی ئاینی ئیسلامەوە بگرن ، ئایا ئەم نوسەرە لەوە دەترسێ خەڵك دەست بە بنەماکانی ئاینی ئیسلامەوە بگرن ؟ ئایا چی گرەنتیەکی پێیە ئەگەر خەڵك دەستیان گرت بە بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە سەر زەوی تێك دەچێ؟ وە ئایا ئەمە دژایەتی کردنی ئیسلام نیە؟ یان ئوصولیەت بە توندوتیژی و ئیرهاب دەزانێ؟ ئەگەر ئوصولیەت توندوتیژی و ئیرهاب و ئەو ڕێچکانە بێت کە کەسانێك پیادەی دەکەن لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە و سەلەف نین ، ئەوا ئێمەش لێی بەرین.

**پرسیار ١٣/ هەر لەم بابەتەدا لێدوانی کەسێك وەرگیراوە بەناوی (زیرەك أحمد) شارەزا لەڕەوتی سەلەفیەت کە پێی وایە سەلەفی مەدخەلی مێشکێکی وشکی هەیە لە ڕوی سیاسەتەوە و بەرگەی ئەو (واقعە) ناگرێت بۆیە جیهاد هەڵدەبژێرێ ، بۆیە لەسەلەفی میانڕەوەوە دەبێتە سەلەفی توندڕەو؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بەڕاستی من زیرەك أحمد ناناسم، وە نازانم شارەزایە لە ڕەوتی سەلەفیەت یان نا، ونازانم چی بەرنامەیەکی هەیە ، وەمن ڕێزم هەیە بۆهەر کەسێك کە هەرچیەك دەڵێت ئازادە ، بەلاَم کە پێی وایە سەلەفی مەدخەلی مێشکی وشکە ! وەك لە پێشەوە ئاماژەم پێکرد ڕەوتێك نیە بەناوی سەلەفی مەدخەلی ، بەلاَم من بۆخۆم ربیع کوڕی هادی مەدخەلی بە پیاوێکی چاك دەزانم ، و مێشکیشم وشك نیە و زۆر تەڕە ، و ئامادەی هەمو جۆرە گفتوگۆیەکم ، و لە ژیانم دا جگەلە سود گەیاندن بەم خەڵك و میللەتە و دوعای خێر بۆیان هیچ شتێکم نەویستووە ، پاشان کە دەڵێ مێشکی خەڵك وشك دەکەن لەڕوی سیاسەتەوە ، بەڕاستی نازانم چیان لەسەلەفیەکان دەوێ؟ دەیانەوێ ببنە ئۆپۆزسیۆن و ولاَتەکە تێك بدەن یان ئەگەر شتێکت پێنەکرا تێکی بدەیت؟! سەلەفیەکان کە بەشداری سیاسەت ناکەن ، و حزبی

سیاسی دروست ناکەن ، و نابن بە ئۆپۆزسیۆن دژ بەدەسەلآت ، ئەوەنیە کە لە سیاسەت نازانن ، بەڵکو سەلەفیەکان سیاسەتی شەرعی و لە سیاسەت زانی وای لێکردون کە لە ولآتێکی وەکو هەرێمدا دەست بۆ دروستکردنی حزبی سیاسی نەبەن ، چونکە ئەگەر ئەو هەمووە حزبە ئیسلامی و عەلمانیەی کە چەندین ساڵە شۆڕش دەکەن بەس نەبن بۆ ئەم هەرێمە لەڕوی بەڕێوە بردنەوە ، ئایا دروستکردنی حزبێکی تر لە ڕوی شەکلەوە چی گۆڕانکارییەك ڕودەدات؟ پاشان کە دەڵێ سەلەفیەکان لە بواری سیاسەتدا بەرگەی ئەم **(واقعە)** ناگرن، ئەمە قسەیەکی زۆر **(نامنطقیە)** چونکە سەلەفیەکان لە کوردستان و لە عێراق و لەهەر شوێنێکدا هەبون لەکاتی ڕودانی ڕوداوەکاندا ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەڵك بون ، بۆنمونە لەکاتی هاتنی هێزی ئەمریکا بۆ عێراق بووە هۆی لادانی حکومەتی ڕژێمی بەعس لەوکاتەوە ئێمە پەیتا پەیتا لەگەڵ خەڵکدا قسەمان کردووە بۆئەوەی بەشێوەیەکی باش لەگەڵ ئەم ڕوداوەدا گەورەدا هەڵس و کەوت بکەن ، وەلەکاتی هاتنی ئەمریکادا ئێمە خەڵکمان نەداوە کوشت ، نەمان وتووە هێزی ئەمریکا لەهەر کوێوە دەرکەوت ئێوە تەقەی لێبکەن ، ئەمە لەکاتێکدا ئێمە ئەمریکا بە موسوڵمان نازانین لەڕوی دیانەتەوە نەك لەوەی کە هەمو هێزەکە کافر بن ،

بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر خوێندنەوەمان بۆ بارودۆخەکە ، و لەبەر ئەوەی دەزانین هەیمەنەی ئەمریکا زۆر لە وزە و توانای موسوڵمانان زیاترە ، چونکە بە هاوپەیمانی کۆمەڵێك ولاَتانی زل هێز کراوە ، وە بەرگری کردن نەلەتوانای گەنجەکانمانە ، نەلەتوانای حزبە ئیسلامیەکانە ، نەلەتوانای ولاَتە ئیسلامیەکانە ، هەر بۆیە (واقع) بینی و لەسیاسەت زانی ئێمە کارێکی کرد خەڵکمان نەدایە کوشت ، ئەگەر لەکوردستان تەماشا بکەین هیچ گەنجێکی سەلەفی ، و هیچ کۆمەڵە موسوڵمانێکی سەلەفی پەلاماری هێزی ئەمریکای نەدا ، پاشان لەگەڵ دەسەلاَتی عەلمانی لە کوردستان ، و لەگەڵ دەسەلاَتی عەلمانی لە بەغداد ، و لەگەڵ دەسەلاَتی شیعە ، تا ئێستا بانگەشەی سەلەفی هەڵس و کەوتی زۆر ئیجابی لەگەڵ ئەو واقعەدا دەکات کە تیایدا دەژی ، بۆیە ئەمە هەموی سیاسەت زانی یە ، وە دور بون و بەرگە نەگرتن نیە ، بەڵکو ئەوانەی کە پێیان هەڵدەخلیسکێ و لەهەر کوێوە با بێت لەوێوە شەن دەکەن و بە جامێك ئاو دەکەونە مەلە ، ئەوانە بەرگەی واقع ناگرن ، ئەگینا ئێمە ئەوە بۆ چارەکە سەدەیەکە کە کۆمەڵە گەنجێك بوین خەریکی بانگەشەی سەلەفیەتین ، مەنهەجی سەلەفیەت پیادە دەکەین ، و لەگەڵ هەمو بارودۆخێکدا هاتوین بە بێ ئەوەی تەنازول لە بیروباوەڕی خۆمان

بکەین ، و بە بێ ئەوەی وڵاتمان بفرۆشین ، و بە بێ ئەوەی خەڵك بەکوشت بدەین ، و بەبێ ئەوەی ملی هیچ کەسێك بشکێنین ، و بەبێ ئەوەی زیان بە هیچ کەس و لایەنێك بگەیەنین ، ئارامەمان گرتووە لەسەر خزمەتی خۆمان بە دینمان ، بە خاکمان ، بە خەڵکمان . سەبارەت بەوەی کە دەڵێ ئەم سەلەفیانە بەرگەی واقع ناگرن و ئەگەر سبەینێ فشاریان بخرێتە سەر جیهاد هەڵدەبژێرن و لە سەلەفی میانڕەوەوە دەبنە سەلەفی توندڕەو؟ ئێمە گەنجەکانمان وا پەروەردە ناکەین ئەگەر فشاریان بکەوێتە سەر بەرگە نەگرن بەڵکو بە پێچەوانەوە ئێمە خەڵکمان بەشێوەیەك پەروەردە کردووە ئەگەر پشتیشیان لەدار بدرێ ئارامگربن ، ئەگەر زوڵم و زۆر بگاتە ئەو ئاستەی کە لە بەندینخانەکاندا دابرزێین ، لەبەر ئەوەی ئێمە بڕیارمان داوە خزمەتکاری میللەتی خۆمان بین بە هیچ شێوەیەك دژیان نەوەستین جگە لە چاکسازی هیچی تر نەکەین ، ئەم قسەیەش بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کەمن باوەڕم بە سیاسەتی شەرعی نیە ، و باوەڕم بە جیهاد نیە ، و باوەڕم بە گۆڕینی حوکم نیە ، بەڵام بەو شێوەیە نە کە لە بەرژەوەندی خۆمدا بێت ، وە بەوشێوەیە نە کە هەرکات بەرژەوەندیم کەوتە لێژی و بەند کرام ئەوکاتە خەڵکی هاندەم لە حکومەت و فەتوای کافرکردن و هەڵکوتانە سەر حکومەت بدەم ، وە

لەگەڵ ئەوەش نیم حاکمی کافر بە موسوڵمان بزانرێ و پاساوی بۆ بێنیتەوە و ماستاوی بۆ بکەیت ، حاکم ئەگەر کافر بێت پشتگیری بکەیت ، و زاڵم ئەگەر لەسەر حوکم بو برۆی زوڵمەکە خۆش بکەیت ، وە من ئەگەر پێم کرا دەیگۆڕم ، ئەگەر پێم نەکرا بەشێوەیەکی ئیجابی هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکەم لە چوار چێوەی شەرعدا ، بەڵاّم ئەگەر هاتو گەنجێك یان چەند گەنجێك ببنە سەلەفی توندڕەو یان ببنە کەسێکی ئیرهابی ، ئەوا ئەو تاکە کەسانە لە هەمو حزب و لایەن و مەزهەبێکدا هەن ، وەك دەڵێن (العبرة بالغالب الشائع لا بالقليل النادر) عیبرەت بە زۆرینەیە، وە زۆرینەی سەلەفیەکان لەسەر ڕەوتی خۆیان ماونەتەوە و برەو بە بانگەشەکەی خۆیان دەدەن ، بونەتە چرا و مۆم بۆ گەیاندنی دینی ئیسلام ، وە بونەتە سەرمەشق و پێشەوا لەسەر مانەوەی مەنهەجی ڕاست ، بە بێ ئەوەی پێیان هەڵبخلیسکێ و بەرەو لای ئەم ولاّت و ئەو ولاّت و بۆلای برۆن ، وە ئێستاش ئەوانەی کە دینی ئیسلام بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە باس دەکەن ، و تاوەکو ئێستا بە هیچ شێوەیەك تێوەنەگلاون لە فەساد و گەندەڵی بریتین لە سەلەفیەکان و ئەوانەی وەك سەلەفیەکان دەجوڵێنەوە ، خوای تعالى هەمولایەك مۆفەق بکات.

**پرسیار ١٤/ ئایا ڕەوتی سەلەفیەت چۆن دەتوانن گوێڕایەڵی دەسەڵات بن لە کاتێکدا ئەوان باوەڕیان بە نوێگەری نیە؟**

مامۆستا خلیل أحمد / ئەم دو قسەیە هیچ پەیوەندیەکیان بەیەکەوە نیە ، چونکە نوێگەری ئەگەر علمانیەکانی کوردستان بیکەن کە دەسەلاّتدارن و حاکمن ، ئێمە هەموشتێکی خۆمان گریٚ نەداوە لەگەلٚ یەکێتی و پارتی ، وە ئەوانیش هەمو شتێکی خۆیان گریٚ نەداوەتە ئێمەوە ، وە سەرکردایەتی کورد لەبەر بانگەشەی سەلەفی پەکیان نەکەوتووە ، وە سەلەفیەتیش لەبەر دەسەلاّتداری و حوکمڕانی هەرێمی کوردستان پەکیان نەکەوتووە ، لە ڕاستی دا ئەم دوو بابەتە پەیوەندیان بەیەکەوە نیە ، ئێمە هەرئەوەندەی توانامان هەبێت کەمتەرخەمیمان نەکردووە لەگەیاندنی دینی ئیسلام ، سودمان بینیوە لەو ئەمن و ئاسایشەی کە بەرقەرارە بە فەزڵی خوای پەروەردگار ، پاشان بە توانای ئەوانەی کە هەولٚ و کۆششیان کردووە بە ئیسلامی و عەلمانیەوە ، ئەمما عەلمانیەکانی کوردستان یان سەرکردایەتی کورد چۆن بیانەویٚ نوێگەری بکەن و پیادەی بەرنامەیەك بکەن کە تاسەر ئێسقان عەلمانیە وەکو لە قسەکەی ئەم بەڕێزەوە دیارە ، بەلاّم سەلەفیەکان کە دەیانەویٚ سەلەفی بن هیچ کارمان بەوە نیە کە لاسای ئەوان بکەینەوە یان ئەوان لاسای ئێمە

بکەنەوە ، وە ئێمە دەتوانین لەژێر دەسەلاتێکدا بژین ئەگەر کوفر و شرکیشی تیابێت و ئێمە نەتوانین بیگۆڕین ، ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە ئەگەر حاکم و دەسەلاتداری ئەم ولاتە موسوڵمان بن و شەریعەتی ئیسلام جێ بەجێ بکەن لەگەڵیدا دەژین ، مەرج نیە ئەگەر شەریعەتی ئیسلامی جێ بەجێ نەکرد هەڵبکوتینە سەری و خوێن و ئاو تێکەڵ بکەین ، ئەگەر شەریعەتی ئیسلامی جێ بەجێ نەکرد و کوفر و شرکی ئەنجامدا ، ئێمە چەند لەتواناماندایە بانگەشەی خۆمان دەکەین ، پاساو بۆ هیچ کوفر و شرکێك ناهێنینەوە کەلەم ولاتەدا دەکرێ ، شەریکیش نین لە تاوانی هیچ کەسێك ، ئامۆژگاری هەمو کەسێك دەکەین بە حاکم و محکومەوە ، لەهیچ ناشەرعیەکدا بەقسەی هیچ بەپرسێك ناکەین ، ئێمە تەماشای ڕۆڵی خۆمان دەکەین لە کۆمەڵگادا چەندمان لە توانایە خزمەتی دین بکەین ، خزمەتی خەڵك بکەین ، ئایا ئەو کاتە لەبارە بۆ ئەوەی بەدەنگ بێین لەو کوفر و شرکە یان شتی تر لە پێشترە ؟ بۆیە هەمو ئەوانە خوێندنەوەی تایبەتی بۆ دەکرێ ، ئێمە ئەوەندە کرچ و کاڵ نین ئەگەر بۆنمونە لەم دونیایەی کە ئێستا چاك و خراپ تێکەڵ بووە ، وەك عەرەب دەڵێ (حابل و نابل) تێکەڵ بووە ، ئەگەر سەرکردەیەکی کورد باسی دیموکراسیەتی کرد ، یان باوەڕی بەهەندێ لە دیموکراسیەت بوو

، یان باوەڕی بەهەندێ لە عەلمانیەت بوو ، ئێمەش لەبەرامبەردا بکەوینە تەکفیر کردن و کوردستان تێك بدەین ، ئەمە بێگومان هەڵەیە ، بەڵکو ئێمە دەزانین خەڵکی ئێمە حاڵەتێکی تایبەتی هەیە ، وە توانای ئێمەش لەحاڵەتێکی تایبەتدایە ، ئێمە هەتا پێمان بکرێ ئارامدەگرین لەسەر خەڵکی خۆمان بە چاکسازی ، بە ئامۆژگاری ، بە بانگەشەیان بۆلای ئیسلامی ڕەسەن ، چونکە ئەگەر واش نەکەین ، بۆنمونە گریمان هاتینە سەر ئەوەی ئەو حاکمەی کە کافرە دەبێت بگۆڕێت ، توانای گۆڕینیانمان نیە ، چونکە موسوڵمانانی سەلەفی ئێستا خاوەن هێزی جەماوەری نین ، وەخاون چەك نین ، وە هیچ ولاتێکی زلهێزیان لەگەڵ نیە ، بۆیە هەر جۆرە دەستکاریەك لەگەڵ هەر حاکمێك دەکەیت ئەگەر لە ئەسڵی ئیسلام لایدابو ، ئەوەندە شتی دەرەکی دێتە ناو بابەتەکەوە کە دەبێتە هۆی خەسارێکی زۆر تا دەگەیتە مەبەستەکەت ، بۆیە ئەوانە هەموی پەیوەستە بە کۆمەڵێك بنچینەوە لە بنچینەکانی (مصالح و مفاسد) ، ئێمە باوەڕمان وایە ئێستا لەبار نیە بۆئەوەی ئەگەر حاکمێك شرك و کوفری هەبو پێویستە بیگۆریت ، بۆیە پێویستە هێمنی ڕاگرین و خەڵکی لەدینی ئیسلام شارەزا بکەین ، وەك چۆن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەوشێوەیە هەڵس و کەوتی کرد لەگەڵ

سەرانی قورەیش لەکاتێکدا کافر بون ئەو خەریکی بانگەشە کردن بو بۆ دینی خوا تا ئەوکاتەی دەرفەتێك هەبوو توانی شەریعەتی ئیسلام جێ بەجێ بکات ، ئێمەش بەلامانەوە گرنگە شەریعەتی ئیسلام جێ بەجێ بکرێت ، پێمان خۆشە لە ئێستادا چی حاکمێکی کوردستان دورە لە شەریعەتەوە بگەڕێتەوە سەری و جێ بەجێی بکات ، نەك ئێمە لە داهاتودا ئەگەر بۆمان بکرێ شەریعەتی ئیسلام جێ بەجێ دەکەین بەومانایەی کە خۆمان بۆ خۆمان حەزی لێدەکەین و بکەوینە خەڵك کوشتن ، بەڵکو پێمان خۆشە هەر لە ئێستاوە حاکمەکانمان شەریعەتی ئیسلام جێ بەجێ بکەن ، و لەشوێن و جێگەی خۆیان بمێننەوە و کار و باری موسوڵمانان ڕاپەڕێنن ، وە هەرکەسێکیش شەریعەتی ئیسلامی جێ بەجێ نەکرد ڕق و قینی خۆمانی بەسەردا نارێژین ، بۆیە لێرەوە دەڵێم ئەو نوێگەرییەی کە خەڵك دەیکەن لە کاربەدەستان ئێمە زۆر بە جوانی ئاگامان لێیەتی و بە پێی بنچینەی زانستی خۆمان هەڵس و کەوت لەگەڵ بابەتەکاندا دەکەین.

**پرسیار ١٥/ ناردنی گەنجان بۆ سوریا چۆن دەبینی؟ ئایا لەلایەن سەلەفیەکانەوە هاندەدرێن بۆ جیهاد کردن لە سوریا؟**

مامۆستا خلیل أحمد / ئێمە هیچ کەسێکمان نەناردووە بۆ سوریا ، واش نابینین چاکە لەوەدا بێت لە ئێستادا گەنجان بۆ سوریا بنێردرێن ، وە ناشڵێین حکومەتی بەشار ئەسەد شەریفن و زوڵمیان نەکردووە ، وە خەڵکی سوریا پیویستیان بە کۆمەك نیە ، وە پێویستیان بە دۆعای خێر نیە ، وەپێویستیان بە چاکە کردن نیە ، چۆن ئێمەی میللەتی کورد لە ڕابردودا لەلایەن ڕژێمەی بەعسەوە زوڵمان لێکراوە ئەوانیش زوڵمیان لێدەکرێ و کێشە کەوتۆتە ناوخۆی وڵاتەکەیانەوە ، ئێمە بەهەموو شێوەیەك پێمان خۆشە کێشەی ئەو وڵاتە کۆتای پێ بێت و خەڵکی بە ئارامی تیایدا بژین ، ئەو شەڕ و کوشتارەی هەیە لەو وڵاتەدا نەمێنێ ، ئەمما خەڵکی هان بدەین بڕۆن بۆ سوریا جیهاد بکەن بەڕاستی ئەوە ئیشی ئێمە نیە ، چونکە ئێمە پابەندین بە وڵاتی خۆمانەوە کە هەرێمی کوردستانە ، کێشەی سوریا نزیکەی چوار ساڵە شەڕ و کوشتاری تیایە و ١٢٠هەزار خەڵك کوژراوە کەچی تا ئێستا هیچ بە هیچ نەکراوە ، ئێمە ئەوەندە نەزان نین خەڵکی بنێرین بۆ سوریا و هیچ سودێکیشی نەبێت ، وە ئێمە ئەگەر بەرگری کردن لە خەڵکی سوریا بە باش بزانین و پێمان خۆش بێت ئەو زوڵم و زۆرە لەو وڵاتە کۆتایی پێ بێت و چارەسەرێکی بۆ دابنرێ لەلایەن هەمو وڵاتانەوە ، ئەمەش ناگاتە ئەوەی

ئێمە خەڵك بنێرین بۆ شتی (مجهول) ، بۆ جیهادێك كە ڕون نیە ، بۆ كۆمەكییەك كە ڕون نیە ، پاشان ئەگەر ئێمە خەڵك بنێرین بۆ سوریا بۆ دژایەتی كردنی كێ بیان نێرین؟ چونكە ئێستا فیتنەیەك هاتۆتە ئاراوە كە چەندین ڕەوتی ئیسلامی لەگەڵ یەك شەڕ دەكەن ، چەندین ڕەوتی نیشتمانی لەگەڵ یەكدا شەر دەكەن ، خەڵكی ئەو وڵاتە لەگەڵ یەكتری دا شەڕ دەكەن ، ئێمە ئەو شەڕە ناوخۆییانە بەشێوەیەك دەبینین كە هیچ سودێكی نیە ، بۆ ؟ لەبەر ئەوە نیە ئێمە زوڵم كردنمان پێخۆشە بەرامبەر خەڵكی ئەو وڵاتە و دڵمان ناسوتێ بۆ موسوڵمانانی ئەو وڵاتە ، بەڵكو لەبەرئەوەی ئەوەندە دەستی دەرەكی هاتۆتە ناو ئەو وڵاتەوە شتەكان هەموی تێكەڵ و پێكەڵە ، بۆیە ئێمە لەلایەن خۆمانەوە هیچ كەسێك چ بەشێوەی تاك یان كۆمەڵ هانمان نەداون بڕۆن بۆ سوریا بەمەبەستی جیهاد كردن ، پاشان ئەگەر هەر كەسێك چوبێت لە لایەن هەر ڕەوتێكی ئیسلامی سیاسیەوە و لەسەر قوتابخانەی گەورەی سەلەفیەت حساب بكرێت لەبەر ئەوەی كە ڕیش دارە یان بەهەر شێوەیەكی تر كە ئاماژە بێت بۆ مەنهەجی ئەهلی سوننە ، ئەوە تێگەیشتن و ئازادی خۆیەتی و خۆی بڕیاری داوە نەك كەسێك ناردویەتی بەتایبەت لەو مامۆستایانەی كە ناسراون بە بانگەشەی سەلەفی وەكو ئەم نوسەرە بە

مەدخەلی ناویان دەبات ، کەواتە لە لایەن مامۆستا سەلەفیەکانەوە بە هیچ شێوەیەك بانگەشەی چون بۆ سوریا نەکراوە ، وەمن لێرەوە داواکارم لە خوای گەورە ئەو فیتنەیەی لەو ولأتەدا هەیە ، و ئەو زولّم و زۆرەی هەیە ببڕێتەوە و کۆتای پێبێت ، وە زولّملێکراوان ڕزگار بکات ، و ئەو کەسەی زالّمە و دەستی هەیە لە کوشتن و تالأنکردنی سەر و مالێ هاولأتیان خوای تعالی دەستی بشکێنێ و لەناوی بدات ، چونکە ئەوە بۆ چوار سالێ دەچێت نزیکەی ١٢٠ هەزار خەلّك کوژراوە ، نە ئەو کەسەی کە خەلّك دەکوژێ ئەزانێ بۆچی دەکوژێ ، نە ئەوەشی دەکوژرێ ئەزانێ بۆچی دەکوژرێ ، بەڕاستی خوێنێکی زۆر نادیار و ناحەقە ، وە ئێمە بەرین لەو بابەتە ، وە حەزناکەین نەك دەستمانی تیابێت بەلّکو دەممانیشی تیاببێت.

**پرسیار١٦/ ئایا سەلەفیەکان کەس هان دەدەن بۆ جەنگ کردن دژی پەیەدە ، بۆ جیٚ بەجیٚکردنی پیلانی تورکی بە هاوکاری لایەنیٚکی سیاسی هەریٚمی کوردستان تاوەکو لەگەڵ ڕەوتی سەلەفی توندڕەو و بەرەی نوصرە یەکبگرنەوە لە دژی پەیەدە؟**

مامۆستا خلیل أحمد / نەخیٚر بە هیچ شیٚوەیەك بە پیٚی زانیاری من سەلەفیەکان هیچ کەس و لایەنیٚك هان نادەن بۆ جەنگ کردن دژی پەیەدە ، چونکە کاری ئیٚمە نیە ، ئەگەر ئەوەیان کردبیٚت وەك لە پرسیارەکەوە دیارە جیٚبەجیٚکردنی پیلانی تورکیایە بەهاوکاری لایەنیٚکی سیاسی لە هەریٚمی کوردستان ، وە ئیٚمە بیٚگومان نە لەژیٚر فشاری تورکیاین و نە لە ژیٚر فشاری لایەنیٚکی سیاسین لە هەریٚمی کوردستان ، نە داوامان لیٚکراوە ، نە فشارمان خراوەتە سەر ، نە پیٚویستیشیان بە ئیٚمەیە کە خەڵکی هان بدەین بۆ دژایەتی کردنی پەیەدە ، وە بەڕاستی ئەمەش تۆمەتیٚکە دەکریٚت بۆ لایەنەکانی هەریٚمی کوردستان ، وە ناشرینکردنیەتی ، جا ئەو لایەنە هەرکام لە حزبە دەسەلاٚتدارەکان بیٚت ، ئیٚمە هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵ ئەو دولایەنەدا نیە ، نە لەگەڵ پەیەدە و نە لەگەڵ بەرەی نوصرە ، وە زۆر دورین لەیەکەوە ، چونکە ئیٚمەی سەلەفیەکانی کوردستان بەهیچ شیٚوەیەك دەست

بۆ ئەو هاوکێشە سیاسیە ناوخۆی و نێودەوڵەتیانە نابەین ، وە ئێمە تەنها گەیاندنی دین و ڕونکردنەوەی دین و چاکسازیمان لەسەرە ، وە تەمەنا دەکەین کەوا هەرێمی کوردستان بە لایەنی دەسەڵاتدار و بێدەسەڵاتەوە و پەیدە و بەرەی نوصرە و تورکیا هەمویان لە ڕوشدی خۆیاندابن و ئیشی خۆیان بکەن ، و دەستیان لە مەشاکل و فیتنە گێڕی نەبێت بەرامبەر بە یەکتری ، وە ئێمە هیوا و ئاواتمان ئەوەیە کورد لەهەر چوار پارچەی کوردستان ڕۆڵی هەبێت لەسەر دین و ڕەوشت و قیەم ، وە هەمو ئەومافانەی کە چەندین ساڵە بە یاسایەکی نێودەوڵەتی لە کورد زەوت کراوە بۆمان بگەڕێتەوە ، بەڵام بەبێ کوشتن و کوشتار ، بەبێ ئەوەی لە خزمەتی وڵاتانی تردا کار بکرێ بۆ جێ بەجێکردنی پیلانیان بۆ وڵاتانی تر ، وە ئێمە دژی پەیدە و بەرەی نوصرە و تورکیا و هیچ لایەنێکی تری هەرێمی کوردستان نین ، یان لەسەر حسابی یەکتر پشتگیریان بکەین ، ئێمە ئەم شتانە ناکەین ، وە هیچ کەس و لایەنێکیش فشاری نەخستۆتە سەر ئێمە ئەوەندەی من ئاگادار بم.

**پرسیار١٧/ هەر لەو ڕاپۆرتەدا هاتوە دەڵێ: سەرچاوەیەك وتویەتی پێشتر لەگەڵ یەکێتی زانایان و وەزارەتی ئەوقاف ئەم مەترسیانەیان باس کردووە ، بەڵام پێی وایە بەکارهێنانی ئەم ڕەوتە سەلەفیە لە دژی حزبە ئیسلامیەکان بەتایبەتی یەکگرتو و کۆمەڵ بەکاریان دەهێنن؟**

مامۆستا خلیل أحمد / لە پرسیارەکەوە ئەوە دەخوێنمەوە کە ئەم دارِشتنە لە دارِشتنی کەسێکی ئیسلامی دەچێت کە دەیەوێ سەلەفیەکان ناشرین بکات بەوەی کە کاربەدەست و داشی دامەی عەلمانیەکانن ، وە زوڵملێکراو لە لایەن عەلمانیەکان و سەلەفیەکانەوە تەنها یەکگرتو و کۆمەڵن ، بەڕونی دەیڵێم: ئێمە نە دژ بە یەکگرتو نە دژ بە کۆمەڵین ، نەدژ بە پارتین و نە دژ بە یەکێتین ، وە دژی دەسەلاٌتیش نین ، و هیچ کەسێکیش ئێمە بەکار ناهێنێت ، نە ئەتوانن بەکارمان بێنن بە ئیزنی خوا ، نە بەکارهاتوین ، نە گومانیشمان وایە حزبە دەسەلاٌتدارەکان هەوڵیان داوە بۆ بەکارهێنانی ئێمە ، ئەگەر سودێکیان بینیبێ لە ئیجابیاتی ئێمە پیرۆزیان بێت و ئێمە پێمان خۆشە ، ئەگەر ئیسلامیەکانیش سودیان بینیبێ لە ئیجابیتی ئێمە پیرۆزی ئەوانیش بێت بەهەمان شێوە پێمانخۆشە ، وە ئێمەش بەهەمان شێوە

سودمان لە ئیجابیاتی هەریەكە لەوان بینیوە ، ئێمە بەهەمو شێوەیەك دژایەتی لایەنێك ناكەین و پشتگیری لایەنێكی تر ، ئێمە هەمو لایەنێك بە كەسی خۆمان دەزانین ، ئامۆژگاری ئێمە بۆ هەمو لایەكیانە ، ئەگەر مەترسیەكانمان باسكرابێت و ئەوقاف وای وتبێت چ وتە بێژ بێت یان وەزیر ، ئەمە وەڵامێكی نامەنتقی یە ، چونكە تۆمەتبار كردنی حزبەكانی دەسەڵات و حكومەتی هەرێمە بەوەی كە ئێمە بەكار دەهێنێ دژ بە یەكگرتو و كۆمەڵ ، وە ئەمەش مۆركێكی پێوەیە كە وەزارەتی ئەوقاف یان بەشێكی وەزارەتی ئەوقاف دڵسۆزن بۆ یەكگرتو و كۆمەڵ و ڕقیان لە حزبی دەسەڵاتە ، هەرچیەك بێت ئێمە ئەو مەترسیەمان نیە كە باس كراوە نە بۆ یەكگرتو و نە بۆ كۆمەڵ ، ڕێزمان بۆ هەمو لایەك هەیە ، ئێمە تەنها چاكسازیمان لەسەرە ، یەكگرتو و كۆمەڵ هەرچیەك بن ئێمە تەواوكەرین و هەڵەكان چاك دەكەینەوە و ئامۆژگاری دەكەین ، بۆ یەكێتی و پارتیش بەهەمان شێوە ، وە بە نیاز نین لە كورسیەكانی هیچكامیان كەم بكەینەوە و خۆمان بچینە شوێنیان ، ئەو مومارەسە سیاسیەی كە هەیانە لە گۆڕەپانی سیاسی هەرێمی كوردستان بۆ خۆیانە ، تەنها ئێمە ئامۆژگاریمان بۆ هەمویان ئەوەیە كە پابەندبن بە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامەوە ، پاپەندی ڕەوشت و قیەم بن كە چەندین

ساڵە لەناو ئەم گەل و ولأتەدا هەیە ، و خزمەتی خاك و خەڵکی خۆیان بکەن ، ئێمە هەر ئەوەمان هەیە ، و نابینە دوژمنی هیچ کەسێك لەوانە ان شاء الله.

**پرسیار١٨/ لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە گوایە سەلەفیەکان لە تونس لە دەرەوەی حکومەت و دادگاکان دەستی ئەو کەسانەیان دەبڕن کە دزی یان دەکرد یان مەشروباتبان دەفرۆشت، ڕای ئێوە چی یە لەم بارەیە؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بیرکردنەوەی ئێمە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەواندا ، دەست بڕین ، لێدان ، سزادانی کەسێك کە مەشروب دەفرۆشێت ، ئێمە بە پێی **(مصالح و مفاسد)** کار دەکەین ، ئێمە ئەگەر دەسەلأتمان هەبوو ، حکومەتمان هەبوو ، یان بۆ نمونە ئەگەر ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان شەریعەتی ئیسلامی جێ بەجێ بکات ، وەکو حکومەت و دەسەلأت توانای بەسەر خەڵکدا هەبێت ، و هەمو هۆکار و مەرجەکان بەکار بهێنێت ، ئەوکاتە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلام جێبەجێبکات ، ئێمەش لەگەڵیداین ، بەلأم ئێمە بۆ خۆمان لە ناوچەیەك یان لە شوێنێك یان چەند کەسێك کە دەسەلأتیان بەسەر چەند شوێنێکدا هەبێت بۆچەند ڕۆژێکی تایبەت یان لە بارودۆخێکدا کە خەڵکی برسیە یان هیچ علم و ئەحکامێکی پێ نیە ، ئێمە باوەڕمان وانیە کە ئەو حەدانە جێ بەجێ بکرێ ، چونکە ئەو حەدانە دەگەڕێتەوە بۆ دەوڵەت ،

دەگەڕێتەوە بۆ حاکمی شەرعی ، ئێمە بە هیچ شێوەیەك بیرمان لەشتی وا نەکردۆتەوە و بیروباوەڕیشمان وانیە .

**پرسیار١٩/ ئایا سەلەفیەکان جیهادی ئەو کەسانە دەکەن کە دەچنە سەر مەزارگەکان، هەروەکو لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە؟**

مامۆستا خلیل أحمد / نەخێر بەو شێوەیە نیە، ئەوانەی دەچنە سەر مەزارگەکان جیهادیان لەگەڵ ناکرێ، کەسێك ئەگەر شرکێك یان بیدعەیەك یان هەر جۆرە سەرپێچیەکی کرد لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، ئەو کەسە لە لایەن کەسی شارەزا و پسپۆرەوە لە بانگخوازان و مامۆستایان بانگ دەکرێن و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکرێ، ئەما جیهادیان لەگەڵ بکرێ و بکوژرێن و قەتڵ و عام بکرێن و خەشم و قینیان بەسەردا برێژی ئیسلام بەوشێوەیە نیە، چونکە بەردەوام ئەو کەسانەی دەچنە سەر مەزارگە و خەریکی تەبەڕوکن خەڵکێکی دڵسۆزن لەوەی کە حەزیان لە خواپەرستی یە، بەڵام لەڕێگەیەکی ناشەرعیەوە دەڕۆن بۆ خوا پەرستی، و بیر و باوەڕیان وایە کە ئەو قەبرانە شەفاعەتیان بۆ دەکەن، و ئەو پیاو باشانە لەخوایان نزیك دەکەنەوە، ئەگەر هاتو ئەو کەسانە نەبونە ڕێگر لەبەردەم یەکتاپەرستی، و نەبونە ڕێگر لەبەردەم گەیاندنی دینی ڕاست، و شەڕ لەگەڵ ئەهلی سوننەدا نەکەن، ئەوا

ئەهلی سوننە لەگەڵ ئەوکەسانەدا ناجەنگێ بینائەن لەسەر ئەوەی پەڕۆیەکی بەدەستیەوە بەستووە یان لەسەر قەبرێکە، ئەم قسەیە ئەسڵ و ئەساسی نیە کە سەلەفیەکان بەوە بناسرێن جیهادی کەسێك دەکەن کە شرکێك دەکات بەوەی لە قەبرێك دەپاڕێتەوە یان بیدعەیەك ئەنجام دەدات.

## پرسیار ٢٠/ وەڵامت چی یە بۆ قسەکانی وتەبێژی وەزارەتی ئەوقاف؟

مامۆستا خلیل أحمد / ئەگەر ڕاست بێت وتەبێژی وەزارەتی ئەوقاف ئەو قسانەی کردبێت کە لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە ، ئەوا من قسەکانی بە ئیجابی دەبینم ، بەڵام یەکێتی زانایان هەیە ، لیژنەی فەتوا هەیە ، وەزارەتی ئەوقاف لیژنەی فەتوای خۆی هەیە ، ئەگەر مامەڵە لەگەڵ پرسێکی وادا دەکەن بە پێی یاسا ، بەڕاستی ئەمە وەڵامێکی زۆر ئیجابیە ، یانی ئەمەی کە ئەگەر سەلەفیەکان هەر ترسناکیەکیان هەبێت نابێت بەو شێوە توندە خەڵك هان بدەن لە بانگەشەی قوتابخانەیەك کە بە سەدەها و هەزارەها خەڵکی لایەنگریەتی ، بەڵکو پێویستە هەر کەسێك کێشەی لەگەڵ بانگەشەی سەلەفی هەیە ، یان لەگەڵ هەر مامۆستایەکی سەلەفی کێشەی هەیە ، یان لەگەڵ هەر لایەنێکی بانگەشەکە کێشەی هەیە ، دەتوانێ پەنابەرێتە بەر دادگا ، یان لێژنەی فەتوا ، یان بڕواتە لای یەکێتی زانایان ، یان با بڕواتە سەرۆکایەتی

هەرێم و شەکوای خۆی بکات و ڕێگری بکات لە مەترسی سەلەفیەکان ، نەك خەڵك هان بدرێت لە ڕەوتێك ، یان تەیارێك ، یان مەزهەبێك کە سەدەها و هەزارەها خەڵك لەسەریەتی ، بەڕاستی ئەمەیە وەڵامی وتەبێژی وەزارەتی ئەوقاف ، کە من بە وەڵامێکی باشی دەزانم بەرامبەر بەم پرسە .

**پرسیار ٢١/ ئایا ڕاستە مەریوان نەقشبەندی وتویەتی سیاسەتی سەلەفیەکان ڕون و ئاشکرا نیە؟ وە لەم بارەیەشەوە نوسراوی فەرمیمان داوەتە حکومەت؟**

مامۆستا خلیل أحمد / من نازانم ئەگەر بەڕێز مەریوان نەقشبەندی وای وتبێ کەوا نوسراوی فەرمییان داوەتە سەرۆکایەتی هەرێم و ئەنجومەنی وەزیران ، ئەگەر کردبێتی ، بەڵام سەلەفیەکان حزبێکی سیاسی نین ، و وتەبێژی فەرمییان نیە ، بەڵکو بریتین لە کۆمەڵە خەڵکێکی ناسراو ، چەند مامۆستایەك لێرە و لەوێ ، هەریەکەیان بەرپرسە لە بیر و بۆچونی خۆی ، هیچ مامۆستایەك تعبیر لە سەلەفیەکان ناکات بە گشتی ، سەلەفی ناوچەیەك تعبیر لە هەمو سەلەفیەکانی کوردستان ناکەن ، پاشان کە دەڵێ سیاسەتی سەلەفیەکان ڕون نیە ، سەلەفیەکان سیاسەتیان تەنها بریتی یە لە قورئان و

فەرمودە بە تێگەیشتنی پێشینی ئەم ئومەتە ، یانی لە هەرکوێ بەڵگە و زانست هەبێت ئەوە بریتی یە لە مەنهەجی سەلەفیەکان ، بەشێوەیەکی گشتی کە نزیکەی ٢٠ساڵە سەلەفیەکان بەوپەڕی میانڕەوی ، بەوپەڕی پۆزەتیڤیانە ، بەوپەڕی خزمەتگوزاری ، لەگەڵ حکومەتی هەرێم ، و لەگەڵ خەڵکی هەرێم ، هەڵس و کەوت دەکەن ، و دەستیان لەخوێنی هیچ کەسێك نیە ، لەکاتێکدا خەڵك قسەیان پێدەڵێن و ئازاریان دەدەن ، نمونەشمان کوشتنی مامۆستا ڕەمەزان کە مامۆستایەکی سەلەفی بوو ، ئەوەندەی ئێمە بزانین لەسەر هیچ کێشەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و نەتەوەیی نەکوژراوە ، کەچی هیچ کاردانەوەیەك نەبوو ، وە ئێمە تا ئێستا چاوەڕوانین بەشێوەیەکی یاسایی تۆڵە لەو کەسانە بکرێتەوە و حەقی ئەو مامۆستایە وەربگیرێتەوە ، ئێمە بۆ ئەم جۆرە پرسانە باوەڕمان بە جێ بەجێکردنی یاسا هەیە ئەگەر پێچەوانەی شەرع نەبێت ، نەك دەست بردن بۆ توند و تیژی یان شتێك لەبەرنامەماندا هەبێت و بیشارینەوە ، ئێمە هیچ شتێك ناشارینەوە ئەوەی لە قورئان و فەرمودە هەبێت ، ئەوەی لە فەهمی زانایانی ئیسلامدا هەبێت لەسەر حەق ئەوە مەنهەجی ئێمەیە ، بە شێوەیەکی گشتی ئێمە کوردستان بە وڵاتی خۆمان دەزانین ، وە خۆمان بەنامۆکار و دورە پەرێز و دژی

حکومەتی هەرێم و خەڵکی کوردستان نازانین ، خۆمان بە دژی هیچ مەزهەبێك نازانین بەتەواوەتی ، تەنانەت هەر مەزهەبێك ، هەر ڕەوتێك ، هەر لایەنێك ، هەر بیروبۆچونێکی هەبێت ، ئێمە ئامادەین بەوپەڕی نەرم و نیانیەوە خزمەتی بکەین ئەگەر نەهاتە سەر ڕاستی ئیسلامیش ، بەڵام نەبێتە هۆکاری ناڕونی و تێکدانی ئەم بارودۆخەی کەلە هەرێمی کوردستان هەیە.

# دیداری
# ڕۆژنامەی هاوڵاتی
# لەگەڵ بەڕێز
# مامۆستا خلیل أحمد

**هاوڵاتی/ ئێوە گروپێکی تایبەت یان ڕێکخستنی خۆتان هەیە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بێ گومان سەلەفیەت مەزهەب و مەنهەجێکی دروستی ئیسلامە و نوێنەرایەتی ئیسلامی ڕاستەقینە دەکات، وە هیچ چوارچێوەیەکی تەسك و تایبەت کورتی ناکاتەوە، وەبە سەلەڤی بوونیش بە ئینتیمابوونە بۆ بیروباوەڕی ڕەسەنی ئیسلام و داخوازییەکانی لە ڕەوشت و کردەوە، کەوابوو سەلەفیەت لە گروپ و ڕێکخستن گەورەترە وە ئەوەش بزانە دەستەواژەی حیزبی سیاسی و ڕێکخستن و ڕێکخراو... هتد، گشتگیر نین و ناتوانن هەموو

کۆمەڵانی خەڵك لە خۆ بگرن و بەپێچەوانەی ئینتیمان بوون بۆ ئاین و نەتەوە و نیشتیمان.

**هاوڵاتی/ ژمارەی ئەندامەکان، یان لایەنگرەکانتان چەندە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / ژمارەی لایەنگران نەزانراوەو زانیاری بونیش دەربارەیان جێگەی مەبەست نیە، چونکە وەك پێشتر وتمان سەلەفیەت بازنەیەکی تایبەت نیە لە جۆرێك لە جۆرەکانی هەڵسو کەوت و کار بەڵکو ئینتیمابوونە بۆ ئاینێکی مەزن بەڵام ژمارەی لایەنگران لە زیادبوندایە، بەتایبەت کاتێك زانیاری و چاوڕۆشتنی زیاتر پەخشبکرێت و مەبەستەکان پاکژ بن.

**هاوڵاتی/موچەتان لە کوێوە بۆ دێ ؟ دەنگۆی ئەوە هەیە کەلە سعودیەوە موچەتان بۆ دێت، ئەمە تا چەن راستە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد/ موچە وەرگرتن و موچەدان لە بەر ئینتیما بوون بۆ سەلەفیەت بوونی نییە، هەرگیز ئەوەش نەبووە بە عادەت لە نێو ئاین دۆستاندا کە لەبەرامبەر بیروباوەڕیاندا ڕازی ببن بە جۆرەها شتێکی وا کەوابوو ئەم کارە مەفروزە و وەچەمکی زانراوی ئەم پەیڕەوەیە جا هەر کەس

ئەم خاڵە ببەزێنێت و ئەم هەڵەیە ئەنجام بدات خۆی لێی بەرپرسیارە سەلەفیەت لەو کارە بەرییە و سەلەفیەکانیش لێی قەبوڵ ناکەن،ئەنجا بۆ مەسەلەی سعودیە بۆ ئەم مەبەستە ڕاست نیەو زۆر لە کۆنەوە وا ئەوترێ، بەڵکو هیچ بەڵگەیەك نەبووەو نیە،وە لەکاتێکدا بەڵگە هەبوو لەسەر هەرکەسێك ئەو کاتە پێویستە بێ دەنگ نەبین لێی ئەنجا سەلەفیەکان پێویستیان بە موچە نی یە وە ئەگەر پێویستیان بە هەر پێداویستیەك هەبێت لە خەڵکی کوردستانی داوادەکەن چونکە هیچ مەرج و مەرامێکی لە پشتەوە نابێت.

**هاوڵاتی/ ئێستا چالاکیەکانتان لە چی چوارچێوەیەکدایە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / چالاکی سەلەفیەکان ئێستا لە چوارچێوەی گەیاندن و پەخشکردنی زانست و چەمکە دروستەکاندا خۆی دەبینێتەوە، بە وتارو کۆر و نوسین و وەرگێران و گۆڤار وسیدی و سایت و دەرس و پێگەیاندنی مامۆستای شارەزاو میانڕەو.

**هاوڵاتی/بۆچی سەلەفیەکان حزب دروست ناکەن ؟ ئایا تموحتان نیە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / سەلەفیەکان حیزبی سیاسی لە کۆمەڵگەی ئیسلامدا دروست ناکەن چونکە بە حەرام و هۆکاری شەر و خراپەی دەزانن، نەك لە بەر نەزانین و نەتوانین بەڵکو بە هەڵوێستێکی ژیرانەو بوێرانەی دەزانن، وە پەیامەکەیان لە حیزب گەورەترە.

وە ئایا تموحی گەیشتن بە دەسەڵاتمان هەیە نان نا؟ بەراستی بۆ خۆمان بەلامانەوە گرنگ نیە بەڵکو ئەوەی بەلامانەوە گرنگە حوکم بەشەرعی خوا بکرێت هەرکەس بیکات وە بۆ ئەوەی لەئایندەدا حوکم بە ئیسلامی ڕاستەقینە بکرێ پێویستە خەڵکی ڕۆشنفکر بکرێت نەك بە توندو تیژی و کودەتاو فێڵ و ئاشوب.

**هاوڵاتی/ ئەگەر تموحتان نەبێت چۆن ئەو بەرنامەیە پەرە پێ ئەدەن؟**

مامۆستا خلیل أحمد / من پێم وایە زۆر موبالەغەکردن لە گەیشتن بە دەسەڵات خۆی دەبێتە ڕێگرێك لەبەردەم گەیاندنی پەیامەکاندا بۆ نموونە زۆر لەوانەی دەسەڵاتیان بەدەستەواژەی تەنها و ڕاستەقینە زانیوە بۆ

چەسپاندنی پەیامەکانیان دەبینی لەکاتی جێ بەجێ کردندا شکستیان خواردووە، بۆیە هەم پەیامەکان لەدەسەڵاتداری گەورە ترن وەهەم دەستەواژەکان قۆرخ نین لە بونی دەسەڵات.

**هاوڵاتی/ئێوە چۆن سەیری دین ئەکەن ؟ئایا وەك پەیوەندی نێوان تاك و پەروەردگار سەیری دەکەن، یان وەك بەرنامەیەکی گشتگیر بۆ چینەکانی کۆمەڵگە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / دینی ئیسلام لە دیدو بیر و باوەری سەلەفیەکاندا بەرنامەیەکی گشتگیرەو چارەسەری بۆ هەموو مەسەلەکان داناوە و هیچ تاك و چینێك ناتوانن دەستبەرداری دین ببن، بەڵام دینێك کە پێشینینی موسوڵمانان پیادەیان کردوە، نەك هەندێ کلتورو داب و نەریتی کۆمەڵگەی موسوڵمانان کە بە پێچەوانەی رێنماییەکانی ئاینی ئیسلامن، وەلای نەزانان لە سەر ئیسلام بوونەتە ماڵ، نا وانییە، چونکە ئیسلام دینی خوایەوئەویش زاتێکە هەم بەدیهێنەر و هەم فەرمانرەوا، وەك دەفەرموێ ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾ واتە : بزانن بەدیهێنان وفەرمان تەنها بە دەستی ئەوە، ئەویش دەزانێ

بەرنامەو شەریعەت و دەستوور بۆ ئادەمیزاد دیاری بکات وەك دەفەرموێت ﴿ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ﴾ .

**هاوڵاتی/بە تێروانینی بەڕێزتان پەیوەندی نێوان دین و سیاسەت دەبێت چۆن بێت ؟ ئایا پێتان وایە دەبێت دین بەشێك بێت لە سیاسەت بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت ؟ چۆن؟**

مامۆستا خلیل أحمد / سەلەفیەکان پەیوەندی نێوان دین وسیاسەت بەپێویست دەزانن و جیاکردنەوەیانن لەیەکتر بە هەڵەو خەتەرێکی گەورە دەزانن بۆ سەر تاك و کۆمەڵگە چونکە دینی بێ سیاسەت دینێکی تەواو نییە وە سیاسەتی بێ دینیش ستەم و دۆزەخێکی گەورەیە بۆ کۆمەڵانی خەڵك.

**هاوڵاتی/ئەگەر پێتان وایە دەتوانرێ لە ڕێگەی دینەوە دەوڵەت بەڕێوەببرێت، ئایا ئەو میکانیزنەی حیزبە ئیسلامیەکانی کوردستان کاری لە سەر دەکەن،میکانیزمێکی سەلیم و دروستە ؟ ئایا ئەوان سازشیان لە سەر هیچ بنەماو پرەنسیپێکی ئلینی ئیسلام کردوە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بێ گومان ئەو میکانیزمەی کاری لەسەر دەکەن بەلای منەوە هەڵەیە، چونکە موسوڵمانان خزمەتی زیاتریان پێ دەکرێت،

وەلە ماوەی بیست ساڵدا نەیانتوانیوە پێگەیەکی جەماوەری باش بۆ خۆیان دروست بکەن، چی لە رووی چۆنێتی یان چەندێتییەوە، وە تا ئێستا نا روونی زۆر لە هەڵوێستەکانیاندا هەیە، نە سازی گەورە لە فیکرو واقعیاندا هەیە، بێ گومان نەئیسلامیان وەك خۆی پێشکەش بە جەماوەر کردووە و نە دەسەڵاتیان بۆ خۆیان دەست خستووە.

**هاوڵاتی/ بۆچونتان لە سەر سیاسەتی هەرێم چۆنە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / حکومەتی هەرێم لە ئاستێکی باشدا دەبینم بە بەراورد لە گەڵ دراوسێکانیدا، هەرچەندە رەخنەی بایەخ نەدانی زیاتر بە ئاینی ئیسلامم لێیان هەیە، وە بێ گومان کەموو کوری هەن وزۆریشن، بەلام گەشبینم بە ئایندە بەهەوڵی چاکخوازان کەم ببنەوە کۆمەڵانی خەڵك هۆشیارتربن.

**هاوڵاتی / ئێوە رەخنە لە عەلمانیەکان دەگرن ؟ کام دەوڵەتی ئیسلامی مافی مرۆڤ و دادپەروەری تیایە کە پەروەردگار داوای دەکات ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / چاك و خراپی نسبیە و رەخنەو ئامۆژگاری بنیاتنەر بۆ هەردولایان واریدە و بە سودە بەڵام وەکو خود (**ذات**)، دەوڵەتی ئیسلامی ئەگەر ئیسلامی بێت لە عیلمانی باشترە، بەڵام دەکرێت دەوڵەتێکی ئیسلامی لە واقیعدا هەندێ مومارەساتی لە دەوڵەتی عیلمانی خراپ ترو زیانبەخشتر بێ، ئەمەش بە هۆی هەڵە تێگەیشتن لە خودی ئاینی ئیسلام یان لە بەر بەرژەوەندی تایبەت.

**هاوڵاتی/ ئایا بە درێژایی مێژووی ئیسلام، خیلافی دەسەڵات هۆکار نەبوە بۆ شەرو ئاژاوە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / جیاوازی لە سەر دەسەڵات هۆکارێکی زەق و لە پێشە بۆ شەڕ و فیتنە لە کۆمەڵگەدا، هۆکاریش لادانە لە سیستمی ماقوڵی ئەهلی سوننەت لە حوکم ڕانیدا، کە هەمیشە حوکمڕانی بە بە هەستیار و نەخوازراو دادەنات، بەڵکو وەك دەستەواژەو وەسیلە مامەڵەی لەگەڵ دەکات، نەك

ئامانج و خولیاو عیشق و مەرام، جا هەرکاتێ وەك دوەمیان بە کارهێنرابێت، یان هەوڵی بۆ درابێت، ئەوا بە خوێن وشەر و برا کوژی و پەکخستن و لە دەستدانی دەستکەوتەکان تەواو بووە، زۆر کەمن ئەوانەی وك دەستەواژە بە کاری دەهێنن بۆ خزمەتکردنی فیکر و رەوشت و بەرژەوەندییە گشتیەکان.

**هاوڵاتی / ئایا لە کۆن و ئێستادا تا چەند ئەوە راست و گونجاو بووە کە هەندێ جار دین ئیستغلال کراوە بۆ گەشتن بە دەسەڵات، ئەمەیان لە کۆندا باوبووە یان ئێستا ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / لە بەر ئەوەی ئیستغلال کردنی دین بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتی شەخسی و بنەماڵەو بەرژەوەندی تایبەت، تاوانەو لە کۆن و ئێستادا بە کارهێنراوە و مێژووش حوکمی راستەقینەی واقیعی بە سەریاندا داوە.

**هاوڵاتی/ پێم وابێ لە گەڵ حیزبە ئیسلامیەکان نێوانتان باش نیە، هۆکار چیە ؟بە تایبەت لە وەڵامێکتاندا بۆ علی باپیر لە کاتی پیرۆزبایی کردن لە مەسیحیەکان، وەڵامتان داوەتەوە، بەزەقیش دیارە نێوانتان باش نییە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / راستە نێوان سەلەفیەکان و حیزبە ئیسلامیەکان باش نیە، هۆکاریش ئەوەیە سەلەفیەکان دەمانەوێت فیکر و واقیع دژ و نەساز نەبن و مەرجەعیش مەنهەجی ئەهلی سونەت بێت، بەڵام هەندێ کەس و لایەنی ئیسلامی یان تەواوەتی کارەکانیان لەو مەنهەجە وە سەرچاوە ناگرێت، یان لە بەر بەرژەوەندی و فشاری واقیع دەترازێت، بۆ نمونە پیرۆزبایی کردن لە نەیاران بە هەموو پێوەرێك ناماقوڵە، کەسانی ساوێلکەش دەیزانن، جا ئیتر بۆ رابەران و سیاسەتمەداران فیترەت و سەلیقەی عەوامانیش دەشێوێنن.

**هاوڵاتی/ زۆر جار قسە لە سەر ئەوە ئەکرێ ئێوە لە وتارەکانتان و لە بیرو باوەرتانا، باس لە مەسەلە (فیقهیەکان) دەکەن و ئەیوروژێنن، بەڵام لە سەر گەندەڵی ئیداری قسە ناکەن،هۆکار چییە؟**

مامۆستا خلیل أحمد / خۆ بەستنەوە بە لایەنێك یان باسێك لە باسەکانی ئیسلام چی فیقهی بێت یان دەسەڵات و حوکم کارێکی هەڵەیە، جا وروژاندنی سەلبی بۆ بابەتە فیقهیەکان یان سیاسیەکان وەك گەندەڵی ئیداری لە هەرکەسەوە بێت، لای ئێمە مەرفوزە، جا بابەتەکە فیکری و فیقهیەکان بەو

سەنتەرەی باسمانكرد لە پێشتر و (أولويات)ن بۆ ئێستای كۆمەڵگەی كوردی لە بواری چاكسازی ئیسلامیدا، بەڵام چارەسەری سیستمی حوكم لای سەلەفیەكان، پرۆژەو هەنگاوی پۆزەتیڤیان هەیە، چونكە جوگرافیای كوردستان و مشت و مرە ئیقلیمی و جیهانییەكان و زۆری مەزهەبە دینی و سیاسی و سلوكییەكان هۆكارن لە بەردەم چاكسازییەكاندا، بۆیە دەبێت عاتیفە حاكم نەبێت، وەك وتراوە بۆ شاخ دەركردن گوێچكەكانیش نەدۆڕێنین.

**هاوڵاتی/ بە رای بەڕێزتان ئاهەنگ گێران بۆ یادی لە دایك بوونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)لیٚ بێت، دروستەو خێرە ؟ یان بیدعەیە ؟**

مامۆستا خليل أحمد / ئاهەنگ گێران بۆ یادی لە دایك بوونی پێغەمبەری سەروەرمان صلى الله عليه وسلم بیدعەیە و زیاتر لە پێنج سەدەو نیو لە مێژووی موسڵمانان شتی وا نەبوو وە بەكردنەوەی ئەم دەرگایە بۆ ئەم زاتە پیرۆزە هەزاران دەرگای تر دەكرێنەوە لە دوا ئەنجامدا ڕەوڕەوەی ژیانی فیكری و ئابوری و كەلتوری ئیفلیج دەبن وە ئەگەر بێت و بۆنە و جەژنەكانی

کۆمەڵایەتی خەڵك کۆکەینەوە و فەرمییان بکەین ئەبێت لە ئەستێرەیەکی ترەوە سامان و بەروبوممان بۆ بهێنرێت.

**هاوڵاتی/ ئایا پیرۆزبایی کردنی ساڵی نوێ لە مەسیحیەکان کوفرە یان ئاساییە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / پیرۆزبایی کردنی ساڵی نوێ لە مەسیحیەکان دروست نیە، بەڵام هەموو شێوازەکانی وەکو یەك نین، بۆ نمونە پیرۆزبایی کردن لە شتێك کوفربێت کوفر و بێ دینیە یان پیرۆزبایی کردن لە حەرامێك لەگەڵ بیروباوەڕبوون بە دروستێتی یان چاکێتی ئەو شتە ئەوەش کوفرە جا پێم باشە بۆ ئەم مەسەلەیە بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکانی تایبەت بەم بابەتەوە.

**هاوڵاتی/ حیزبە ئیسلامیەکان لە کەناڵەکانیانەوە گۆرانی پەخش دەکەن، قسەت لەسەر ئەمە چیە؟**

مامۆستا خلیل أحمد / گۆرانی لە گەڵ مۆسیقا بێ گومان دروست نیە تەنها بە کارهێنانی دەف لە دوکاتی تایبەت دا (هاوسەرگیری و جەژنەکانی رەمەزان وقوربانە) تەنانەتیش بۆ منالان و کچان بەڵام گۆرانی بێ مۆسیقا ئەو کاتە بە شیعر حیساب دەکرێت شیعریش بریتی یە لە قسەکردن و

ئاخاوتن چاك چاكە و خراپیشی خراپ ئەوەندە هەیە نابێت ڕەقس و سەماکردنی لەگەڵدا بێت و وشەکان خراپ بن و زۆریش ڕۆچونی تیادا نەکرێت چونکە شیعر سیلاحێ:ی دووسەرە دەتوانرێ بۆ چاك خراپیش بەکاربهێنرێت بەڵام بە زۆری بۆ خراپ بەکارهێنراوە.

**هاوڵاتی/ ئیسلامیەکان ئێوە بەکرێگیراوی علمانیەکان دائەنێن، ئەمە چۆن لە یەك ئەدەیتەوە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / سەلەفیەکان لە بەر سەلەفی بونیان هیچ دەرگایەك لە دەرگاکانی بەرژەوەندی خۆپەرستانانەیان نەکردۆتەوە تا لە پێناویدا بە کرێگیراو بن و ناچار و ڕازی بن، بە جگە لە خواستی خۆیان وە ناشبن و هەنگاو بە هەنگاو بە پێی ڕێنماییەکانی شەرع کاردەکەن.

**هاوڵاتی/ دەنگۆی ئەوە هەیە ئێوە سەردانی مەڵبەندی کەلاری یەکێتیتان کردبێ شتی وا هەیە؟ ئەگەر سەردانتان کردوە بۆچی بووە ؟ ئەی نێوانتان چۆنە لە گەڵ حیزبە عیلمانییەکان، بە تایبەت یەکێتی و پارتی ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / سەردانی مەڵبەندی کەلاری (ی. ن. ك) ڕاستە، ئەوەش لەو کاتەدا بوو کە هێزەکانی حکومەتی مەرکەزی جموجوڵی لەناوچە سنورییەکاندا هەبوو، چەند مامۆستایەکی سەلەفی بە سیفەتی مامۆستایانی ئاینی سەردانی مەڵبەندی ناوبراویان کرد لەو سەردانەشدا یەکتر ناسین و پشتیوانی کردن لەڕۆڵی مامۆستایانی ئاینی و مزگەوتەکان کرا وە هۆشیار کردنەوەی خەتەرەکان لەسەر دەستکەوتە ئەمنی و نەتەوەییەکان.جا سەردانی سەلەفیەکان لەبەر خودی حیزبی ناوبراو نەبووە و ناشبێت بەڵکو لەبەر ئەوەیە (ی. ن. ك) یان (پ. د. ك) تا ئێستا بەرپرسی دەستکەوتەکانی گەلەکەمانن جا پێویستە بە هەموومانەوە ئەم ئەزمونە بەرەو باشتر ئاڕاستە بکەین و نەهێڵین لەبار بچێت بۆیە جۆری پەیوەندی ئێمە تەنها بریتیە لە پارێزگاری کردن لە دەستکەوتەکان بە بێ هیچ بەرامبەرێك چونکە ئەرکی شەرعی سەر شانی خۆمانە وە ئامادەین بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ هەموو لایەکدا باس و دیراساتمان هەبێت،وە جگە لە خزمەتیش بە دین و میللەتی خۆمان هیچ فشار و عەمالەتێك قبولْ ناکەین.

**هاوڵاتی / ئێوە کار بۆ نزیك کردنەوەی حیزبە ئیسلامیەکان دەدەن؟**

مامۆستا خليل أحمد / ئێمە دەمانەوێت خەڵکی کوردستان یەکڕیزو برابن وە کاردەکەین بۆ نزیك بوونەوەی هەموو کوردان لەیەکتر چ ئیسلامی بێت یان عەلمانی ئێمە خۆمان بە مولکی کوردان دەزانین ئەوانیش بە هی خۆمان وە هەر هەموو لە ئەسڵدا موسڵمان و کورد وکوردستانین و لەیەك نیشتیماندا دەژین بۆیە ئێمە لەکاتی ڕەخنە و پێشنیار و ئامۆژگاری دا مەبەستمان ڕوخانی بەرامبەر نیە بەڵکو بونیاد و چاککردنەوەیە.

**هاوڵاتی / ئێوە لە نامیلکەیەکتاندا ئیسلامیەکان بە شەمشەمە کوێرە و نەزان دەچوێنن و گوایە ئەوان توانای بینینی روناکیان نیەو گوێ لە هەق ناگرن، ئەمە چۆنە ؟**

مامۆستا خليل أحمد / وەسف کردن و ناوهێنانی وا لای ئێمە ئەسڵی نیە مەگەر بەرژەوەندی لەوەدا بێت ئەنجا توندوتیژی لە حوکم دەربڕیندا لەکەسێکەوە بۆ کەسێ:ی تر دەگۆڕێ وە هەموو نوسەرێك خۆی بە پلەی یەکەم لە نوسینەکانی بەرپرسیارە وە حوکمی گشتی بەسەر خەڵکدا زۆر جار ناهەقە و پێویستە نوسەران و وتاربێژان ئاگایان لە حوکمەکانیان بێت وە

نەزانی و دەمارگیریش هەیە پێویستە ڕابماڵرێت بە زانست و نەفەس درێژی و مەوزوعیەت.

**هاوڵاتی/ دروستکردنی حیزبی ئیسلامی تا چەند لە گەڵ بنەماکانی ئاینی ئیسلامدا گونجاوە ؟ ئایا دروست کردنی حیزبی ئیسلامی پارە خواردنە بە ناوی ئاینەوە یان بەرگری کردنە لە ئاینی ئیسلام ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / / دروستکردنی حیزبی ئیسلامی لە گەڵ بنەماکانی ئاینی ئیسلامدا ناگونجێت وە مەبەست لە دروست کردنیان لە لایە ن خاوەنەکانیانەوە لە پێشدا مەبەست پێی خزمەت کردنی ئیسلامە، بەڵام وەك هەموو کارێکی تر ئەگەری ترازانی هەیە جا ئەگەر ئەمەش نەبێت، هەر خودی ڕێگە پێدان بە حیزبی ئیسلامی یان عیلمانی دەبێتە هۆکاری دۆستایەتی و دژایەتی جیاواز لە نێو موسوڵمانانندا لەکاتێکدا ئەو هۆکارەش ڕاست و گرنگ نییە بۆ خزمەتی کۆمەڵگە.

**هاوڵاتی/ لە نامێلکەکەتاندا لە ساڵی (١٤٢٦ هیجری)دا دەرچوە و ڕەخنەتان لە علی باپیر گرتووە، کەگوایە حساب بۆ بیرو بۆچونتان ناکات ؟ هۆکاری ئەو حساب نەکردنە چیە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / حساب نەکردن و شێواندنی ڕووی راستەقینەی سەلەفیەت و سەلەفیەکان، لە هەرکەسێکەوە بێت ترسانە لە بیر و بۆچوون و ئەو رێنماییانەی سەلەفیەکان لە سەری دەڕۆن.

**هاوڵاتی/ ئایا گەشەکردنی حیزبە ئیسلامیەکان چۆن هەڵدەسەنگێنن؟**

مامۆستا خلیل أحمد / گەشەکردنی حیزبە ئیسلامیەکان بەلاواز دەبینم چونکە لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیدا چەندین ساڵە کاردەکەن بەڵام ڕۆڵ و جەماوەرێکی بەرچاو پێویستیان نیە.

**هاوڵاتی/ ئایا دەسکاری کردن و گۆڕینی واتای فەرمودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆن سەیر دەکەن، کەزۆر جار بۆ مەرامی حیزبی و شەخسی بەکاری دەهێنن؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بێ گومان دەسکاری کردنی گۆ و واتای دەقەکان کارێکی حەرام وگەورەیە، و بەکارهێنانی بۆ مەبەستی خراپ سەردەمێك دەیخوات و جەماوەر لێی بێ ئاگان، بەڵام دوای ئەوان رۆشنفکر و شەرعزانان پەنجە دەخەنە سەر کەم و کورییەکان و مەرام و نەزانی و هەڵەکان راست دەکەنەوە و مێژوش شایەتی و حوکمی لە سەر هەلپەرستان تۆمار دەکات.

**هاوڵاتی/ ئایا باسکردنی ئەندامەکانی زاوزێی مرۆڤ تاچەند دروستە لە راگەیاندنەکاندا باسبکرێ، لە شێوەی زانیاریدا ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / باسکردنی هەر شتێك بێ گومان کات و شوێن و ئەندازە و شێوازی تایبەتی خۆی هەیە پێویستە ڕەچاوی ئادابەکان بکرێت.

**هاوڵاتی/ ئایا تێکەڵ کردنی کوران و کچان لە ناوەندەکانی خوێندندا لە رووی شەرعەوە و بە بروای ئێوە تا چەند دروستە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / تێکەڵکردنی کچان و کوڕان لەناوەندەکانی خوێندندا دروست نیە و چەندین زیانی پەروەردەیی و زانستی لێدەکەوێتەوە،وە دواتر زیانی هەمەلایەنەی دەبێت چونکە ئەو ناوەندانە تایبەتن بۆ گەشەدان بە رۆح و عەقڵ نەك ئارەزوو حەزەکان و زاڵبونی عیشق و ئارەزووەکان کە لەدوائەنجامدا دەبنە ڕێگر لە بەردەم پەروەردەو زانستدا.

**هاوڵاتی / پێتان چۆنە ئافرەت بەشداربێت لە پرۆسەی سیاسیدا و کار لە گەڵ حیزبەکەی بکات، چی عیلمانی بێت یان ئیسلامی ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بەشداری کردنی ئافرەتان بە مەرجەکانی پاراستنی خودی خۆی لە دەست درێژی و یاریکردن بە چارەنوسیان بە رەوای دەبینم،

بە تایبەت لە کاتێکا ئەگەر بەشەکان تایبەت بوون بە ئافرەتان یان ئەگەر پیاوانی کارا نەبوون، وە بەمەرجی پابەندبوون بە حیجابی شەرعییەوە، وە هەروەها پۆستی سەرۆکی یەکەم دەبێت لە پیاوان بێت.

**هاوڵاتی/ بەشداریکردنی یەکگرتوو کۆمەڵ لە هەڵبژاردن بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، لە گەڵ دوو حیزبی عەلمانیدا تاچەند دروستە لە گەڵ دەستوری ئایندا دەگونجێ و بۆ بەرەو پێش بردنی ئیسلامە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بەشداری کردنی چوار حیزبی دوو لایەنە لە پرۆسەیەکی تایبەتدا، مانای یەکبونیان نیە، هەرچەندە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ورد هەیە بۆ دیراسەتی (بەرژەوەندی و زیانی)شەرعی لە کاتێکدا ئەگەر شێوەیەك لە شێوەکانی هاوپەیمانی بیانگرێتەوە و حەڵاڵ بێت، لەوانەشە زۆرینەی ئەگەرەکان لە حەرامەوە نزیك بێت، چونکە یەکەم زەرورەتێکی حەتمی نییە، وە هاوبەشی زۆریان لە نێواندا نییە وە جەماوەر هەزمی شتی واناکەن، دەبێتە هۆی شێواندنی مۆرکی ئیسلامی، وە هۆکاری سەرکەوتنیان بە سەر بەرامبەرەکانیاندا مسۆگەر و نیمچە مسۆگەر نییە، وە هاوپەیمانێکانیان پرۆگرامیان لە پارتی و یەکێتی روونتر و نزیکتر نییە لە

ئیسلامەوە، وە دەیەها خاڵی تر، وە باشترین بە لگەش چەندین ئەندامی دوو پارتە ئیسلامیەکە رازی نەبونیان لە سایتەکاندا بلاْودەکەنەوە.

**هاوڵاتی/ ئێوە وەکو کوردێکی موسوڵمان لەم هەڵبژاردنە دەنگتان ئەخەنە پاڵ ئیسلامیەکان ؟ ئەگەر نا بۆچی ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / بە راستی من وەکو خۆم هیچ زەمانەتێك نابینم لە ئیسلامیەکان یان عیلمانییەکان کە بتوانن هاوتەریب دروست بکەن لە نێوان رێنماییەکانی ئاینەکەمان و خۆشکردنی باری ژیانی کۆمەڵانی خەڵك، چونکە سەرچاوەی کێشەکان لە کۆمەڵەی موسوڵماندا ئەمەیە، بۆیە لەوانەیە لایەنێك، بتوانێت دروشمە ئاینیەکان زەق کاتەوە بەڵام نەتوانێت لە بەردەم دەیەها پرۆژەی ئابوری وسیاسی ئیقلیمی و دەولی، یان لایەنێك لە بەرامبەردا بتوانێت ئاستی ئابووری خەڵك بۆ ماوەیەك چاك بکات، بەڵام هۆکار بێت بۆ دروست کردنی کارەساتێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی، هەرچەندە سیستمی حوکم لای سەلەفیەکان شێوازێکی ترە وە شوراو هەڵبژاردن کاری پسپۆرانە، نەك زۆرینەو کەمینە، کە بە زمانی شەرعی پێی دەگوترێت (أهل الحل والعقد)

ئەمانە دوای مەرجەکان خاوەنی قەرارن، وەتاکاتی دەنگ دان دیراساتی قوڵتر پێویستە کەکێ زیاتر خزمەتی ئەم کۆمەڵگایە دەکات.

**هاوڵاتی/ وێنەگرتن حەرامە؟ بۆچی ئیسلامیەکان بە ڤیدیۆ و فۆتۆ وێنەیان هەیە و لە راگەیاندنەکانیاندا، ئەمە لە کاتێکدا هەردوولاتان یەك پەیرەوی دینیتان هەیە ئەویش قورئانە ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / وێنە گرتن لە بەر جۆرەکانی (پەیکە رو پۆستکارت و جوڵاو...) هتد. جێگەی لێکۆڵینەوەی زانایانە، بۆیە ئەو جیاوازیانە دروست دەبن، گومان لەوەدا نییە قورئان پەیرەوی هەموولایەکە، بەڵام لە پێوەرە سانەوییەکان بۆ تێگەیشتن لە قورئان جیاوازیمان هەیە، بۆیە هەندێ لە زانا سەلەفیەکان وێنەی ڤیدیۆ بۆ کەناڵەکان بە حەڵاڵ دەزانن، کە بۆ خزمەت و سود بە کاربهێنرێت.

**هاوڵاتی/ ڕاتان چی یە بە گۆڕان؟ بەرنامەی لیستی گۆرانتان پێ چۆنە ؟ ئایا گۆران دەتوانێ گۆران دروست بکات ؟**

مامۆستا خلیل أحمد / گۆڕان زەرورەتە هەموو بەرنامەو ئایدۆلۆژیایەکی ڕەسەن دەیخوازێت بەڵام بەرنامەی گۆران تا ئێستا بەشێوەی شەفەوی ئیعلان کراوە، بەڵام دروشمەکانیان چاکە،وە دەسەڵاتی تەنفیزیان ناناسم تاوەکو بزانم گۆڕان توانای گۆڕینیان هەیە.بەڵام یەکرێزی گەل لەسەر بەرنامەی دروست لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە.

**هاوڵاتی/ ئەی سەبارەت بە نەوشیروان مستەفا ؟**

خودی نوشیروان کەسێکە شەخسیەتی خۆی پاراستوە و خراپ و گەندەڵی ئیداری لەسەر نازانم، بەڵام هەڵوێستەکانی بەرامبەر بە دین ڕوون نین.

=======================

تێبینی: ئەم دیدارە لە ژمارە ٥٤٦ ڕۆژنامەی هاوڵاتی بڵاوکراوەتەوە.

# دیداری

# ڕۆژنامەی ئاوێنە لەگەڵ

# بەڕێز : مامۆستا خلیل أحمد

**ئاوێنە: بەڕێزتان کە کەسێکی هەڵسوڕاوی ڕەوتی سەلەفی لاحیزبین لەکوردستان، بەشداریکردن لەدەنگدان‌و هەڵبژاردن چەند بەرەواو شەرعی دەزانن لەروانگەی بیری سەلەفییەتەوە.**

**مامۆستا خلیل أحمد:**

بسم الله الرحمن الرحيم

بیروبۆچونی سەلەفیەکان بۆ سیستمی ئاڵوگۆڕی دەسەڵات دەقاودەق بریتیە لە سیستمی ئاینی ئیسلام بێ زیاد و کەم کە بریتیە لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی حوکم لە لایەن ئەهلی (**حَلٌّ و عقد**)ەوە واتە: ئەم دەزگایە متمانە دەبەخشێت بە پاڵێوراوانی خۆی نەك هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە چونکە ستەمە دەنگی کەسێکی ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدار و ژیر لەگەڵ کەسێکی نەزان و ناژیر و تریاکی چۆن یەك حسابیان بۆ بکرێت هەروەها چۆن دەبێ کەسێکی ستەمکار و دوژمن بە خاك و گەل و ئاین وەك کەسێکی دادپەروەر دروست دابنرێت، بۆیە سەلەفیەکان تەنها بە حوکمی ئیسلام ڕازی دەبن بەڵام لەبەر بەرژەوەندی گشتی و لەبەچاوگرتنی بارودۆخی ئێستای ئاین و گەل و نیشتمانمان وە لەبەر زەرورەتی ئەوەی پەرلەمان چۆڵنەکرێت بۆ دوژمنانی

ئاین و گەلەکەمان بە ڕەواو گرنگی دەزانك میللەتی ئێمەش نوێنەرانی خۆیان لەپەرلەمانی عێراقدا هەبێت بەبەڵگەی (**درء المفاسد أولي من جلب المنافع**) وە (**الضرورات تبيح المحضورات**).

**ئاوێنە: لەهەڵبژاردنێکی وەك ئەوەی پەرلەمانی عێراقدا ئێوە هەوادارو خەڵکانی پەیوەست بەبیری سەلەفی چۆن ڕێنوێنی دەکەن؟ ئایا هەڵوێستێکی گشتگیرو یەکلاکەرەوەتان هەیە یان خۆیان سەرپشك دەکەن؟**

**مامۆستا خلیل أحمد:** بەڕاستی ئێمە زۆر دڵخۆش و دڵگەرم نین چونکە هیچ لایەنێك لە بەشداربوان گەرەنتی پاراستنی حوکمی شەرع و دادگەری کۆمەڵایەتی بە ئێمە و خەڵکی کوردستان لە ڕێگەی بۆ نموونە یەکێتی زانایانەوە نەداوە تا سەلەفیەکان دەنگی خۆیان تایبەت کەن بۆ ئەو لایەنە، ئەوەندە هەیە ئێمە بە گشتی ئەڵێین کێ ئەمڕۆ دەتوانین لەبەرامبەر ناحەزان بە میللەت و ئاین و ئایندەی گەلەکەمان بوەستێت لەپەرلەمانی عێراقدا دەنگ بەوە بدەن.

**ئاوێنە: وەك زانراوە ئێوە حیزبایەتی لەکاری ئیسلامیدا بەناشەرعی دەدەن قەڵەم، بەڵام بەمدواییانە تەنها لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلامیدا پێکدا**

**هەڵپژان. بۆچی تەنها کۆمەڵ؟ لەکاتێکدا بزوتنەوەو یەکگرتووش لەگۆڕەپانەکەدان؟**

**ماموستا خلیل أحمد:** بەڵێ حزبایەتی بەحەرام و کوشندە دەزانین چونکە خۆ بچوککردنەوەیە و بریتیە لە خۆپەستی و خزمەتکردنی بەرژەوەندییە تەسکەکان وە وەلانانی بیروباوەڕ، ئەنجا هەڵپژان لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلامی بەگشتی نەبووە بەڵکو لەگەڵ ڕەوتێکی نامۆ بە سیاسەت و خۆنەناسیو لە نێو کۆمەڵدا کە بەڕەوا نابینن تاکی موسڵمان حیزبایەتی نەکات و نکۆڵی بکات لە حیزبایەتی کردن.

**ئاوێنە: یەکێك لەپاڵێوراوەکانی لیستی هاوپەیمانی کوردستان، لەسلێمانی (م. عومەر چنگیانی) پێشتر لەنێو رەوتی سەلەفیدا چالاك بووەو ئێستاش هەوڵ دەدات بڕێك لەو پێگەیەی لای خوێندکارە پێشووەکانی بەدەست بهێنێتەوە، ئێوە هیچ ئاگاتان لەمە هەیە؟ چ هەڵوێستێکتان لەو هەیە وەك کەسێك کە رابردووتان لەگەڵیدا هەیە؟ ئایا راستە دەڵێن بڕێك لەسەلەفییەکان دەنگی پێ دەدەن چونکە پێشتر ماموستایان بووە؟**

**مامۆستا خلیل أحمد:** ڕاستە م. عمر چنگیانی پێشتر لە نێو ڕەوتی سەلەفی بووە بەڵام نەمانبیستووە ئەو هەوڵە بدات، وە هەڵوێستمان ئەوەیە بگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی خۆی وە نەمبیستووە سەلەفیەکان دەنگی پێ دەدەن یان ئەو هەوڵی ئەوە بدات.

**ئاوێنە: حیزبە ئیسلامییەکان گلەیی ئەوەتان لێ دەکەن کە ئەوەندە زمانتان توندە بەرانبەر ئەوان بۆ پارتیو یەکێتیو عەلمانییەکان وەهانین، ئەمە تاچەند راستە؟ بەوە تۆمەتبارتان دەکەن کە دەنگتان لەبادینان بۆ پارتیو هەندێك جێگای سلێمانیش بۆ لایەنیترە، وەڵامتان؟**

**مامۆستا خلیل أحمد:** حیزبە ئیسلامیەکان جیاوازن لە عەلمانیەکان چونکە کۆمەڵی یەکەم بانگەشەی ئیسلام دەکەن وە لەو میانەیەدا چەندین شتی نا ئیسلامی بە ئیسلام دەناسێنن بەخەڵك جا لەبەر ئەوەی خودی ئاینی ئیسلام بپارێزرێت لەو داهێنراوانە سەلەفیەکان ڕونکردنەوە و هۆشیاری دەدەن و مەبەستیش ئەوە نیە هێرش بکەنە سەر ئیسلامیەکان بەڵکو ڕاستکردنەوە و تەواو کردنەوە وە هەر نەقدێکی ڕوخێنەر هەبێت ئێمە پێی

ڕازی نین وە عەلمانیەکان هەرچەندە ئێمە بە عەلمانیەت ڕازی نین بەڵام چەند حیزبێکی عەلمانی دەسەڵاتیان بەدەستە و زۆرینەی خەڵکی موسڵمانیش شوێن کەوتووی ئەوانن وە ئێمەی سەلەفی یەکێك لە دروشمە زەقەکانمان ئەوەیە خەڵکی لە دەسەڵاتداران هاننادەین بە تایبەت لە وڵاتانی ئیسلامیدا وە کوردستانیش بە یەکێك لە کرۆکی وڵاتانی ئیسلامی دەزانین، وە بێ دەنگ نابین لە کوفر و بێ باوەڕی و کاری حەرام بە بێ جیاوازی وە بەئەرکی خۆمانی دەزانین، وە دەنگ دان بە پارتی یان لایەنی تر ئەگەر بو بێت بەهەڵسەنگاندنی شەخسەکان کەوتووە ئەگینا نە ئاڕاستەیەکی گشتی یە لە لایەن مامۆستایانی سەلەفیەوە وە نەفشاریشە لە لایەن حیزبە عەلمانیەکانەوە، وە سەلەفیەکان جوامێر و بوێرن وە دڵسۆزن بە تێکڕای خەڵکی کوردستان و نیشتمانەکەیان.

**ئاوێنە: ئێوە چۆن دەڕواننە بەکارهێنانی ئاین لەهەڵمەتی بانگەشەو چۆن ئەوە دەبینن کە هەموو لیستەکان بەئیسلامیو عەلمانییەوە هەوڵ دەدەن سود لەئاین وەرگرن بۆ کۆکردنەوەی دەنگ.**

**مامۆستا خليل أحمد:** ئاینی ئیسلام ئامانجە نەك دەستەواژە بۆیە نابێت تەنها بۆ ئەو مەبەستە بەکار بهێنرێت بەڵکو لەسەر هەمووان پێویستە کار بە ئیسلام بکەن نەك ئیسلام بۆ کاری خۆیان بەکار بهێنن.

# چەند پرسیار و وەڵامێك

# لەگەڵ بەڕێز :

# مامۆستا خليل أحمد

تێبینی : ئەم پرسیار و وەڵامانە لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە کراوە بۆیە ناوی ئەو ڕۆژنامەمان دەست نەکەوت کە ئەم پرسیار و وەڵامانەی لەگەڵ بەڕێزیان ئەنجام دابوو .

**١-تێڕوانینی ئێوە بۆدابونەریتە کۆمەڵایەتیەکان چۆنە لەڕوی ئاینی ئیسلامەوە؟**

**مامۆستا خلیل** / بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

داب و نەریتەکان لەڕوی وەرگرتن و وەرنەگرتنەوە دەبنە دوو بەشەوە **یەکەم** : نەریتی تەندروست کەبریتیە لەوەی پێچەوانە و دژ نەبێت لەگەل دەقێك لە دەقەکانی شەریعەتی ئیسلام وە بەرژەوەندیەکی گشتی زانراو لەناو نەبات ، وە خراپەیەکی مسۆگەر بەدینەهێنێت وەك دیاری ژنخواز بۆ دەزگیرانەکەی کە بە (**هدية**) حسابدەکریت و لە مارەییش نیە وە چەندین نمونەی زۆر و نەبڕاوەی تر کە لەکتێبەکانی ئوسولی فیقهدا باسکراون .

**دووم** : نەریتی ناتەندروست کەبریتیە لەوەی پێچەوانەو دژ بێت لەگەل دەقەکاندا یان زیانێك بە سەر کۆمەڵگەدا بێنێت یان بەرژەوەندییان بخاتە مەترسییەوە وەك چەندین گرێبەستی ناڕەواوە وەك قەرزی سو و چەندین شتی تر .

**٢-ئایا بیرتان لەدروستکردنی حزبێکی سەلەفی کردۆتەوە؟ ئەگەر نا بۆچی؟**

**مامۆستا خلیل** / نەخێر بیرمان نەکردۆتەوە ، بەڵکو لەفەرهەنگیشماندا شتی وانیە ,چونکە دەستەواژەی حیزبی سیاسی بەپێی شەریعەت وژێریش کارێکی زیانبەخشە و چاکسازی وخزمەتکردن بەکۆمەڵگە بەرتەسك دەکاتەوە ، پاشان دەبێتە هۆکاری پەرتەوازەیی هاوڵاتیان و هۆکاریشە بۆ دروستبونی بیرو بیردۆزەی نەخوازراو و نامۆ تەنها لەبەر ئەوەی نەیارەکانیان هەڵگری بیرو ڕای جیاوازیان هەیە , واقعیش باشترین شاهیدە کەچەندین بیر و باوەڕو ئاكار وسلوكیاتی نەسازی دژبەیەك هەن وەهەندێ جاریش دەگاتە ئیبادەو جینۆسایدکردن , ئەی نازانن چەندین حزبی نەتەوەیی لەهەمان نەتەوەی یەکتر وچەندین حزبی عەلمانی لەهەمان قوتابخانەی یەکتر وچەندین حزبی ئیسلامی و مەسیحی ویەهودی وشیوعی ونیشتمانی و...و..هتد بەو شێوازەو بەهەموو چەکێك وهێزێکەوە بەرامبەر بەیەك جەنگاون و یەکتریان لەناو بردوە و بەبێ هیچ پاساویکی ژیری و هیچ بەرژەوەندیەکی گشتی , ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی دەرگا بۆ حزبایەتی کردن خراوەتە سەر پشت , لەبەر ئەوەی دەستێك لەپشتەوە هەیە ئەم کارە دەکات بۆ مانەوەی هێزی خۆی ,

هەروەها بۆ بێ ڕێز بونی بەهاو پیرۆزییەکان وەك ئایدۆلوژیا وئاین و نیشتمان و خاك و نەتەوە و سەوابیت و بەرژەوەندی گشتی و...و..هتد.

ئەمەش مانای ئەوە نیە لەکاتێکدا سەلەفییەکان دەستەواژەی حیزبی سیاسی ڕەتدەکەنەوە ئیتر هیچ بونیادیك نانین بۆ خزمەت کردنی ئاین وکۆمەڵگەو نیشتمان و نەتەوە , بەڵکو هەموو ئەوانە دەکەن و واشنازانن _وەك هەندێك واگومان دەبەن _ تەنها بەحزب دەکرێت ,پاشان ڕاستییەکی گەورە لە سەلەفییەتدا هەیە ئەویش ئەوەیە سەلەفییەت چاکسازی لەکۆمەڵگەدا دەکات و خزمەتیش پێشکەش دەکات بەبێ ئەوەی بەلایەوە گرنگ بێت ئەندامەکانی بباتە سەرحوکم بەڵکو بەپێچەوانەوە پەروەردەیان دەکات لەسەر حوکم بۆ خۆ نەویستن , هەرچەندە لەهەمان کاتدا هەوڵدەدات پەیڕەوەکەی حوکمڕانی بکات , بەڵام بەلایەوە گرنگ نیە کێ بێ (لەموسڵمانان) و کوڕی کێ بێ بەبێ هیچ دەمارگیریەك , کەوابو سەلەفییەت قوتابخەنەو ڕێبازو کاروان و درێژبونەوەی بانگەوازی پێغەمبەران و چاکسازانە نەك حزبیکی بەرتەسك , سەلەفییەکان دەیانەوی بۆ هەموو خەڵك بژین نەك بۆ هەندێ کەسی تایبەت , جا هەرکات بەناو سەلەفییەتەوە حزبایەتی کرا _ وەك لەهەندێ وڵاتاندا شتی واکراوە _ ئەوە کەسانێکن نەك هەموو

قوتابخانەی سەلەفییەت واتە مانای وانییە سەلەفییەت وسەلەفییەکان حزبێکی سیاسین ، هەر وەك چۆن ئیسلام ئاینەو حزبیەکانیش (لەموسڵمانان) حیزبی سیاسی کەوابو ئیسلام وسەلەفیەت و موسڵمانان و سەلەفییەکان لە حیزبی سیاسی گەورە ترن , ئەمما بەڵگە نەقلییەکان ئەوە گەلیك زۆرن وە لەزۆ جێگادا باسمان لێوە کردوە .

**٣-کارکردنی حزبە ئیسلامیەکانی کوردستان تا چەن ئێوە پێتان قبوڵە لەو شێوە کارکردنە بۆهاتنە ناوەوە گرتنە دەستی دەسەلآت؟**

**ماموستا خلیل** / بێ گومان پێمان قەبوڵ نیە لەبەر ئەو هۆکارانەی لەخاڵی دوەمدا باسکران ئەمەش مانای ئەوە نیە ئێمە بەبرای خۆمانیان نازانین و دوژمنایەتیان دەکەین نەخێر وانیە هەر کەس ئەمە بکات ئەوە لەسەلەفییەت تێنەگەشتووە , ئەوەندە هەیە ئێمە سۆز و ڕەحممان بۆ تێکڕای موسڵمانان هەیەو باوەڕمان بەنەسیحەت وئامۆژگاری وڕاستکردنەوە هەیە دەمانەوێ خۆمان و ئەوانیش دوربین لەهەڵەو لادان و لەپێش هەموو شتێکیش ئاینەکەمان بپارێزین لە شێواندن و کەمکردن و زیادکردنی شتێك بۆی کە تیایدا نەبێت , جا لە میانەی ئەم دیفاع و چاکسازییەدا هەر کەم کوڕییەك

دروستببێت ئەوە ئێمە لای خۆمانەوە مەبەستمان ئاینپارێزی و تەکمیل وجوانکردنەوەی موسڵمانانە وبەشێوەیەکی گشتیش گومانی خراپیش نابەین بۆ بەرامبەر, بەڵام هەڵە و لادان و چاك و خراپ هەر دەستنیشان دەکەین و بە ئەرکیشی دەزانین.

**٤-بونی چەن حزبێکی جیاواز بۆچی دەگەڕێتەوە لەکاتێکدا ئاینی ئیسلام یەك ئاینە؟**

**مامۆستا خلیل** / ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆکار:

یەکەم : لەدەستچونی خیلافەتی ئیسلامی (دەوڵەتی ئیسلامی گەورە) لەدەستی موسڵمانان و نەمانی پاڵپشتی بەهێز بۆیان .

دووەم :کەمبونی زانستی شەرعی سەلەفی وزانایان یان نەبونی , وەبونی سۆزو عاتیفەی موسڵمانان و بونی زوڵم و زۆری هەندێ لەدەسڵاتدارانیش لەو لاوە , بەتایبەت موسڵمانان کە خۆیان نەناسی دوای جگە لەخۆیان کەوتن لاسایی ئەوانیان کردەوە .

سێیەم : پلانی دوژمنانی ئیسلام و ڕەواج پێدانی فرە حزبی بۆ ئەوەی ئینکاری خراپەو چەپەڵی نەکرێت بەناوی ماف و ئازادییەکان .

**پرسیار : ئەگەر ئێوە ئیشی سیاسی بکەن تاچەن ئامادەن هاوبەشی ئەم حکومەتە بکەن؟ یان چۆن کارێك ئێوە دەیکەن؟**

**ماموٚستا خلیل** / ئێمە وەك باسمانکرد ئیشمان بونیادە نەك تێکدان و ڕوخاندن , وەهاوبەشی و چاکسازیمان لەبەر بەرژەوەندی تاکەکانمان نیە , بۆ سامان و پلەو پایە ، بەڵکو ئەرکەکان بە واجبی شەرعی دەزانین و پەیڕەوەکەمان ئەوە دەخوازێت , پاشان ئێمە هاوبەشی خراپەی هیچ کەس و لایەنێك نەبوینە و نابین ، هەروەها هەوڵی پۆزەتیف دەدەین بۆ پارێزگاری لەدەستکەوتەکانی میللەتەکەمان و ڕاستکردنەوەو پڕکردنەوەی نوقسانییەکان ، وە ئەوەی ئێمە دەیانکەین بریتیە لەوشیارکردنەوە و ئاشنا کردنی تەندروستی خەڵکە لە ئیسلام وە ئەگەر لەسیستمی حوکمڕانی بپرسیت ئەوە ئیسلام و سەلەفییەتیش خاوەنی سیستمی تایبەتی خۆیانن و ناکرێ لێرە باسی لێوە بکەین , بەڵام چارەسەری کاتییان بۆ کەم و کوڕییەکان ئەوەیە هەموو لایەك بگەڕێنەوە بۆ حوکمی خوا هەرچییەك لەتوانادا .

**٥-تاچەند لەئیسلامدا ڕێگە پێدراوە کاری سیاسی بکری؟**

**مامۆستا خلیل** / ئەم پرسیارە چەندین جار وەڵامم داوەتەوە ئەویش ئەوەیە سیاسەت لای سەلەفییەکان تەنها هەوڵ بۆ دەسەڵات گرتنە دەست ناگرێتەوە بەڵکو ماناو چەمکێکی فراوانی هەیە وە سیاسەت زاراوەیەکە ، ماناکەی بریتیە لە: بەڕێوە بردنی کارو بارو، هەڵسان بە چاککردنی، واتە (تدبير الأمور والقيام بإصلاحها).

وە لە ڕوانگەو دیدی ئیسلامیشەوە بریتی یە لە: (رعاية شئون الأُمّة في الداخل والخارج بما لا يخالف الشريعة الإسلامية) واتە: چاودێری کردن و سەر پەرشتتی کردن و بەرێوەبردنی کارو باری گەل و وولات لەناوەوەو دەرەوە، بەرێوە بردنێکی وەها کە پێچەوانەی شەریعەت نەبێت بۆ سەلەفییەکان هەمو هەڵسو کەوتێك بەپێی شەرع بەسیاسەت شەرعی دەزانن ، یەکێك لەکارەکانیان حوکم ودەسەڵاتە .

**١-بۆ لە پرسە هەنوکەییەکاندا،هەڵوێستی ڕونی سەلەفیەکان دیار نیەو نابێت و لاوازە؟**

**ماموستا خلیل** / پێشەکی پرسی هەنووکەیی چەمکێکی فراوانە و گشتگیرە و هەڵوێست بونیش بەرامبەریان دەبێت بە دووبەشەوە:

یەکەم: جۆری پرس و بابەتەکان لە خودی خۆیدا کامامەن و کامیان لە کامیان لە پێشترە تا سەلەفیەکان خۆیانی پێوە سەرقاڵ بکەن ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تەرازووی هەڵسەنگاندن و ژیان بۆ بەسەر بردن و.... هتد.

دووەم: لە گۆڕەپانی واقیعیشدا سەلەفیەکان لەگەڵ ڕێنمایی مەنهەجی دا پلانی ژیرانەو واقیعانە دەگرنە بەر بۆ مامەڵەکردن و دەست تێوەردان لەکاروباری خۆیان و خەڵك و ئایین و وڵات و وە لە هەمووکارەکانیاندا بە پێی ئەم بنچینەیە هەنگاو هەڵدەگرن کە بریتی یە لە (جلب المصالح وتكميلها ودفع المفاسد وتقليلها) لەبەر ئەمانە سەلەفیەکان ئەندامێکی تەندروستن لە کۆمەڵگاو نابنە سەرچاوەی شەڕ و خراپە و کۆسپ، وە شتێك بەرژەوەندی (دین و دونیایەکان) لە ناو ببات ئەمان پیادەی ناکەن،وە لەهەمووش گەورەتر ئەوەیە هەوڵ لە پێناوی خۆپەرستی و دەمارگیری و دەستخستنی

بەرژەوەندی دونیایی دا نادەن،و ئەگەر لەهەر کەسێکیاندا هەبێت قەدەغەی لێ دەکەن و بەسووك تەماشادەکرێت.

وە بۆ تا ئێستا لاواز بووە؟

یان بەرچاو و دیار نەبووە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ توانای مەعریفی ناوچەکە و هەبوونی چەمکی نادروست لە نێو خەڵکدا. ئێمە خۆمان نەمانویستوە شتێکی وا دابەزێتە واقیع خەڵکانێك تێنەگەن و کۆسپیش دروست کەین لەبەردەم بەرژەوەندی تری موسڵمانان و خەڵکی کوردستاندا،وەبەتەواوی بۆ چارەسەرکردنی واقیع باوەڕمان بە پلە پلەیی تەندروست هەیە وە ئامانجیشمان ڕێنمایی و گەیاندنی حەقە نەك دەست کەوتنی ماڵی و دونیایی.

**٢- هەڵوێست بەرامبەر بە یەکێتی مامۆستایان وەکو دامەزراندن، دابەشبون بەسەر چەند لیستێکی حیزبی، و هەڵوێست بەرامبەر بە هەڵبژاردنی ئەم جارەی (٢٠١٠) چی یە؟**

**مامۆستا خلیل** / یەکێتی مامۆستایان وەك دامەزراوەیەکی پیشەیی بێ لایەن و دوور لەوەی بۆ مەرامی حزبی بەکار بێت دروستە و ئامانجی باش پێ بەدیدەهێنرێ،بەڵام دابەشکردن و پەرتەوازەکردنی بەسەر لیستی حزبیدا

بریتی یە لە مراندنی ئامانجەکانی و لەباربردنی ئەو پرۆژە خەباتەی مامۆستایانی کوردستان هۆکاریش دەگەڕێتەوە بۆ عەقلّیەتی حیزبی زۆرێك لە ئۆپۆزسیۆن و دژایەتی هەموو دەستەواژەکانی حیزبی دەسەلّات وە دانانی دەستەواژەی بەدیل لەبەرامبەردا ئەگەر تەماشا بکەین هەمووو حیزبێك ئالییاتی حوکمەتێکی وەهمی بۆ خۆی دروست کردووە وەك زانایانی فلّان و زانایانی فلّان هەروەها قوتابیان و ژنان و مامۆستایان و لاوان و بێ نەوایان و...هتد.

چارەسەریش ئەوەیە ئۆپۆزسیۆن ئارام بگرن و چاکسازی لەناو دامەزراوە گشتی یەکاندا ڕابگەینن بۆ ڕێکخستنی مالّی هەموو دامەزاوەیەکیش ڕێگای یاسایی بگیرێتە بەر.

وە بۆ هەلّبژاردنی ئەم جارەی سالّی (٢٠١٠) ز وە لەمەودواش پێویستە تەنها یەك دامەزراوەی گشتی مامۆستایان هەبێت دەنگی پێی بدرێت کامەش کۆنترە پێویستە ئەوە بمێنێت و ئەوانی تر بۆ جیاوازی نادروست وخراپ بنەبڕ بکرێت ودروست نەکرێت،هەروەها نابێت هەندێ کەس لەحزبانی دەسەلّاتدار دەست لەکاروباری ئەو دامەزراوە وەربدەن.

وە دەبێ یەکێتی مامۆستایان هی هەموومامۆستایانی کوردستان بێت بەبێ جیاوازی وە دابەشکردنی پۆست و ئەرك و مافەکانیش ئەبێ بەپێی خاڵی خزمەت ئیمتیازاتی خوازراو بێت نەك خۆسەپاندن یان دژایەتی حزبی و ڕێکەوتنی تائیفی...

**٣- ئایا دەکرێت سەلەفیەکانیش یەکێتی مامۆستایان تایبەت بە خۆیان هەبێت؟**

**مامۆستا خلیل** / سەلەفیەکان پێویستیان بە دامەزاندنی یەکێتی مامۆستایان نیە تایبەت بەخۆیان چونکە دامەزراوەی ناوبراو دامەزراوەیەکی پیشەییە هیچ حەقی بە مەزهەب و ناوچەو ڕەچەڵەکێکەوە نیە ئەمەش لە ئامانجەکاندا دەردەکەوێت وە یەکێتی مامۆستایانی گشتی بەهی خۆیان دەزانن تا پێیان بکرێت چاکسازی دەکەن ئەگەر نەکرا خرابتری ناکەن.

**٤- مامۆستایانی بێ لایەن دەنگ بە کێ بدەن باشە؟بۆ؟**

**مامۆستا خلیل** / مامۆستایانی بێ لایەن و لایەنداریش با دەنگ بدەن بە یەکێتی مامۆستایانی گشتی پێشوو لەبەر ئەوەی چیتر یەکێتی مامۆستایان

لاوازتر نەبێت و نەبێتە جێگەی حیزبایەتی و مراندنی ئامانجە بەرزەکانی مامۆستایان.

**٥- دابەشبوونی یەکێتی مامۆستایان بەسەر چەند لیستێکی حیزبیدا، هیچ مەترسییەکی شەرعی دروست ناکات لە مامەڵە لەگەڵ کردنی؟**

**مامۆستا خلیل** / خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا﴾ .

پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم: (المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا).

ئەم ڕێنماییانەش گشتین لە هەموو بوارەکاندا جێ بە جێ دەکرێت مەگەر جیاوازی جۆری تنوع بێت واتە تاوەکو جۆر زیاتر بێت سودزیاتر بێت لە کاتێکدا ئەمەش لەجیاوازی یەکێتی مامۆستایاندا بەدی ناکرێت بۆ جیاوازی مامۆستایان دروست نیە دەبێ ووشەو زاراوەی یەکێتی مامۆستایان تەنها ناو نەبێت ناوەڕۆکیش ئاوها بێت ئەوەش بزانن من لەم قسانەم مەبەست مامۆستایانە نەك خزمەتی کەس.

**٦- ئامۆژگاریتان چی یە بۆ مامۆستایانی کوردستان بە گشتی و مامۆستا سەلەفیەکان بە تایبەتی؟**

**مامۆستا خلیل** / ئامۆژگاریم بۆ خۆم و هەموو لایەك بەتایبەت مامۆستایانی سەلەفی و غەیری سەلەفی ئەوەی تا دەتوانن داکۆکی لەسەر هێڵەگشتیەکان بکەن موسڵمانێتی و هاونیشتیمانیبون و هاوڵاتی بوون و بەرژەوەندییە گشتی یەکان هەموو ئەمانەش بە پێی ڕێساکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە لە خوای گەورەی دادپەروەرەوە سەرچاوەی گرتووە، نەك دژایەتی و ڕوخاندن و بەرژەوەندی تەسك و خۆ قەڵەوکردنی بەسەر ئامانجە پیرۆزەکاندا.

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

**پ ١ : لەڕووی مێژووییەوە وشەی ( سەلەف ) لەکەیەوە دروست بووەو لەکوێوە سەریهەڵداوە ؟**

وەڵام : وشەی (سلف) لەزماندا بەپێشین دەوترێت کە لەزانست و باوەڕو چاکەو کاردا پێشەنگ بن ، وەك لەفەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە ، ئەڵێت : سەلەف بریتین لەوانەی پێش خۆت ژیابن لەباب و باپیران وخزمان و ئەوانەی لەتۆ گەورەترن لەتەمەن وچاکتر لەباوەڕو کرداردا ، لەبەر ئەم مانایە نەوەی یەکەم لەموسوڵمانان بەپێشینی چاك دادەنرێن ، و ئەم وشەیە لەسەر زمانی پەیامبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم) بەکارهاتووە ، وە ك بەفاتیمەی کچی فەرمووە : (فَإِنَّهُ نِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ).(ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە).

واتە " بەڕاستی من باشترین پێشینم بۆ تۆ ".

بەڵام ئەم وشەیە مێژووی دروستبوونی لەدوای هاوەڵانەوە دروستبووە ، دەبینین نەوەی دوای هاوەڵان بە (تابعین) شوێنکەوتووان ناودەبرێن و بەهاوەڵان دەڵێن (پێشین) ، وەك (ڕاشیدی کوڕی سەعد) بەهاوەڵان دەڵێت : (کان السلف....) .(فتح الباری ٦ / ٦٦) ، وە (زوهری) ئەڵێ : (أدرکت

ناساً من سلف العلماء ...).(فتح الباري ١ / ٣٤٢). لێرەدا مەبەست بە (سلف العلماء) هاوەڵانە ، چونکە (زوهری) تابعی بووە .

دواتر سەلەفییەت نیسبەتە بۆ (سلف) ، بۆیە نیسبەتێکی چاکەو بۆ پەیڕەوێکی دروستە ، و مەزهەبێکی تازەو حیزبێکی سیاسی نیە وەك هەندێ کەس لەنەزانیدا یان لەبەر شێواندنی ڕاستیەکان وایان لەقەڵەم دەدەن ، وانیە ، چونکە سەلەفیەت پڕ بە پڕ ئیسلامی ڕاستەقینە دەگەیەنێت ، وە ئەم ناوەش لەبەر پێویستی دانراوە ، چونکە خەڵکانی گومڕا لەئیسلام دوای گومڕابوونیش هەر خۆیان بەهەق زانیوە ، وەك نوسەرێکی شیعە مەزهەب کتێبێکی نوسیوە بەناونیشانی (الشیعة هم أهل السنة) ، جا بۆپاراستنی ئیسلام و کۆمەڵگەو تاکەکانی ئەم ناوو ناوەڕۆکە بەپێوەرو تەرازوو دانراوە .

**پ ٢ : پەیوەندی کۆمەڵایەتی سەلەفی یەکان لەگەڵ کەسانی تردا چۆنە؟**

وەڵام : پەیوەندی کۆمەڵایەتی سەلەفی یەکان ڕاستەقینەو هاوسەنگە ، بونیات نراوە لەسەر پاکی و دڵسۆزی و ئامۆژگاری و لەسەرخۆیی و ئارامگرتن لەبەرامبەر یەکتردا ، و دوورە لەفرِوفێڵ و خۆهەڵخەڵەتان و

ئاڵۆزکردن و کاری نامەسئولانە ، وە هەندێ جار سەلەفی یەکان بەگۆشەگیر دادەنرێن ، لەوەلاًمدا ئەلێم (خاوەنی ئەو تۆمەتە بەپێوەرێکی جیاوازو نادروست ئەو مەسەلەیەی سەلەفی یەکان دەپێوێت ، دەیانەوێت سەلەفییەکان وەکو خۆیان دەستوەردەنە شتانێك کەتیایدا پسپۆرو شیاو نین) ، بۆیە دەڵێم : (ئەگەر نەزانان بێدەنگ ببوایەن جیاوازی نەدەما) ، و (ئەگەر کەشتیوانان زۆربن کەشتی یەکەیان ژێر ئاو دەکەوێت )، بۆیە هەڵوێستەکان لەژێری و خواناسینەوە سەرچاوەی گرتووە ، بەلاًم کەم کەس ئەم ڕاستی یە دەزانێت .

**پ ٣ : پەیوەندیتان لەگەڵ حیزبە ئیسلامی یەکانی تردا چۆنە ؟ یان ڕاتان چۆنە بەرامبەریان ؟**

وەڵام : پەیوەندیمان لەگەڵ حیزبە ئیسلامی یەکاندا بەگشتی پەیوەندی یەکی ئاینی و هاونیشتمانی و هاوولاًتی بوونە ، و لەسەر دوو تەوەر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین :

یەکەمیان : لەڕاستی نزیك بوون .

دووەمیان : توانای لێکۆڵینەوەو حیوار.

بـەپێی ئـەم دوو تـەوەرە هـەنگاوەکان هەڵـدەگیرێن ، هەرچـەندە تێبـینی زۆرمان هەیە ، بەڵام کاری ئێمە چاکسازی و ئامۆژگاری یە بۆ ئیسلامی و عەلمانی و هەموو توێژەکانی گەلەکەمان .

**پ ٤ : ئەو کتێبانەی کە سەلەفی یەکان چاپی دەکـەن هەنـدێکی بـەدیاری یـان بەنرخێکی کەم دەفرۆشرێن ، ئایا دەکرێت بزانین پارەی ئـەو کتێبانـە لـەکوێوە دەست دەکەوێت ؟**

وەڵام : بڵاوکـراوە سـەلەفی یـەکان بەکۆمـەکی خـەڵکی خێرخـواز دەکرێـت لەکوردسـتاندا ، دواتـر ئـەو نوسـین و بڵاوکراوانـە زۆریـان نوسـەرەکانیان ئەرکی بڵاوکردنەوەیان لەئەستۆی خۆیان گرتووە ، لەوانەیە بگـوترێ فلأن و فیسـار تۆمـەتبارن کاتێـك بـەناوی سـەلەفی یەتـەوە کاریـان کـردووە لـەڕابردودا ، ئێمـە هەرچـەندە هەڵوێسـتی تایبـەتمان هەیـە بـەڵام ئێسـتای سەلەفی یەکان ئەوەی ئاشکرابێت ئەو گەندەڵییەیان تێدا نیە .

**پ ٥ : دەنگۆی ئەوە هەیە سەلەفی یەكان ڕادیۆیەك بكەنەوە چەند ڕاستەو ئایا كێ دەعمی دەكات ؟**

وەڵام : سەلەفی یەكان ڕێگر نین لەبەرامبەر هیچ دەستەواژەیەكدا بۆ خزمەتكردن بەمەرجێك شەرعی بێت ، بەڵێ دەنگ و باس هەبوو كە هەندێ كەسی شارەزا لەدانانی ڕادیۆ كە پەیڕەو سەلەفین كارێكی وا بكەن ، بەڵام تائێستا نەبووە بەواقیع ، وە ئەگەر كرا بێگومان كۆمەكی لەلایەن خەڵكی كوردستانەوە دەكرێت بەتایبەت دوای تۆماركردنی لەحكومەتی هەرێمەوە ، وە من داوا دەكەم موسوڵمانانی ڕاستەقینە هەوڵدەن بۆ بەكارهێنانی هەموو دەستەواژەیەك لەپێناو خزمەتكردن بەئاین و گەلەكەمان .

**پ ٦ : بۆچی خێزانی سەلەفی یەكان كەمتر لەماڵ دەردەچن ؟**

وەڵام : خێزانانی سەلەفی بۆ پێویستی و كاری بەسود لەماڵەكانیان دەردەچن ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە مەنهەجی سەلەفیەت كە باوەڕی بەئازادی بۆتاك هەیە ، بەڵام بەرژەوەندی باڵای كۆمەڵگە پێشێل و پشتگوێ ناخات ، دواتر دەرچوون و دەرنەچوون چەند لایەنەیەو هەردووكیان كاریگەری

چاك و خراپی لەسەر تاك و كۆمەڵگە هەیە ، جا سەلەفی یەكان بەپێی ڕێنماییەكانی سەرچاوەی ئیسلام هەنگاو هەڵدەگرن .

**پ ٧ : مەلا سەیید ئەحمەد دەڵێت : ( سەلەفی یەكان داشی دامەی دەستی عەلمانی یەكانن ) ڕاتان چیە لەم بارەیەوە ؟**

وەڵام : بۆ وەڵامی سەید ئەحمەد ئەڵێم : ئەوەی خەریكی دامە بێت لەوانەیە ڕۆژێك لەڕۆژان بكرێت بەداشی دامە ، بەڵام سەلەفی یەكان پێویستیان بەدامە نیە ، وە خوا هیدایەتی داون بەكاری شیاوتر و گەورەتر ، وە بۆ زیاتر ڕونكردنەوەی ئەم خاڵە بڕوانە كتێبێك كە لەسەر سەید ئەحمەد نوسراوە بەناونیشانی ﴿ **گفتوگۆیەكی ئاشكراو هێمنانە لەگەڵ مامۆستا سەید ئەحمەدی یەكگرتوو لەلایەن عەشایەرێكی سەلەفی یەوە ،هەڵسەنگاندن و لە تەرازوودانی تەنها ئەو قسانەی كە لە ڕۆژنامەیەكدا بڵاوكراونەتەوە** ﴾ .

**پ ٨ : ئایا بۆچی خۆتان لەسیاسەت بەدوور دەگرن ؟ ئایا بەهۆی ئیسلامەوەیە یان شتی تر ؟**

وەڵام : هەڵەیە ئەگەر بڵێین سیاسەت تەنها بریتی یە لەمومارەساتی حیزبی و سیستەمی حوکم ، سەلەفی یەکان تێڕوانینی جیاوازو گشتگیریان هەیە بۆ چەمکی سیاسەت ، و هەوڵدان بۆ حوکم و دەستەواژەکانی کارێکی بچوکە لەدونیای سیاسەتی ڕاستەقینە ، وە دوریشە لەسیاسەتی ئەمڕۆو بەتایبەت لەکوردستاندا ، هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ڕێنماییە دروستەکانی ئیسلام و هەروەها بۆ ئەو بارودۆخە ناسك و هەستیارەی گەلەکەمانی پێدا تێدەپەڕێت .

**پ ٩ : ئایا سەلەفی یەکان بەینیان لەگەڵ تەکنەلۆژیادا چۆنە ؟ ئایا تەکنەلۆژیا بەکارهێنان لاسایی کردنەوە جولەکەو مەسیحی یەکان نیە ؟**

وەڵام : پێویستە پێشەکی ئەوە ڕوون بکەمەوە ئەم پرسیارە بۆچی دەکرێت ؟ ئەویش لەبەر ئەوەیە سەلەفی یەکان دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی هاتنی ئیسلام لەتێگەیشتنی ئاییندا ، و هەر داهێنراوێکی ئاینی دروستبکرێت و لەئیسلامدا نەبێت سەلەفی یەکان باوەڕیان پێی نیە ، بەڵگەشیان زۆرە ، لەوانە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه

وسلم) کە فەرموویەتی : (من أحدث في أمرنا هذ ما ليس منه فهو رد).(ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە).

واتە " هەر کەسێك بۆ ئەم ئاینەی ئێمە شتێك زیاد بکات کە تیایدا نەبێت ئەوە وەرنەگیراوە ".

ئەگەر سەرنج بدەین ئەم دەقە سێ خاڵی زەقی تێدایە (یەکەم : داهێنان ، دووەم : لەئایندا ، سێهەم : بەڵگەی نەبێت) ، بۆیە ئەڵێم : داهێنانی دونیایی و دەستەواژەکانی ژیان بەر ئەم دەقە ناکەون ، وە ئەوەی سەلەفی یەکان قەبوڵی ناکەن لەداهێنان جۆری (داهێنانی ئاینی یە بەو سێ مەرجەی لەدەقەکەدا هاتووە) ، بەڵام ئەویتر سەلەفیەت هانمان ئەدات کە پێشەنگی دونیا بین ، دواتر ئێمە دەستکەوتە تەکنەلۆژییەکان بەتەرازووی سودو زیان دەکێشین ، بۆ نمونە موشەك و چەکی ئەتۆمی و کەرەستەی لەناوبەر بۆ ژیان و گوزەران و فیکرو ڕەوشتی خەڵك بەخراپ دەبینین وباوەڕمان پێی نیە ، ئەمما کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت و هەموو ئەوانەی خزمەت بەمرۆڤایەتی دەکەن بەمەرجێك بەخراپ بەکارنەهێنرێت لەهەموو کەس زیاتر سودمان لێوەرگرتووە چ سەلەفییەکانی کوردستان چ

سەلەفیەکانی تر لەجیهاندا ، بۆنمونە چەندین سایتی سەلەفی هەن بەزمانی شیرینی کوردی ، لەوانە :

www.ba8.org

www.salafikurd.net

وە چەندین سایتی کوردی و عەرەبی لەجیهاندا.

بەڵام نەیارەکان ئەو شتانە بۆ ڕای گشتی بەپێچەوانەوە دەگەیەنن ، دواتر بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا لاسایی کردنەوەی مەسیحی و جولەکە نیە ، چونکە هیچ پەیوەندی بەئاینەوە نیە وەکو باسمانکرد کە داهێنان و دروستکردنی شتی نوێ لەئایندا قەدەغەیە ، ئەویش لەبەر ئەوەیە ئەم ئاینە هی خودایە ئەگەر زیادبکرێت و لەودا نەبێت ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوەی خودا داینـاوە نوقسانە ، ئەمەش ڕووبەڕووی ڕاستی یەکی گەورەمان دەکاتەوە ، ئایا باوەڕمان بەبوونی خودا هەیە یان نا ؟ ئەگەر وەڵاممان بەئەرێ بێت کە هەر واشە لای سەلەفییەکان و هەموو موسوڵمانانیش ، دواتر ئەو خوایە بەرنامەی بۆژیان هەیە یان نا ؟ وە کامەیە ؟ دەکرێت کەم وکوڕی تیابێت ؟ وەڵامیش ئەوەیە کە : بەرنامە دانان تەنها بەدەستی خودایە و ئیسلامیش کۆتا بەرنامەیەو ناکرێت هیچ

کەم وکوڕی تێدابێت ، لەوانەیە بگوترێت ئەو هەموو ڕەخنانە چییان لێ بکەین کە لەئیسلام و موسوڵمانان دەگیرێت ، لەوەڵامدا ئەڵێم : پێویستە مومارەساتی موسوڵمانان بۆ ئیسلام لەخودی ئیسلام جیابکرێتەوە ، دواتر ئیسلامیش کامەیە ؟ وەڵامیش بۆ ئەمە : ئیسلام تەنها بریتی یە لەدەقەکانی قورئان و فەرمووده (صحیح)ەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .

**پ ١٠ : ئێوە بڕواتان وایە لاسایی کردنەوەی فیکری ئەوروپی یان وەرگرتنی تا چەند ئاساییە ؟**

وەڵام : موسوڵمانان پێویستیان بەهیچ کەسێك نیە تاوەکو لاسایی بکەنەوە ، ئەگەر خۆیان بەشێوەیەکی دروست ڕێنماییەکانی ئیسلام جێبەجێ بکەن ، دواتر هەر چاکەیەك لای هەر کەس و تاقم و فیکرێك هەبێت و پێچەوانەی ئیسلام نەبێت ئەوا سەلەفیەت هانمان ئەدات بۆ وەرگرتنی و سودو کەڵکی خۆمانی لێ وەردەگرین و کردوشمانە.

**پ ١١ : باس لەوە دەکرێت سەلەفی یەکان منداڵەکانیان ناخەنە قوتابخانەوە ؟ ئەمە تا چەند ڕاستە ؟**

وەلاّم : سەلەفی یەکان منداڵەکانیان وەکو باقی منداڵانی خەڵکی کوردستان لەقوتابخانەدان بەبێ جیاوازی ، من بۆ خۆم کچ و کوڕەکانم لەقوتابخانەن ، هەرچەندە تێبینی زۆرم هەیە لەسەر ڕەوشی خوێندن هەر لەمەنهەجەکەوە تاوەکو ژمارەی قوتابیان لەپۆلێکدا بەبێ دژایەتی و دروستکردنی کێشە لەبەر ناسکی بارودۆخی کوردو ناوچەکە ، دواتر هەر تاکێکی سەلەفی منداڵەکانی نەخاتە قوتابخانە لەبەر ئەوەی خۆی باشتر فێری زانست و پەروەردەیان دەکات ، ئەڵێم : ئەگەر وابێت هیچی تێدانیە ، بەلاّم من بڕوام وایە کاردانەوەی خراپی دەبێت بۆسەر قوتابیەکان وە شێوەیەك لەدابڕان دروست دەکات ، و لەئایندەدا ناتوانێت لەجێگە فەرمی یەکاندا خزمەت بکات لەبەر نەبوونی بڕوانامەو دامەزراندن ، چارەسەریش ئەوەیە هەردووك پێکەوە ئەنجام بدرێت هەم قوتابخانە نیزامی یەکان و هەم پەروەردەی ماڵەوە .

**پ ١٢ : سەلەفی یەکان زیاتر لەکوێن لەکوردستاندا ؟**

وەلاّم : خەڵکی کوردستان هەموو سەلەفین لەئەسڵدا مەگەر کەسێك خۆی نەیەوێت ، چونکە (سەلەفیەت یەکسانە بەئەهلی سوننەت) بەواتای هەر کەس سوننی بێت سەلەفی یە ، ئێمە سەلەفیەت بەچوارچێوەو چەمکی

حیزبی نازانین تەنها فلاَن و فیسار سەلەفی بن و کەسی تریش نا ، بەلاَم ماموَستایان و بانگخوازان و چاکسازانی ئەهلی سوننەت لەهەموو شارەکانی کوردستاندا هەن ، لەسلێمانی و هەولێرو دهوَك و گەرمیان هەن .

**پ ١٣ : یەکەمین کەس کە خوَی بەسەلەفی ناساندووەو لەکوردستاندا کیٚ بووە ؟**

وەلاَم : یەکەم کەس کەخوَی بەسەلەفی ناساندبێت لەشارێکەوە بوَشارێکی تر دەگوَڕێت ، بوَ نمونە من لەشارەکەی خوَمدا لە ساڵی (١٩٨٦) کە ئەو کات تەمەنم (١٦) سالاَن بوو سەلەفی بووم ، هەروەها باقی ماموَستایانی تریش ، بەلاَم کەسێك کە بەتەمەن گەورەتر بێت و لەسەر ئاستی کوردستان هەر لە کوَنەوە بەسەلەفی ناسراوبێت شێخ (حمدی عبدالمجید السلفی)یە کە دانیشتووی (سەرسەنگ)ە.

**پ ١٤ : ئایا ژنهێنانتان لەسەر بنەمای خزمایەتی یە یان پێشتر کەسەکە دەناسن ؟ ئەگەر کچ و ژنەکانتان زوَر بەکەمی لەماڵ دەردەچن قەت ئەوە ڕوو دەدات کەسێکی بێگانە بێتە داوای کچێکی سەلەفی ؟**

وەلاَم : ژنهێنان بنەمای زوَرە ، سەرەکیترینیان بنەمای ئاینی یە ، چونکە هەرکەس لەئاین و ڕەوشتدا پەسەندو کامڵ بێت ئەوە لەپێشترە کە ژن و

ژنخوازی لەگەڵدا بکرێت ، پاشان شتانی دیکە لەبەرچاو دەگیرێت ، بەڵام هەندێ داب و نەریتی کۆمەڵایەتی هەن ، وەکو (ئامۆزایەتی و پورزایەتی و ژن بەژن و گەورە بەبچوك و بەزۆر بەمێرددان و چەندین شتی تر..) لەگەڵ دادپەروەری خودادا ناگونجێت و سەلەفی یەکان باوەڕیان پێی نیە ، هەرچۆن بەمانە کارناکەن ، پەیوەندی پێش مارەبڕینیش بەزیانێکی خراپ دەزانن بۆ کچان و کوڕان ، بەڵام وەکو چارەسەریش ناهێڵن کوڕان وکچان قەیرە بن ، بۆیە لەگەڵ ڕۆشنبیرکردنیان هاوسەری شیاویان بۆ دابین دەکەن.

وە سەبارەت بەوەی کە کچ و ژنە سەلەفی یەکان کەم لەماڵ دەردەچن ئایا بێگانە دێتە داوایان ؟ لەوەڵامدا ئەڵێم : قەدری زێڕ لای زەڕەنگەرە .

**پ ١٥ : ئایا ئامادەن کچتان بدەن بەموسوڵمانێکی ناسەلەفی ؟**

وەڵام : بەنیسبەت دروستی و نادروستی ژن و ژنخوازی لەگەڵ موسوڵماندا دروستە ، بەمەرجێك هەردولا یەکخواپەرست بن و دووربن لەشیرك و کوفرو دووڕوویی ، بەڵام کەسەکان چ کچ یان کوڕ تاوەکو کامڵ بن لەمەنهەج و ڕەوشت و ساڵحبوون ئەوە چاکترە .

خـوای گـەورە یارمـەتی هـەموو لایـەك بـدات بۆچاكسـازی و دادپـەروەری و ئاسـایش و بەرقـەراری ، تـاوەکو کۆمەڵگایـەکی نمونـەیی ببێتـە واقیـع لەکوردستانی خۆشەویستماندا .

# هەڵوێستی میانڕەوی سەلەفیەکان

## " سەلەفیەکانی کوردستان"

## تەکتیك واتە : ترس نیە

وەڵامێك بۆ "مەلا بەختیار" ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

بەڕێز مامۆستا : ( خلیل أحمد ) وەك بیستووتە لە كۆڕێكدا ، مەلا بەختیار ئەندامی مەكتەبی سیاسی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان دەڵێت : ئێمە پشتیوانی هیچ هێزێكی سەلەفی ناكەین ، وە پاشان دەڵێت سەلەفیەكان كە لەم قۆناغەدا كاربەدەستان بە كاربەدەستی خۆیان دەزانن ئەوە تەكتیكە بە هەر بیانوویەكی ترەوە بێت لەوە دەردەچن ، بۆیە دەمەوێت وەڵامی بەڕێزتان بزانم خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە .

مامۆستا خلیل أحمد : بسم الله الرحمن الرحیم . الحمد لله و الصلاة و السلام علی رسول الله و علی آله و صحبه و من تبعهم بإحسان إلی یوم الدین .

من لە وەڵامدا ئەڵێم : هەڵوێستی میانڕەوی سەلەفیەكان " سەلەفیەكانی كوردستان" تەكتیك واتە : ترس نیە ، بەڵێ من خۆم گوێم لێ بوو ئەندامی مەكتەبی سیاسی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان " مەلا بەختیار " ووتی : ئێمە پشتگیری لە هیچ هێزێكی سەلەڤی ناكەین وە ئەوەی سەلەفیەكانیش دەیكەن كە ڕووبەڕووی كاربەدەستان نابنەوە و بە كاربەدەستی خۆیانیان دەزانن تەكتیكەو هەركاتێك بیانەوێ لەو قۆناغە دەرچن زۆر بە ئاسانی دەردەچن وە ئاسانە وە پاساوی بۆ دەهێننەوە . بە هەر حاڵ من لە وەڵامدا بە كورتی ئەڵێم : نازانم ئەو ئەندامەی یەكێتی

نیشتیمانی کوردستان بە شێوەیەکی فەرمی ئەو لێدوانە ئەدات یان ئەوە ڕەئی شەخصی خۆیەتی وە زۆر طەبیعیشە کە هەرکامێك لەوانە بێت ، بەڵام ئەوەندە هەیە نازانم مەبەستی بە هێزی سەلەفی چیە و کێیە ؟ چونکە بەکارهێنانی چەمکی هێز ، مەفهومی هێز ئەگەر ناوبراو مەبەستی هەبووبێت یان نە ئەوە بە سیاسی کردنی ئەو چەمکەیە یان بە حیزبی کردنی یان نواندنی ئەوەی سەلەفیەکان گروپێکی ڕێکخراوی هەرەمین ، وە وەك هاوڵاتیەکی سادە کار ناکەن ئەمەش وانیە .

"سەلەفیەکانی کوردستان " جگەلەوەی یا جگە لە پەیڕەوکردنی بیروبۆچوونی ڕێڕەوی مەزهەبی خۆیان بو تێگەیشتن لە ئیسلام ، سەرقاڵ نین بە هیچ کایەیەکی تری ژیانی حوکمڕانی کوردستانەوە ئەوەی من بزانم ، بە تایبەت لە بواری : ئەمنی و سیاسی و عەسکەریدا کە ئەم سێ کایەیە بە کایە هەستیارەکان حساب دەکرێن ، سەلەفیەکان هەڵوێستی ئیجابی و پۆزەتیڤانەیان هەبووە وە هەیانە ، پەیڕەوکارانی خۆیان وە خەڵکی تریش لە ووتارەکانیاندا ئامۆژگاری دەکەن بە هەستیارانە مامەڵە لەگەڵ ئەم کایەیانە بکەن : ئەمنی ، سیاسی و عەسکەری .

ئینجا سەلەفیەکانی کوردستان ئەوەی من بزانم باوەڕیان بە فیتنەی تائیفی نیە ، هەر خیلافێکیان هەبێ لەگەڵ نەیارەکانی خۆیاندا پەنا بۆ

توندو تیژی نابەن تەنانەت لە ڕاگەیاندنەکانیشەوە تەنها ڕاستیەکان دەخەنە ڕوو . ئەمە بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر کەسێك لەم خەتە دەرچێت بەسەر هەموو سەلەفیەکانەوە حساب ناکرێت وە ئەوە بە موعەددەلیش وەرناگیرێت بەبێ ئەوەی ماڤی بەرامبەرەکانیان لە دیفاع کرندا پێشێل بکەن.

ئێمە دەبینین بەیانی تا ئێوارە مەفاهیم و چەمك و پرس و مەزاهیب و ئەدیان و هەموو بیر وبۆچونێك لە میدیاکانەوە لە ڕۆژنامەکانەوە لە نووسراو و کتێبەکانەوە لە چاپکراوەکانەوە زۆربەی زۆری دژ بە بیرو بۆچوون وچەمکی سەلەفیەتە ، بەڵام کوا ؟ هیچ کاردانەوەیەکی سلبی و نێگەتیڤانەیان نیە ، هیچ مەشاکیلێکیان دروست نەکردووە بەرامبەر بە هیچ کەسێك کە ئازادی خۆی پیادە بکات.

بۆیە تەنها ڕاستیەکانی خۆیان دەخەنە ڕوو بەبێ ئەوەی ماڤی بەرامبەرەکانیان لە دیفاعکردن پێشێل بکەن بەڵکو بیرو بۆچوونێکی ئیجابیان هەیە لە پێکەوە ژیاندا هەرچەندە لە کاری ناڕەوا بێ دەنگ نابن بەڵام چەندین جار ئەوەمان ووتووە گەر وەکو نوح سەلامی خوای لەسەر بێ ئەمەش وەکو نموونەیەك ئەیهێنمەوە : نۆسەد و پەنجا ساڵ بانگەوازی قەومەکەمان بکەین وە وەڵامیشیان بۆمان نەبێت ، نەیەنە ژێر ڕکێف و

دەسەڵات و ناو و پەیڕەوەکەمانیشەوە، دەست بۆ توند و تیژی نابەین ، کە ئەمەش ئەڵێم چونکە هیچ کەسێك لەسەر تەسلیم نەبوونی بە چەمکەکەی تۆ ، مەفهوومەکەی تۆ ، مەزهەبەکەی تۆ ، دینەکەی تۆ نابێ زۆری لێ بکرێ ئەمەش نەك باوەڕم بە دیفاع کردن لە خاك و نیشتیمان و دین و جیهاد و ئەو شتانە نیە ئەوانە هەمووی چەمکن لە شوێنی خۆیانا بە تێگەیشتنێکی دروست و تەندروست باوەڕم پێ یان هەن .

بەڵام کە ئەم نموونەش ئەهێنمەوە قەومی نووح کافر بوون بەڵام قەومی ئێمە میللەتی ئێمە میللەتێکی موسڵمانن ، مەبەست لەوە ئەوەیە ئێمە پشوو درێژین وە باوەڕمان بە توند و تیژی نیە وە کۆمەڵێ بەرژەوەندی شەخصی و حزبی و ناوچەیی و نازانم ئەوشتانەمان نیە کە ئەگەر کەوتە لێژیەوە یەکسەر پەنا بۆ توند و تیژی ببەین ، نا بە عەکسەوە غەیری خزمەت نەبێ هیچی ترمان نیە ، کەوابوو هەڵەیە ئەگەر وابزانرێت یان بەو شێوەیە وێنا بکرێت کە سەلەفیەکانی کوردستان سەرچاوەی ترسن بۆ سەر تاقم و نەتەوەو حزبەکانی ناوخۆو دەرەوە ی کوردستان هەرچەن من تەحدیدەن نازانم خاوەنی ئەو لێ دوانە مەبەستی سەلەفیەکانی کوردستانە " ئەو خەڵکانەی کە خەڵکێکی میانڕەون " ، هەرچەن لە عیبارەتی دوومیا کە ئەڵێ " تەکتیکە و کاربەدەستانی کوردستان بە

کاربەدەستانی خۆیان دەزانن" دیارە مەبەستی بەڵێ سەلەفیەکانی کوردستانە ، من بەهەڵەی ئەزانم ئەمە وابزانرێت سەلەفیەکان سەرچاوەی ترسن بۆ سەر تاقم و نەتەوەکانی تر و بۆ سەر حزبەکانی تر و ئاوەها ، یان بۆ داهاتووی کوردستان بە پێچەوانەوە دید و مەنهەجی میانڕەوی سەلەفیەکانی کوردستان زامنی ڕوونەدانی ئەو شتانەیە .

لێرەش پێویستە ئەوانە بخەینە ڕوو یان هەندێکیان ئەوەندەی کە دەرفەت هەبێ : کۆمەڵێك زەمانات هەیە لە هەر فیکرەیەك لە هەر حزبێك لە هەر ڕێڕەو و مەزهەب و تاقمێك ، کۆمەڵێك زەمانات هەیە کە سەلەفیەکان هەڵیان گرتووە بۆ ئەوەی ئەو ترسەی کە هەندێ کەس ترسی هەیە لە سەلەفیەکان یان لە هەر تاقمێکی تر کە ئەو شتە نەخوازراوانە ئەنجام بدەن ، ئەو زەماناتانە ناهێڵێت .

**بەڵێ مامۆستا ی بەڕێز پرسیاری دووەمیش هەر ئەوەیە باشە زەمانەت چیە بۆ ئەوەی ئەو ترسەی کە هەندێك هەیانە نەیەتە دی ؟ ، خوای گەورە پاداشتی بەخێرتان بداتەوە .**

مامۆستا خلیل أحمد : یەکێك لەو زەمانەتانە : کوردستانی بوونە ، سەلەفیەکانی کوردستان زۆر باش لەوە حاڵین ، ئەمانیش وەکو هەموو

وولآت و میللەت و نیشتیمانەکانی دونیا کەوتوونەتە بەر دابڕان ، دابەش بوون ، دانانی سنوور و جوگرافیای جیاواز . وە سەلەفیەکان باشیش حاڵین لە زوڵمی یاسای نێو دەوڵەتی لە میللەتی کورد کە گەورەترین نەتەوەیە وولآتی نەبێ ، حکومەتی نەبێ " واتە دەوڵەت " ، جا ئێمە وەك کوردێك باوەڕمان بە پاراستنی مافی ڕەوا و شەرعی نەتەوەکەمان هەیە وە دیفاعیش لە مەزڵومییەتی نەتەوەکەمان دەکەین . هەم وەك نیشتیمانێك کە تیایدا دەژین وە مافی خۆیەتی و خۆمانیشە کیانی خۆمان هەبێت وەك هەموو وولآتانی موسوڵمانانی دونیا سەربەخۆ بژین ، کەوابوو ئەمە یەکەم زەمانەتە سەلەفیەکانی کوردستان باوەڕیان بە کوردستانی بوونیان هەیە ، وە پیاوی ئەم و ئەو نین وە کەسێك لە سەلەفیەکان مامۆستایەك لە مامۆستاکان ، خەڵکێکی تر لە .. هیچ کەسێك لەوانە کار بۆ هیچ وولآتێکی دەرەکی ناکەن ، وە شتی وا لای ئێمە ئەگەر کوفر نەبێ ئەوە شتێکە لە موحەڕەماتی گەورە ، بۆیە نابێ دژی بەرژەوەندی وولآتی خۆتا کار بکەی ئەمە زەمانەتی یەکەم .

زەمانەتی دووەم : حزبی نەبوون ، سەلەفیەکانی کوردستان کارناکەن بۆ ئەوەی ببنە گروپێکی سیاسی خۆیان بە ئەنقەست کارناکەن ، کەوابوو کارناکەن بۆ ئەوەی ببن بە گرووپێکی وەها وە دەستکەوتی حزبی و پلەو

پایەی دونیایی بە دەست بێنن . ئەمەش نەك لەبەر فاکتەری ترس . وە نە ترسە وە نە تەکتیکە وەنە بیٚ عەقڵیشە ، سەلەفیەکان کاتیٚ حزبایەتی ناکەن حزبی " سیاسی دروست ناکەن" لەوپەڕی سیاسەتەوە دێنەوە ئەمەش نەك لەبەرئەوەی کە ئەمانە پسپۆڕن لە فلاٚن و فلاٚن ، نە لەبەر ئەوەی ڕێنماییەکانی دین وا پێویست ئەکات . ئێمە دەستەواژەی زیاتر بەکارنەهێنین لە ولاٚتێکا کە الحمد لله حکومەت هەیە ، وولاٚت هەیە ، حزبی تر هەن ، خەڵکی تر هەن ، جا بۆ چاکسازی کردن لەوانە باشتر نیە لەوەی کە دژیان بوەستینەوە ؟ ئەمە دیدی ئەوانە کە دینەکەیان فێریان ئەکا ، کەوابوو نە ترسە کاتیٚ حزب دروست ناکەن و گرووپ دروست ناکەن و دژایەتی ناکەن بە دەستەواژەی حزب ، وە نە تەکتیکە وە نە بیٚ عەقڵیشە ، بەڵکو دونیا نەویستی و شەجاعەتە و غیرەتە ، زاڵبوون بە سەر دەروونی خۆیانا وە ژیریانە وایان لیٚ دەکات . ژیریانە وایان لیٚ دەکات کە حزب دروست نەکەن ، مەبەستیشم ئەوە نیە بە هەموو پێوەرەکان هەر کەسێك حزب دروست کات شەجاعەتی نیە و ژیر نیە ، نە عبەو شێوە نیە . ئەکریٚ لە قاڵبی یەعنی تێنەگەیشتن ، وجهات نەزەر ، کۆمەڵیٚ شت جیٚ ی ئەبێتەوە هەرکەسێك بە هەرچیەکەوە سەرقاڵە لەوانەیە عوزری خۆی هەبیٚ . بۆیە ئەمانە وا ئەکەن :

دونیا نەویستی ، شەجاعەت بۆ نموونە ژیریان وایان لیٚ دەکات کە کەسانێکی چاکساز و بانگخواز بن وە دونیا خۆر نەبن وە ئارامیان هەبیٚ صەبریان هەبیٚ لەسەر چاکسازی وە نەفەس درێژ بن لە چارەسەرکردنی هەڵەکان لە کۆمەڵگا . یەعنی : سەلەفیەکان ئەوەندەی کۆمەڵگایان لا مەبەستە ، ئەوەندە دەسەلاٚتی خۆیان لا مەبەست نیە ، ئەوەنە دەسکەوتی خۆیان لا مەبەست نیە .

ئەبینین دەیەها ساڵ کەسێك لە سەلەفیەکان شەونوخونی و خوێندنەوە و دراسات و خزمەت و ئەمانە ، بەلاٚم ئەشمریٚ و هیچیش بە تەمای هیچ پلە و پایەو کورسیەك نیە ، تەنها ئەوەی ئەیەوێت کۆمەڵگا کۆمەڵگەیەکی دروست و تەندروست بێت هەر ئەوەی مەبەستە . کەوابوو نەفەس درێژیانە لە چارەسەرکردنی هەڵەکان لە کۆمەڵگەدا . ئەوەی لە بەرامبەر حزبێکی تر یان لە بەرامبەر چەن حزبێکی تر : حزبێك دروست دەکات ، ئەمە ئێمە بە هەڵەی دەزانین ، میللەت بە دەردێکی حیزبەکانی تردا دەبات .

چونکە هەڵەی ( زۆری حزبەکانە ) ، دێت کە حزبێکی تریش دروست دەکات پێویست نیە ، بەو دەردە ئەچن . چونکە دەردەکە کە دروست کردن و دابەشکردنی وەلائی حزبیە ، چونکە یەعنی .. کاتیٚ کە

کۆمەڵگەیەکی بچووکمان هەیە ئێمە ، میللەتی کورد لە کوردستانی عێراق کە قسە ئەکەم ، کاتیٚ کە تێی وەلائی نەتەوەیی ناهێڵی ، وەلاٌئی نیشتمان بوون ناهێڵی ، وەلائی دینی ناهێڵی ئەیکەیتە وەلائی فلاٌن و فلاٌن ، هەتتا حزبی سیاسی دروست بیٚ وەلاءو خۆشەویستی ئینتیما بۆ شتە گەورەکان ، شتە بەڕێزەکان یان موقەددەسەکان نامێنێت ، ئەوە .. دەردەکە لەوێوە دەست پیٚ ئەکات . چونکە کە دەردەکە ووتمان دروست کردن و دابەشکردنی وەلائی حزبیە لە نێو کۆمەڵگەدا کە حزبێکی تریش دروست دەکەین کاردەکات بۆ سەرنەکەوتنی چاکسازی کۆمەلاٌیەتی وە هەروەها چاکسازی ئابووری وە چاکسازی سیاسی . جا دروستکردنی هەمان دەستەواژە دووبارەکردنەوە ی هەڵەکەیە وە دانان و بەدەستەوەدانی هۆکارێکی زیاترە بۆ دووبەرەکی و نەسازان و ڕێك نەکەوتن ، بۆیە سەلەفیەکان نایانەویٚ خەڵکی بۆ خۆیان کۆ بکەنەوە ، نایانەویٚ خەڵکی بۆ خۆیان کۆ بکەنەوە بەڵکو دەیانەویٚ خەڵکی هەموو بەرەو پێکەوە ژیانی ئاشتیانە بەرن . وە کار کردن بە خواستی ئەقڵٌ و ژیری و خۆ ڕازاندنەوە بە ئەخلاق و ئاکارە جوانەکان بێتەوە پێش ئەمە زەمانەتی دووەمە کە حزبی نەبوونی سەلەفیەکان کار ئەکات بۆ ئەوەی کە ئەو ترسانە ڕوونەدەن کە هەندێکمان لیٚ ی دەترسین .

زامنێکی تر : میان ڕەوی سەلەفیەکانی کوردستان ، لە هەموو دینێکدا لە هەموو هەڵگرانی دیندا لە هەموو مەزهەب و بیرو بۆچوونەکاندا : کەسانی میانڕەو هەن ، کەسانی توندڕەو هەن ئەمە ئینکار ناکرێت . کۆمەڵە خەڵکانێك لە دونیای ئیسلاما هەڵگرانی ئیسلامن و توندڕەویان تیا هەیە ، هەیە سەلەفیە توندڕەوی تیا هەیە بە ناو سەلەفی یەعنی ، بۆیە سەلەفیەکانی کوردستان میانڕەون حەقە ئەو شایەتیەیان بۆ بدرێت ، جا زەمانەتی ئەم میان ڕەویەو کارکردن بۆ مانەوە و قووڵبوونەوە لە هەموو لایەکمانەوە بۆ ئەوەی سەلەفیەکانی کوردستان میان ڕەو بن زەمانەتێکی ترە بۆ ئەوەی کە ئەو ترسانە نەیەنە پێش . سەلەفیەکانی کوردستان خاوەن دیدێکی میانڕەوی مەزهەبین ، باوەڕیان بە ئەوەی من بزانم باوەڕیان بە خزمەتە ، خزمەتی جگە لە خۆیان بەوە ی کە دەستیان بگرن لە فێرکردن و لە تێگەیاندن و لە پێکەوەژیان و لە صەبرگرتن بە رامبەر هەڵەکان و لە ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و نەهێشتنی لاوازیەکان ، تەنانەت بەرامبەر بە نەیارەکانیشمان . خاڵێکی جەوهەری زۆر گرنگ هەیە لە سەلەفیەکانی کوردستانا : دوژمنایەتی ڕوحی عیداء وەکو ئەوترێت بەرامبەر بە نەیارەکان بە ئیسلامی و بە عەلمانیشەوە ، ئەوە نیە لەوە ئەچێ هەندێ کەس ئەمە بە هەڵە پیادە بکات یان هەندێك لە دەرەوە

وابزانیٚ کە سەلەفیەکان ڕوحی دوژمنایەتیان هەیە.. نەء ئەگەر بشبیٚ هەڵەیە ، ڕۆحی دوژمنایەتی کردن لەگەڵ نەیارەکانیشیا نیە ئەگەر بشبیٚ ئەصلٚ نیە بەڵکو بنچینە و ئەصلٚ ئەوەیە لە سەلەفیەکان کە دەستی نەیارەکان بگریت سوودی پیٚ بگەیەنیت نەك حەز لە دوژمنایەتی و تیاچوون و تیا بردنی بکەیت بۆیە سەلەفیەکان لە هەموو کەسێك زیاتر حاڵین لە فیقهی ئیختلاف .

ئەو هەموو دراساتەی دەیخوێننەوە و دراسەی دەکەن لە کتێبەکانی حەدیس و لە عەقیدە بەتایبەت و لە فیرەق و لە ئەوانە ، هەموو تاقمانەی کە دروست بوون و چۆن دروست بوون و کیٚ دروستی کردوون لەبەرچی دروست بوون و هۆکارەکان چین و چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە و ئەنجا واقعیش وایە و خوای تەعالاش خەڵکی وا دروست کردووە و یەعنی فیقهی ئیختیلاف لای سەلەفیەکان فیقهێکی زۆر قووڵە و وە سەلەفیەکانی کوردستانیش لەوە خاڵی نین ، حاڵین لە فیقهی ئیختیلاف وە لە فیقهی پێکەوە ژیان ئەوەتا ئیمامی عەلی " عەلی کوڕی أبو طالب " خوا لیٚ ی ڕازی بێت لە کاتێکدا کە سەرۆکی وولاتیشە " دەسەلاتی تەنفیزی بە دەستەوە بووە " پرسیاری لیٚ ئەکریٚ دەربارەی تەکفیرکردنی خەوارج ، ئایا کافرن ؟ کە لەوە ئەچیٚ ئەگەر کەسێك دژ بە ئێمە بووەستێتەوە وەکو

ئینسانێك ئەڵێم مەبەستم هیچ کەسێك نیە لە بەر خۆمانەوە بڵێین بەڵێ کافرە کە سەرۆکی موسوڵمانانە و سەرۆکی وولاتەو لە کاتێکا خەوارج بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە تەکفیر ی خۆیان کردووە و بەلاّم ئەو تەکفیری ئەوانی نەکردووە . قەولێکی مەشهوری هەیە ئەگەر صەحیح بێت : إخواننا بغوا علینا : برامانن ، وە وایش مامەڵەی لەگەڵ کردن وە وایش مەعرِوفە

کە وەکو موسڵمان مامەڵەی لەگەڵدا کردن ، بۆیە فیقهی ئیختلاف لای سەلەفیەکان و میانڕەوێتیان زامنێکی ترە بۆ ئەوەی کە توندو تیژی و ترس لە ئایندەدا بێت .

خاڵێکی تر لە زەمانات بۆ ئەوە ، خۆماڵی بوونی سەلەفیەکانە :

سەلەفیەکانی کوردستان خۆماڵین لە چەن ڕوویەکەوە یەك دوو لەوانە ئەخەمە ڕوو :

• سەلەفیەکانی کوردستان لە ڕووی مەرجەعییەتی فیقهیەوە، ئەمەش شتێکی گرنگە لە ناو دونیای پیادەکردنی مەزهەبەکاندا ، لە ڕووی مەرجەعییەتی فیقهیەوە لە ژێر فشاری مەزهەبی و تەقلیدی هیچ کەس و دەزگایەکدا نین . هەر حزبێك هەر تاقمێك هەر مەزهەبێك هەر کۆمەڵە

خەڵكێك لەسەر هەر مەزهەب و ڕێڕەوی هەر زانایەك بڕۆن ، سەلەفیەكانی كوردستان لەسەر ڕاڕەوی سەد لە سەدی هیچ شەخصێك نین وە موقەللدیش نین لە زۆرینە ، ناتوانم بڵێم لە دانە دانە نین چونكە ئەوە ئینسانەكانە ئەگینا بەشێوەی گشی بە دروشم مەسئەلەی تەقلید لە لای سەلەفیەكان لە مەرجەعییەتی فیقهیا مەرفووزە ، ناشڵێین موجتەهیدن هەموویان بەڵام بەشێوەیەكی گشتی موتتەبیعن ، ئەگەر موجتەهیدیش نین ، موقەللدیش نین . موتتەبیعن : شوێنكەوتوون ، قسەی هیچ كەسێك لە مەرجەعییەتە فیهیەكانی دونیا بە دەلیلەوە نەبێ وەری ناگرن ، لە خودی قورئان و حەدیس بەڵگەی نەبێت لە صەحابە بەڵگەی نەبێت وەری ناگرن بۆیە سەربە هیچ مەرجەعییەتێكی فیقهی دونیا نین : نە مصر نە سعودیە نە ئێران نە هیچ كەسێكی تر ، ئیحترام و ڕێزیان بۆ هەموو لایەكیان هەیە وە قسەی هەموو لایەكیش وەرئەگیرێت ئەگەر موافقی قورئان و حەدیس بێت بەڵكو هەر لە دروست بوونی سەلەفیەكانی كوردستانەوە لە هەشتاكانەوە ئێمە كە ئاشنا بووین بە مزگەوت و بە خوێندنەوە و بە كتێب و ئەمانە : لەسەر ئەوە گەورە بووین كە تەقلید و تەعەصصوبمان نەبێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ڕێز لە زانایان بگرین . لەسەر كتێبەكانی شێخی ئەلبانی كە لە موقەددیمەی ( صفة الصلاة ) دا كە

ئەقوالی مەزاهبمان بۆ نەقڵ ئەکات کە شافعی ئەفەرمێ ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) :

( إذا صح الحديث فهو مذهبي ) یان عالمەکانی تر ئەیهێنێ یەك یەك ناویان ئەهێنێ دوایی ئەفەرمێ تەقلیدی هیچ کەسێك لە ئێمە نەکەن وە دروست نیە بە فەتوای ئێمە کار بکەن ئیللا ئەبێ بزانن لە کوێ هێناومانە ئەو فەتوایە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێزی زانایان ( الرجوع الی العلماء ) بەڵام قسەی زاناش کاری لەگەڵا ئەکرێ مامەڵەی لەگەڵا ئەکرێ ئیسفادەی لەگەڵا ئەکرێ بە ئیستئناس ئەبرێت ( ئەتوانی سوودی لێ وەربگری ) بەڵام ئەبێ عەرزی کەیتە سەر کتاب و سووننەت ئەگەر موافق بوو بۆیە : أقوال العلماء يحتج لها لا يحتج بها : قسەی زانایان ئەبێ بەڵگەی بۆ بێنیتەوە نەك بیکەیتە بەڵگە بەسەر بەڵگەوە ، ئەنجا مامۆستا سەلەفیەکان " مامۆستا سەلەفیەکانی کوردستان " سەربەست و ئازادن ، بەسەربەستی ئەژین لە ژێر فشاری مەزهەبی هیچ کەسێکا نین . جا تۆمەتی مەدخەلییەتی ئەمڕۆ کە ئێستا هەندێك لە سەلەفیەکان بە مەدخەلی ناوزەند دەکرێن ئەمە تۆمەتە ، نە باوەڕیان بە مەدخەلییەت هەیە نە مەدخەلی ( شێخ ربیع بن هادی مەدخەلی ) خۆیشی باوەڕی بە مەدخەلییەت هەیە ، ئەمە ناو زڕاندن و تەشیر پێ کردن و تۆمەت دانە پاڵە

. جا نە ئەم مەدخەلییەتە ی ئەمڕۆ تەواوە وە نە وەهابییەت کە دوێنیٚ ئەیان ووت وەهابی ، وە نە پێشتر ئەیان ووت حەنبەلی وە هەروەها . هەموو ئەمانە تەشیر کردن و تۆمەت کردن و شەڕی ئیعلامی نەیارەکانە . ئێمە هەر بایەخێکیشی پیٚ نادەین . ئەمە لە ڕووی مەرجەعییەتی فیقهیەوە .

• لە ڕووی مەرجەعییەتی سیاسیشەوە : سەلەفیەکان خۆماڵین . باوەڕتان هەبیٚ ئەمە ، ئەمە ئەم قسەیە نە هیچ پلەو پایەیەکمان پیٚ ی ئەویٚ خوا ئەزانێت وە نە ئەشترسین لە هیچ هێزێك لە هیچ کەسێکیش فشاری نەخستۆتە سەرمان . باوەڕتان هەبیٚ ئەگەر تاقمێکی خۆماڵی هەبێت لەم کوردستانە ئەوە سەلەفیەکانن . بۆیە ئەگەر بڵێین چەن تاقمێکیش هەیە ئەوا سەلەفیەکان یەکێکن لەو تاقمانەی کە خۆماڵین .

بۆیە ئێمە دەبیسین دەخوێنینەوە باس دەکرێت بە ئاشکرا لە ڕاگەیاندنەکانەوە فلاٚنە حزب فلاٚنە لایەن ئەو تاقمە ئەو مەزهەبە ئەو حزبە پەیوەندی بە وولاٚتی فلاٚنیەوە هەیە ، کار بۆ بەرژەوەندی فلاٚن ئەکات ، فلاٚنە سەرکردە و فلاٚنە مەسئوول و فلاٚنە کەس و فلاٚنە نازانم چی و شەخص و ئەمانە فایلی هەیە و چی هەیە و چی هەیە ، هەرچەن ئێمە بەڵگەی ڕوونمان لەسەر هیچ کەسێك لەبەردەس نیە . وە کار لەسەر تۆخ

کردنەوە و زەقکردنەوە ی ئەم شتانەش ناکەین ئەوە ئیشی ئێمە نیە ، بەلاّم دەڵێین :

هەمیشە حکومەتی هەرێمی کوردستان ، مەرجەعییەتی سیاسی ئێمە بریتی یە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان . لەگەڵ ئەو مولاحەزاتانەش کە هەموومان هەمانە هەموو لایەکمان هەمانە ، خودی ئەوانەی کە کاری حکومەتەکە بەڕێوە ئەبەن خۆیان مولاحەزاتیان هەیە . ئەمەش هیچ کێشەیەکی نیە ، هەمەیشە دروشمی ئێمە بەرژەوەندی گشتی لە بەرچاوگرتنە . بەرژەوەندی گشتی دائیمەن باس دەکرێت لە هەموو شتەکانی ئێمەیە . تاکەکانی ئێمە کە گەورەیان ئەکەین و دەرسیان پێ ئەدەینەوە و قسەیان لەگەڵ ئەکەین و لە ژیانی ڕۆژانەمانا پێیان ئەگەیەنین لەسەر ئەمە گەورەیان ئەکەین بەرژەوەندی گشتی بە دەیەها ئایەت و حەدیس و .. . ئەنجا ئەمن و ئاسایش . ئەو ڕۆڵەی کە سەلەفیەکان هەیانە لە ڕاگرتنی ئەمن ئاسایشا بە مینبەرەکانیان بە نووسینەکانیان ، ئەو هەموو کتێب و ئەو هەموو سی دی و ئەو هەموو شتانە ، یەعنی تەصەوڕ کە شاری وا هەیە لەبەر بوونی مامۆستایانی ئەهلی سوننە یەك کەسی توندڕەو ی تیا هەڵنەکەوتووە . کێ لە ڕووی فیکریوە ئەم شتە زەمانەت ئەکا ؟ مامۆستایانی ئایینی سەلەفی . بۆیە هەمیشە دروشمی ڕاگرتنی

ئەمن و ئاسایشە پاڵپشتی کردنی ئەمن و ئاسایشە لەگەڵ مولاحەزاتا لەگەڵ هەندێك كار . یەعنی هەندێك لە ئاسایش هەندێك لە پۆلیس یا هەندێك لە پێشمەرگە کە مومکینە نوێژ نەکا مومکینە هەر شتێکی هەبێت ، ئێمە خودی پرۆسەی ئەمن و ئاسایشمان مەبەستە . دەیەها کەس تەلەفونمان بۆ ئەکا : ئایا مامۆستا دروستە ببم بە ئاسایش بە پێشمەرگە بە پۆلیس ؟ بەڵێ ، ئێمەین کە دیفاعمان کردووە نەمات ووتووە : إن فرعون و هامان و جنودهما ، ئەوەمان نەووتووە ، تەکفیری پێشمەرگە و ئاسایشمان نەکردووە لەبەرئەوە هەندێك سەرکردە هەیە هەرچیەك هەر فکرەیەکی هەبێ ، نە ءپرۆسەی ئاسایش و پۆلیس و پێشمەرگە و چی و ئەمانە ، چونکە نەمانی ئەمانە نەمانی هەموو ووڵاتەکەیە بە هەموویەوە . ئێمەین سەلەفیەکان باسی ئەوەمان کردووە وەزارەتی پێشمەرگە مەرجەعییەتی سیاسی و عەسکەری ئێمەیە . لە هەموو میحوەرەکانەوە تەلەفون بۆ مامۆستایانی سەلەڤ ئەکرێت ، پێش هاتێك دێت بۆ نموونە شەڕێکە بەرۆکی کوردستانی گرتووە یان ئەگەر ی تر هەیە هەڵوێستمان چیە ؟ تەنانەت لە بەیاننامەی هەندێك لە مامۆستایانی سەلەفیدا بە شێوەیەکی صریح تەئکید و دووپاتی ئەوە کراوەتەوە هەرشتێك هاتە پێشەوە بە تەنسیق لەگەڵ میحوەرەکانی پێشمەرگەدا بگەڕێنەوە بۆ

پێشمەرگە ، وەزارەتی پێشمەرگە چی پێویستیەکی میللی بە ئێوە هەبوو ، ئەمە خۆماڵییەتی یە لە مەرجەعییەتی سیاسی . سەلەفیەکان سەر بە هیچ موخابەڕاتێك ، وولاَتێك ، شوێنێکی تر نین . نەك دەسمان نەکەوتووە ، هەموو دونیا بکەن بە ئاڵتوون بۆ مامۆستایانی سەلەڤ بۆ ئەوەی یەکێکمان لە خشتە ببەن سەر بە وولاَتێکی تر بین ، خەیاڵیان خاوە . ئێمە باوەڕمان بە دینێك هەیە ، بە مەنهەجێك هەیە کە ئەو شتانەمان لەسەر حەرام ئەکا خیانەت بکەین بەرامبەر بە میللەتەکەی خۆمان . ئەمە کۆمەڵێك زەماناتن وە زەماناتی تریش هەیە بۆ ئەوەی ئەو ترسەی کە هەیە لە ئاییندە سەلەفیەکان لە خشتە بچن وە ئەمە وەکو هەلێك وەکو تەکتیکێك بەکار بێنن إن شاء الله بەو شێوە نابێ .

لە بەشی دووەمی لێدوانەکەی مەلا بەختیار " ئەندامی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان " کە دەڵێ ئەم هەڵوێستە تەکتیکە ، من ئەڵێم ئەم خوێندنەوەیە ئەوە دەگەیەنێت دیارە کە سەلەفیەکان یان لەباری ترسدا دەژین " قسەکەی ئەو وا دەگەیەنێ " یا لە باری ترسدا دەژین ، یان ئەم هەڵوێستە وەکو هەلێك وەردەگرن بۆ ئاییندە . جا ئەوەی من بزانم کە زۆر لە مامۆستایانی سەلەڤ ئەناسم وە پەیڕەوکارانی سەلەڤ ، نە خۆیان

کەسانێکن بزانن ترس چیە چونکە من ئەزانم زۆرێك لە مامۆستایانی سەلەڤ کەسیانێکی زۆر نەبەز و زۆر دلێر و زۆر خەڵکی ئازاو زیرەکن ، نە مامۆستایانی سەلەڤ ئەزانن ترس چیە وە نە کار بەدەستانیش بەڕاستی لە بەرامبەر سەلەفیەکاندا تۆقاندن و ترساندنیان بەکار هێناوە . بەڵکو بە پێچەوانەوە یەکەم سوپاس بۆ خوای گەورە پاشان سوپاس بۆ کاربەدەستان و بۆ ئەمن ئاسایش .. . ئەمە یەعنی ئەوەیان بەکارنەهێناوە بەرامبەر بە سەلەفیەکان تا سەلەفیەکان بترسن . بە سوپاسەوە ئەڵێم دەزگاکانی حکومەت بەتایبەتیش ئاسایش وە ئاسایشی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان مامەڵەی زۆر زۆر باشیان لەگەڵ پەیڕەوکارانی سەلەڤ کردووە ، ئەمە ئەگەر ی یەکەم ئەگەر : " ئەگەر " ەکە ترس بێ . ئەگەری دووەمیش کە پێم وایە خاوەنی لێدوانەکە کە لێ ی دەترسێت ئەویش حاڵی نەبوونە ، حاڵی نەبوونە لە فەرهەنگی سەلەفیەکای کوردستان . لەوە ئەچێت بە چاوی شوێنەکانی تر تەماشای سەلەفیەکانی کردبێت خوێندنەوەیەکی تری کردبێت بۆ ئەمانە ، ئەمەش بەڕاستی حاڵی نەبوونە لە فەرهەنگی سەلەفیەکانی کوردستان . یان بابڵێین بەراووردکردنێکی هەڵەیە ، هەندێ لە ڕەوتەکانی تر لە دونیای ئیسلامدا

کە بە شێوازێك کار ئەکەن ئەمەش موقایەسە و موازەنەیەکە کە سەلەفیەکانی کوردستانیشی بەو قیاسە قیاس کردبیٚ . ئەمەش بەڕاستی مەرج نیە ، هەر چۆن مەرج نیە هەموو تاقمیٚك یان هەر تاقمیٚکی نەتەوەیی وەکو باقی تاقمەکانی تر بیٚت یان هەر حزبیٚکی ئیشتراکی نازانم دیموکراسی وەکو هەموو حزبە ئیشتراکی و دیموکراسیەکانی تر بیٚت ، یان هەر تاقمیٚکی مەسیحی ، یەهودی نازانم بوزی و چی و ئەوانە وەکو تاقمەکانی تر وابن ئاواش سەلەفیەکانی کوردستان وەك باقی تاقمەکانی تر نین یا ئەکریٚ نەبن کە ناوی سەلەفیەتیان لە شویٚنەکانی تر لە خۆیان ناوە ، بە هەرحاڵ ئەگەر قسەکەم زۆر دریٚژ نەکەمەوە : سەلەفیەکانی کوردستان هەر لە سەرەتای ڕاپەڕینی ساڵی ( ١٩٩١ ) ەوە وەتا ئیٚستا ئەگەر سەلەفیەکان پشتیوان بووبیٚتن بۆ سەقامگیری ئەم ناوچەیە بۆ هەریٚمی کوردستان ، جیٚگەی سوپاسە ، وە جیٚگەی پشت پیٚ بەستنە ، پشتیان پیٚ ببەستیت . ئینجا لە ڕاستیدا یەعنی زەقکردنەوە و تەشیرکردن بە سەلەفیەکان وەك هەندیٚك لە ڕۆژنامە نووس و ئەوانە دەیکەن ، یەکیٚك دەنووسیٚت سەلەفیەکان ڕابگرن ، یەکیٚك دەنوسیٚت لە زیادبووندان لە زیادبوونی بەرچاودان ، یەکیٚك دەنووسیٚت حکومەت

بەکاریان دێنێت وە چەندین شتی تر دەنووسرێت لە ڕاستیا ئەگەر بێت و سەلەفیەکان یەك جار لەسەر ئەوان شتێك بنووسن دونیامان لێ تێ ئەگەیەنن ، ئەڵێم :

ئەم هەموو شتە بەلاشە بۆ ؟ ئەم هەموو نووسینە بۆ ؟ ئەم هەموو قسە پێ ووتن و پێشێل کردنی مافی یەکترە بۆ ؟ خۆ ئەگەر سەلەفیەکان حزبێکی سیاسی بوایەن ئەگەر هەرچی شتێکمان بکردایە کەس هیچی نە ئەووت ، لەبەر بوونی حزبەکە ، ئایا ئا ئەم توندو تیژیە بەرامبەر بە سەلەفیەکان ئەکرێت لە ڕۆژنامەکانا لە لێدوانەکانا یان ئەم خوێندنەوانە ، چۆن ترس هەیە سەلەفیەکان ئەوە بن ئەی باشە ئەو مامەڵە توندو تیژ کردنە لەگەڵ سەلەفیەکان ترس نیە ئەوانە هۆکار بن بۆ دروسکردنی بشێوی تائیفی ؟ ئینفیلات و فەوزای تائیفی ، کە ئێمە بە فەزڵی خوا کار ئەکەین بۆ سەر ئەوەی کە هیچ فەوزایەکی تائیفی لە کوردستانا نەهێڵین . ئایا ئەو شەڕی مەزهەبی و شتانەی کە لە شوێنەکانی ترا هەیە ، ئایا ئەمانە هۆکار نین ؟ ئەنجا ئایا ئەمە لێ سەندنەوەی ئازادی لە سەلەفیەکان نیە ؟ کە وەك هەر تاقم و مەزهەبێکی ئایینی دەبێ ئازاد بن لە پیادە کردنی ڕێڕەوەکەیاندا ؟ لە کاتێکدا کە هەموو ئەمانە دەبیسین ، وەڵامی زۆر تێر و تەسەلی زۆر

زانستیانەی واقعیانەمان لایە . بەڵام لەبەر لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی کوردستان سوێند بێت بە خوای گەورە وەڵاممان نەداوەتەوە . وە من وەکو خزمەتکارێکی میللەتەکەی خۆم ، وەکو مامۆستایەك و نووسەرێکی سەلەفی ئەوە دووپات ئەکەمەوە : زەمانات زۆرن بۆ نەگۆڕان و لە خشتە نەچوونی سەلەفیەکانی کوردستان ، جا ئەگەر بە نەزانی لە ئەوانەوە بێت کە إن شاءالله وانین ، ئەگەر کەسێکیش بیەوێ لە خشتەیان ببات زەمانات زۆرن إن شاءالله بەو شێوە نابێت وەکو لە پێشێ لە چوار خاڵا باسم کرد کە هەندێکن لەوانە .

جا لە کۆتاییدا :

داوا کارم لە هەموو لایەك ڕەخنە قبووڵ بکرێت ، هەر کەسێك بە سەلەفیەکان ئەڵێ ، سەلەفیەکان هەرچیەك ئەڵێن با قبووڵ بکرێت وە مامەڵەی نەرمی لەگەڵا بکرێت ، ئیستفزاز نەبین بە قسەی یەکتر ، هەرکەسێ هەرچیەك ئەڵێ با بڵێ . مەصدەر و سەرچاوەی شەڕ و تیرۆر ، هەرکەسێك هەرچی بە من ئەڵێ بابڵێ منیش ئەتوانم شت بڵێم ، بەڵام بە هەموومانەوە بە هەموو کەسێکەوە کار بکەین لەسەر ئەوەی کە

نەرمونیانی بە هێمنی شتەکان تێ پەڕێنین وە بە تایبەت لەبەر ئەو بارودۆخەی کە ئێستا ئەم میللەتە ی تیایە وە ئەو هەموو پیلانانەی کە ئەکرێ بەرامبەر ئەم حکومەتە ، لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە لەبەر ناوە جوانەکانی وە سیفاتە بەرزەکانی کوردستان و باقی وولآتانی موسوڵمان لە هەموو ئەم فیتنانە بپارێزێت .

آمین و صلى الله على محمد .